چاپی سێیه

حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د

# ژیانی پێغه‌مبه‌ران

حه‌زره‌تی مووسا

حه‌زره‌تی نووح

حه‌زره‌تی عیسا

حه‌زره‌تی ئیبراهیم

له حه‌زرتی ئاده‌مه‌وه تا
حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌دی خاته‌م
دروودی خوایان له‌ سه‌ر بێ





دانراوی: ماموستا مه‌لا موحه‌ممه‌دی شه‌ڵماشی

# پێشه‌کی

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ
اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ، خُصُوصاً عَلىٰ نَبِيِّنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ اَصْحٰابِهِ وَ اَتْبٰاعِهِ اِلىٰ يَوْمِ الدِّينِ آمين.

موسوڵمانینه «مِنَ الْاَشْيٰاءِ الْمُتَّفَقِ».

ئه‌وه شتێكی ئاشكرایه و بیرو ڕای هه‌موو زانایان له سه‌ر ئه‌وه‌یه:

«اَنَّ كُلَّ شَيْءٍ لَهُ عِلَّةٌ تُوجِدُهُ اَوْ صٰانِعٌ يَصْنَعُهُ».

كه هه‌ر شتێک تۆ ده‌ی‌بینی و دروست ده‌كرێ له خۆوه نابێ به‌ڵكو هۆیه‌ک هه‌یه بۆ دروست كردنی و یه‌كێک دروستی كردوه و دروستی ده‌كا.

«فَاِذٰا نَظَرَ الْاِنْسٰانُ اِلَى الْكَوْنِ وَاسْتَعْرَضَ مٰا فِيهِ مِنَ الْكٰائِنٰاتِ».

جا هه‌ر كاتێ ئینسان به بیرو هۆشه‌وه ڕووانی بۆ ئه‌و ئه‌رزو ئاسمانه جوانه‌وه بۆ ئه‌و مانگ و ڕۆژ و ئه‌ستێره و بۆ ئه‌و هه‌موو زینده‌وه‌ر و گیان له‌به‌رانه‌و بۆ ئه‌و یاسا و نیزامه‌ی جیهانه.

«حَصَلَ لَهُ عِلْمٌ ضَرُورِيٌّ بِاَنَّ هٰذِهِ الْكٰائِنٰاتِ لَمْ تُوجَدْ صُدْفَةً».

بۆی ده‌ر ئه‌كه‌وێ كه ئه‌و كه‌ون و كائیناته له خۆوه نابێ.

«بَلْ لٰابُدَّ مِنْ مُوجِدٍ اَوْجَدَهٰا».

بەڵکو دەبێ یەکێک هەبێ دروستی کردبن، جا کەسێک بتوانێ ئەو هەموو عالەمە دروست بکا دەبێ بشتوانێ ئاگاداریان بکا و ڕزقیان بدا، کە ئەوەش بە خوا نەبێ بە کەس ناکرێ.

«فَيَجِبُ عَلٰى كُلِّ مُؤْمِنٍ وَ مُؤْمِنَةٍ اَنْ يَعْتَقِدَ اَنَّ اللّٰهَ خَالِقٌ لِهٰذَا الْكَوْنِ».

کەواتە واجبە لە سەر هەموو ژن و پیاوێکی موسوڵمان کە باوەڕی وابێ خالقی ئەو هەموو بونەوەرە هەر خوایە. ئەوەی کەبۆم بەیان کردن دەلیلێکی عەقڵی بوو لە سەر خوایەتی خوا. هەروەها بەڵگە و دەلیلی نەقڵیش زۆرن لە سەر خوایەتی خوا، بۆ نموونە خواوەندی گەورە لە سورەی «العنکبوت»دا دەفەرموێ:

﴿خَلَقَ اللّٰهُ السَّمٰوٰاتِ وَالْاَرْضَ بِالْحَقِّ اِنَّ فِي ذٰلِكَ لَاٰيَةً لِلْمُؤْمِنِينَ﴾.[1]

واتە خواوەندی گەورە کوراتی ئاسمانەکان و کورەی زەوی دروست کردووە و بوونی ئەو کوراتانەش دەلیلە لە سەر خوایەتی خوا بۆ کەسێک ئیمانی هەبێ و موسوڵمان بێ. ئەوا بە بەڵگەو دەلیل بۆتان دەرکەوت کە خوا:

| | |
|---|---|
| خالقی ئەجرام عولوی و سوفلییە | گیان بەخشی حەیوان وەحشی و ئەهلییە |
| نەزم ئارای بینای قەسری عالەمە | نووری شعوردەر بەنی ئادەمە |
| نە موحتاج بە کەس نە بە خورد و خەو | عالەم سەراسەر موحتاجن بە ئەو |
| دایرەی ئیمکان لە حەوزەی دایە | زەمامی زەمان لە قەبزەی دایە |
| دەریای سەلات و سەلامی بێ پەی | شەپۆلدا بۆ سەر مستەفا پەی پەی[2] |

جا کە زانیمان خواوەندی گەورە خالقی کەون و کائیناتە و ڕازقی هەموو حەیواناتە، دەبێ ئەوەش بزانین کە عادەت الله وا جاری بووە:

«اِنَّ اللّٰهَ اَرْسَلَ رُسُلاً مِنَ الْبَشَرِ مُبَشِّرِينَ بِثَوابِهِ وَ مُنْذِرِينَ بِعِقَابِهِ».

خواوەندی گەورە چەند کەسی ڕابەرو پێغەمبەر لە ناو عالەمدا هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی مژدەی خۆش بدەن بەو کەسانەی ئیمان و باوەڕیان بە خواو پێغەمبەران ڕۆژی قیامەت هەیە و ئەوانەش بترسێنن کە ئیمانیان نیە.

---

(١) العنکبوت: ٤٤.
(٢) لە خەزنەی جواهێری مەلا ئەحمەدی قازی وەرگیراوە.

«لِيُبَيِّنُوا الشَّرٰائِعَ وَالْاَحْكٰامَ وَالْحُدُودَ الَّتِي فِيهٰا صَلاٰحُ الْاِنْسٰانِ وَ سَعٰادَتُهُ فِي الدُّنْيٰا وَالْآخِرَةِ».

بۆ ئەوەی بەیان بکەن ئەو شەرع و یاسا و بەند و حدودانەی کە دەبنە هۆی سەر کەوتنی ئینسان و خۆش بەختی دنیا و قیامەتی.

خواوەندی گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەی «النحل»دا فەرمویەتی:

﴿وَ لَقَدْ بَعَثْنٰا فِي كُلِّ اُمَّةٍ رَسُولاً اَنِ اعْبُدُوا اللّٰهَ وَاجْتَنِبُوا الطّٰاغُوتَ﴾.(١)

واتە بە ڕاستی ئێمە ناردومانە بۆ سەر هەموو میللەتێک پێغەمبەرێک کە پێیان ڕاگەیەنێ عیبادەتی خوا بکەن و خۆیان لە خەراپە و بت پەرەستی بپارێزن. چونکە هیچ کەس لێ پرسراو نیە تا دەستورو یاسای ئایینی پێ ڕا نەگا. هەروەکو لە سورەی «الإسراء»دا دەفەرمووی:

﴿وَ مٰا كُنّٰا مُعَذِّبِينَ حَتّٰى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾.(٢)

ئێمە هیچ عەبدێ عەزاب نادەین تا یاسا و دەستوراتی دینی بە هۆی پێغەمبەرێکەوە ڕا نەگەیەنین. دەلیلی عەقڵیش لە سەر بوونی پێغەمبەران زۆرن. بۆ نموونە ئەگەر یەکێک لە ئێمە بچێتە ئاواییەک و بپرسێ ئاغای ئەو دێیە کێیە و زۆر باش تەماشای کار و ئوموراتی بکا و بزانێ کە ئەو ئاغایە دەستوورو یاسا و قانونێکی بۆ داناون و گوتویەتی: ئاگادار بن پێتان دەڵێم هەر کەسێک بەشی یەکێک داگیر کا دەیگرم، یان ئەوەی بێ قسەیم بکا دەری دەکەم، هەر کەسێک خوو ڕەوشتی جوان بێ و لە قسەم دەرنەچێ ئەوە لام زۆر خۆشەویستە و هەرچی داوا بکا پەکی ناخەم. ئەو کەسە دەزانێ کە بۆ ڕاگەیاندنی ئەو دەستورانە ئەو ئاغایە پێویستی بە پیاوێکی زۆر زانا و دانا و شەریف و ئاقڵ و ئەمین و پاک هەیە تا ئەو یاسا و نیزامەی بۆ بەڕێوە بەرێ و بەخەڵکی ڕاگەیەنی.

ئەی ئەو ئەرز و ئاسمانە ئەو مانگ و ڕۆژ ئەستێرە جوانە
ئەو هەوا و هەور و بەفرو بارانە ئەو مەعادین و بەرد و دارانە
ئەو گەرمی و ساردی و وشکی و تەڕیە ئەو جوانی جەوە و بەحر و بەرییە

---

(١) النحل: ٣٦. (٢) الإسراء: ١٥.

ئەوکانی و ئاوە ئەو شەت و نەهرە　　ئەو سوودی دەریا لە مەدد و جەزرە
ئەم جۆرە دەورە لەو سەیاراتە　　تەولیدی فوسول لەو حەرەکاتە
ئەو تەرزە گەڕان بۆ زەبتی ئەوقات　　بە مانگ و بە ڕۆژ بە ساڵ و ساعات
ئەم بێ نەوای و دەرد و میحنەتە　　ئەم دەوڵمەندی و خۆشی و صیحەتە
یا ئەم حەیوان و جینن و ئینسانە　　ئەم بەرزی و نزمی و زیادی و نوقسانە
ئەم هەموو شارەی پڕ لە ئەجناسە　　ئەم گشت عالەمەی عالی ئەساسە
ئەم فەهمو و نوتق و عەقڵ و حەواسە　　ئەم زوڵم و عەدلە و ئەم درۆو ڕاسە
ساحبی هەروا حەواڵەی دەشتی　　دنیای کردوون بێ سەرپەرستی
نازانم تۆ چۆن دڵت ناترسی　　بڵێی پاش خەڵقی لێیان ناپرسی
بڵێی خالقێ وا تەوانا بێ　　ئەساسێکی وا جوانی دانابێ
لە ناو ئەو هەمو عالەما بەشەر　　بڕازێنێتۆ بە عیلم و هونەر
لە دڵا چرای عەقڵی بۆ هەڵکا　　تا فەرقی بەینی پاک و چەپەڵکا
بە گوێرەی قووەی ئیدراک و نەزەر　　بناسێ ئومور لە نەفع و زەرەر
چۆن ڕوی حیسابی ئەبێ تێنەکرێ　　باری ئەمانەت سەر شانی نەخرێ
بە موبەلیغدا یانی پێغەمبەر　　قانونی خوایان چۆن نایەتە سەر
بیان ترسێنێ ئەگەر سەرکەش بن　　لە سەعادەتی سبەی بێبەش بن
مەهتوک و ڕیسوای ڕۆژی حیساب بن　　هەمیشە خواری حەبسی عەزاب بن
یا بەو کەسانە ساحب ئیمانن　　موتیعی ئەمر و نەهی و فەرمانن
موژدەی بەهەشتیان بە مەحزی ڕەحمەت　　نەداتێ دایم بێ دەرد وزەحمەت
برا بزانە خاڵی لە گومان　　نابێ تەکلیفی لێ نەکرێ ئینسان
چاک و بەد بەیان کراوە بۆ ئینسان　　موبەللیغ ڕەسول قانونیش قورئان[1]

جا بە دەلیلی عەقڵی و نەقڵی بۆمان دەرکەوت کە هەر لە حەزرەتی ئادەمڕا تا فەخری عالەم هەزاران ڕابەر و پێغەمبەر لە لایەن خواوە ڕەوانە کراون و قورئان بە ئاشکرا باسی

(١) هەر لە سەرچاوەی پێشوو وەرگیراوە.

بیست و پێنج پێغەمبەر دەکا.جارێکیش عەرزی پێغەمبەریان کرد قوربان چەند پێغەمبەر تا ئیستا ڕەوانە کراون؟

فەرمووی: سەت و بیست و چوار هەزار.

بەڵام خواوەندی گەورە هەر باسی هێندێکیانی کردوە هەر وەکو لە سورەی «النساء»دا فەرموویەتی:

﴿وَ رُسُلاً قَدْ قَصَصْنٰاهُمْ عَلَيكَ مِنْ قَبْلُ وَ رُسُلاً لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ﴾.(١)

هەر لە سەر مەعناو ڕەمزی ئەو ئایەت و حەدیسانەیە شێخی سەعدی فەرموویەتی:

چندین هزار سکه‌ای پیغمبری زدند اول بـه نـام آدم آخـر بـه نـام مصطفی

جا لە بەر گرنگی باسی بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرانە کە خواوەندی گەورە لە قورئاندا باسی کردون.

«وَ لِمٰا يُخاطِبُ اللّٰهُ سُبْحٰانَهُ وَ تَعٰالىٰ رَسُولَهُ مُحَمَّداً صَلَوٰاتُ اللّٰهِ وَ سَلاٰمُهُ عَلَيْهِ. بِقَوْلِهِ».

لە بەر ئەوەش کە خوای گەورە لە قورئاندا ڕو دەکاتە پێغەمبەر و لە سورەی «هود»دا دەفەرمووی:

﴿وَ كُلاًّ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ اَنْبٰاءِ الرُّسُلِ مٰا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤٰادَكَ وَ جٰاءَكَ فِى هٰذِهِ الْحَقُّ وَ مَوْعِظَةٌ وَ ذِكْرىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾.(٢)

واتە باس و خەبەری پێغەمبەرانت بۆ دەگێرمەوە تا دڵت ئارام بێ و لات ئاشکرابێ و لە بەسەرهاتی پێغەمبەران و ئوممەتەکانیان موسوڵمانەکانی ئوممەتی تۆ پەندو ئامۆژگاری و عیبرەت وەرگرن. هەر وەکو لە سورەی «یوسف»دا بە ئاشکرا قورئان لە زمان خواوە دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ كٰانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِى الْأَلْبٰابِ﴾.(٣)

واتە بە ڕاستی لە گێڕانەوەی باسی بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەند و ئامۆژگاری و عیبرەت وەرگرتن زۆرە بۆ ئەو کەسانەی خاوەن بیر و هۆشن.

---

(١) النساء: ١٦٤. (٢) هود: ١٢٠. (٣) یوسف: ١١١.

جا بە یارمەتی خواوەندی گەورە لە ڕۆژانی داهاتوودا مەجلیسەکانمان بە باسی بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە نازدارانە بۆنخوش دەکەین و دەڕازێنینەوە بەڵکو لە دنیادا پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین و ئیمانمان بە خوا و پێغەمبەران و ڕۆژی قیامەت پتەوتر بێ و خواوەندی گەورەش بە لوتف و کەڕەم و مەرحەمەتی خۆی لە مەیدانی مەحشەردا لە ژێر سێبەری ئاڵا و بەیداخی پێغەمبەردا حەشرمان بکا.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرسَلِينَ خُصُوصاً عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ اَتْبٰاعِهِ اَجْمَعِينَ.

وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# حەزرەتی ئادەم

## باسی «حەزرەتی ئادەم» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ مَنْ تَبِعَهُمْ بِاِحْسٰانٍ اِلىٰ يَوْمِ الدِّينِ.

نَذْكُرُ جَدَّنٰا آدَمَ عَلىٰ نَبِيِّنٰا وَ عَلَيْهِ السَّلٰامُ.

باسی بەسەرهات و پەیدا بوونی باپیرە گەورەی خۆمان کە حەزرەتی ئادمە دەکەین بۆ ئەوەی بزانین کە خواوەندی گەورە ئینسانی چۆن دروست کردوە و چ بەهرەیەکی داوە بە ئادەمیزاد؟

«وَ لَاَنَّ اَوَّلَ مَنْ قَصَّ اللّٰهُ سُبْحٰانَهُ وَ تَعٰالىٰ عَلَيْنٰا قَصَصَهُمْ فِى الْقُرْآنِ الْكَرِيمِ مِنَ الْاَنْبِيٰاءِ آدَمَ اَبوُالْبَشَرِ عَلَيْهِ وَ عَلىٰ نَبِيِّنٰا اَفْضَلُ الصَّلٰاةِ وَالسَّلٰامِ».

وە چونکە خواوەندی گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی بەسەرهاتی حەزرەتی ئادەمی لە پێش هەموو پێغەمبەراندا بۆ پێغەمبەر گێڕاوەتەوە. حەزرەتی ئادەم ئەووەڵ کەس و ئەووەڵ پێغەمبەرە، بۆیە لە پێشدا بەسەرهاتی ئەو بەیان دەکەین.

«اِخْوانيِ وَ اِنْ لَمْ يَذْكُرِ الْقُرْآنُ لَفظَ النُّبُوَّةِ بِاِزٰاءِ آدَمَ كَمٰا ذَكَرَ بِاِزٰاءِ غَيْرِهِ مِنَ الْاَنْبِياءِ».

براکانم هەرچەند خوا لە قورئاندا حەزرەتی ئادەمی بە ئاشکرا بە پێغەمبەر ناو نەبردووە وەکو ناوی پێغەمبەرەکانی تری بردووە.

«وَ لٰكِنَّ اللّٰهَ خٰاطَبَهُ بِلا وٰاسِطَةٍ».

بەڵام خوای تەعالا قسەی لەگەڵ کردووە بە بێ واسیتە.

«فَاَمَرَهُ وَ نَهٰاهُ». ئەمر ۆ نەهی پێ کردووە.

«وَ اَحَلَّ لَهُ وَ حرَّمَ عَلَيْهِ».

شتی بۆ حەڵاڵ کردوە و شتی لێ حەرام کردووە.

«وَ هٰذٰا هُوَ مَعْنِى النُّبُوَّةِ».

ئەوەش مەعنای پێغەمبەری حەزرەتی ئادەم دەگەیەنێ. وە قورئان لە نۆ سورەتدا لە بیست و پینج ئایەتدا ناوی حەزرەتی ئادەمی بردووە.

«تَبْدَاَ قِصَّةُ خَلْقِ آدَمَ في سُورَةِ «البقرة» بِتِلْكَ الْمُحٰاوَرَةِ بَيْنَ اللّٰهِ وَ الْمَلٰائِكَةِ».

چیرۆک و بەسەرهاتی حەزرەتی ئادەم لە کاتی دروست کردنیڕا بە شێوەی گفتوگۆ لە بەینی خواو مەلائیکەدا لە سورەی «البقرة»دا دەست پێ دەکرێ.

﴿وَ اِذْ قٰالَ رَبُّكَ لِلْمَلٰائِكَةِ اِنِّي جٰاعِلٌ فِى الْاَرْضِ خَلِيفَةً﴾.(١)

«فَاللّٰهِ سُبْحٰانَهُ يُخْبِرُ الْمَلٰائِكَةَ بِاَنَّهُ سَيَجْعَلُ فِى الْاَرْضِ خَلِيفَةً هُوَ آدَمُ وَ ذُرِّيَّتُهُ».

خوای تەعالا خەبەر دەدا بە فریشتان کە لێرە بە دواوە جێنشینێک دروست دەکەم لە سەر زەوی.

«وَ اِنَّهُ سَيُمَكِّنُهُمْ فِى الْاَرْضِ وَ يَجْعَلُهُمْ اَصْحٰابَ السُّلْطٰانِ فِيهٰا».

وە خوا قووەت و قودرەت و توانایان دەداتێ.

«لِيَكْشِفُوا مٰا في هٰذِهِ الْاَرْضِ مِنْ قَوِىً وَ طٰاقٰاتٍ وَ كُنُوزٍ وَ خٰامٰاتٍ».

تا ئاوەدانی بکەنەوە و دەستوور و باوی جیهان بدۆزنەوە و هەر چی لە ناوی دایە لە کان و کەرەسەی خاو دەری بێنن و بە کاری بێنن.

---

(١) البقرة: ٣٠.

«وَ لٰكِنَّ الْمَلٰائِكَةَ تَعَجَّبُوا مِنْ هٰذَا النَّبَإِ».

بەڵام مەلائیکە لەو خەبەرە سەرسام مان.

﴿قٰالُوا اَتَجْعَلُ فِيهٰا مَنْ يُفْسِدُ فِيهٰا وَ يَسْفِكُ الدِّمٰاءَ﴾.(١)

گوتیان: ئەی خوای گەورە ئایا کەسێکی وای تێدا دروست دەکەی کە بەدکرداری تێدا بکاو خوێنی تێدا بڕێژی؟

﴿وَ نَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَ نُقَدِّسُ لَكَ﴾.(٢)

لە کاتێکدا کە ئێمە هەمێشە یادت ئەکەین و ستایشت دەکەین و پاکت ڕائەگرین و بێ ئەمریت ناکەین.

مەلائیکە بۆیە ئەو قسەیان کرد چونکە لایان وابوو ئەوان لە ئادەمیزاد باشتر و گەورەتر و زاناتر و لایقترن بەو خەلافەتە، نەک بە شێوەی نارازی بوون بە کاری خوا.

«وَ لٰكِنَّ اللّٰهَ اَجٰابَهُمْ بِالسِّرِ الْمَغيبِ عَنْهُمْ وَالْحِكْمَةِ الَّتي اَخْتُصَّ بِهٰا في خَلْقِ آدَمَ وَ هِيَ اَنَّهُ يَعْلَمُ مٰا لاٰ يَعْلَمُونَ».

بەڵام خواوەندی گەورە جوابی دانەوە بەو نەهێنیە کە هەر خۆی دەیزانی.

﴿قٰالَ اِنّي اَعْلَمُ مٰا لٰا تَعْلَمُونَ﴾.(٣)

فەرمووی ئەوەی من لە بارەی ئادەمیزادەوە دەیزانم ئێوە نایزانن و پەی پێ نابەن، چونکە لە دروست کردنی ئادمێزاددا هەزاران نەهێنی ئەرزو ئاسمان ئەدۆزرێتەوە و عیبادەتی خوا زۆرتر ئەکرێ و گەورەیی خوا ئاشکراتر ئەبێ، جگە لەوەش بۆ دادگەری و میهرەبانی خواش شایستە نیە کە ئەم ئادەمی‌یە بلیمەتە نەهێنێتە ڕوو. لە بەر ئەوی کە هێندێ جار بەدی و خوێن ڕێژی تێدا دەکات. ئینجا مەلائیکە کە زانیان خوا ئادەمی دروست کرد بە ڕیوایەتێک دەڵێن گوتیان: جا خۆ لای خواوەندی گەورە هەر ئێمە گەورەترین و ئەوەی ئێمە دیومانە کەس نایبینێ.

«فَاَرٰادَ اللّٰهُ اَنْ يَرَى الْمَلٰائِكَةَ رَاَى الْعَيْنِ اَنَّ هٰذَا الْكٰائِنَ الْجَديدَ الَّذي صَغَّرُوا مِنْ شَأْنِهِ هُوَ اَكْثَرُ مِنْهُمْ عِلْماً وَ اَوْسَعُ مَعْرِفَةً».

---

(١) و (٢) و (٣) البقرة: ٣٠.

جا خوای تەعالا ویستی کە بە مەلائیکە نیشاندا کە ئەو ئادەمیزادەی بە کەمی دەزانن زۆر لەوان زاناتر و شایستەترە بۆ ئەو خەلافەتە.

﴿وَ عَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمٰاءَ كُلَّها﴾.(١)

خوای تەعالا هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد. واتە بە سروشت ئامادەیی‌یەکی وای دا بە ئادەمی کە بتوانێ هەموو شتێک بدۆزێتەوە و ناوی تایبەتی بۆ دانێ و بی‌ناسنەوە.

﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلٰائِكَةِ﴾.(٢)

لە پاشان خوا ئەو شتانەی هەموو نیشانی فریشتەکان دا.

﴿فَقٰالَ اَنْبِئُوني بِاَسْمٰاءِ هٰؤُلاٰءِ اِن كُنْتُمْ صٰادِقِينَ﴾.(٣)

فەرمووی: ناوی ئەمانەم پێ بڵێن ئەگەر ڕاست دەکەن‌کە ئێوە لە ئادەمی باشتر و زاناترن.

«وَ لٰكِنَّ الْمَلٰائِكَةَ عَجَزُوا عَنِ الْاِجٰابَةِ وَ خٰاطَبُوا رَبَّهُمْ مُعْتَذِرِينَ».

بەڵام لێرەدا فریشتەکان هەموو تێگەیشتن کە شایستەی ئەو جێ‌نشینی‌یە نین و دانییان بە زەبوونی و نادانی خۆیاندا نا بەرامبەر بە ئادەمی.

﴿قٰالُوا سُبْحٰانَكَ لٰا عِلْمَ لَنٰا اِلّٰا مٰا عَلَّمْتَنٰا اِنَّكَ اَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.(٤)

گوتیان: خوایە تۆ پاکیت لە هەموو هەڵەیەک و هەرگیز کاری بێ کەڵک ناکەی و ئێمە هیچ نازانین ئەوە نەبێ کە تۆ فێرت کردوین. بە ڕاستی هەر تۆ زانای بە بەندەگان و دانای لە کردەوەی خۆتدا.

جا کە فریشتەکان دانیان بە نادانی خۆیاندا هێنا

«دَعَى اللّٰهُ سُبْحٰانَهُ وَ تَعٰالىٰ آدَمَ لِيَكُونَ مُعَلِّماً لِلْمَلٰائِكَةِ».

﴿قٰالَ يٰا آدَمُ اَنْبِئْهُمْ بِاَسْمٰائِهِمْ﴾.(٥)

خواوەندی گەورە بۆ ئەوەی ئادەمی و بلیمەتی ئادەمی نیشاندا بانگی حەزرەتی ئادەمی کرد و فەرمووی: ئەی ئادەم ناوی ئەو شتانەیان پێ بڵێ. حەزرەتی ئادەم جوابی فەرمانی خوای دایەوە و ناوی شتەکانی بەیان کرد. ئینجا خوا ڕووی کردە مەلائیکەتان و فەرمووی:

---

(١) و (٢) و (٣) البقرة: ٣١. (٤) البقرة: ٣٢. (٥) البقرة: ٣٢.

﴿اَلَمْ اَقُلْ لَكُمْ اِنّي اَعْلَمُ غَيْبَ السَّمٰواتِ وَالْاَرْضِ وَ اَعْلَمُ مٰا تُبْدُونَ وَ مٰا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ﴾.(١)

مەگەر پێم نەگوتن کە من ئاگادارم بە نهێنی ئاسمانان و زەوی و بەوەی کە ئاشکرای دەکەن و بەوەی کە دەی‌شارنەوە؟ جا لە دوای ئەوە کە خوا فریشتەکانی تێگەیاند لە نرخ و پایەی ئادەمی و لە دووا ئەوەی کە زانیان ئادەمی بە سروشت زور ئامادەن بۆ جێ‌نشینی سەر زەوی. خوا فەرمانی پێدان بە کورنۆش بردن بۆ ئادەم. وەکو دەفەرموێ:

﴿وَ اِذْ قُلْنٰا لِلْمَلٰائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا اِلّٰا اِبْلِيسَ اَبىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَ كٰانَ مِنَ الْكٰافِرِينَ﴾.(٢)

واتە ئەی پێغەمبەر یادی ئەو کاتە بکەوە کە گوتمان: بە فریشتەکان کورنۆش بەرنە بەر ئادەم. هەمووکورنۆشیان برد. شەیتان نەبێ، خۆی بە زل زانی کورنۆشی نەبرد لە فەرمانی خوا دەرچوو. خوای تەعالا لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیزانی بۆچی شەیتان بێ ئەمری کردوە پرسیاری لێ کرد:

﴿قٰالَ يٰا اِبْلِيسُ مٰا مَنَعَكَ اَنْ تَسْجُدَ لِمٰا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ اَسْتَكْبَرْتَ اَمْ كُنْتَ مِنَ الْعٰالِينَ﴾.(٣)

فەرمووی: ئەی ئیبلیس چ بوو بە هۆی ئەوە کە کورنۆشت نەبرد بۆ ئەو ئادەمە کە بە گەورەیی خۆم دروستم کردوە، تەکەبورت کرد یان خۆت بە زل زانی؟

﴿قٰالَ اَنَا خَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَني مِنْ نٰارٍ وَ خَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ﴾.(٤)

شەیتان گوتی: ئەی خوایە من لە ئادەم چاکترم ئادەم لە خاکە و من لە ئاگرم ئاگریش لە قوڕ و خاک باشترە.

﴿قٰالَ فَاخْرُجْ مِنْهٰا فَاِنَّكَ رَجِيمٌ﴾.(٥) ﴿وَ اِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتي اِلىٰ يَوْمِ الدِّينِ﴾.(٦)

جا خوای گەورە فەرمووی: ئەی شەیتان تۆ لە بەهەشت بڕۆ دەرەوە تازە تۆ لە ڕەحمەتی من بەری و تا ڕۆژی قیامەت بە لەعنەت بی. شەیتان کە زانی لە قاپی ڕەحمەتی خوا دەرکرا:

---

(١) البقرة: ٣٣. (٢) البقرة: ٣٤. (٣) ص: ٧٥.
(٤) ص: ٧٦. (٥) ص: ٧٧. (٦) ص: ٧٨.

﴿قَالَ رَبِّ فَأَنْظِرْنِي اِلیٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾.(١)

گوتی: ئەی خوای گەورە مۆڵەتم بدە تا ڕۆژی قیامەت نەمرم.

﴿قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنْظَرِينَ﴾.(٢) ﴿اِلیٰ يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ﴾.(٣)

خوا فەرمووی: ئەوا مۆڵەتم دای تا ڕۆژی خۆی.

﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ اَجْمَعِينَ﴾.(٤) ﴿اِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾.(٥)

شەیتان کە زانی خوا مۆڵەتی دا سوێندی خوارد و گوتی: قەسەم بە گەورەیی تۆ ئادەم و ئەولادەکانی بە سەهوو دەبەم ئەوانە نەبێ کە بە ڕاستی تۆ دەپەرستن.

﴿قَالَ اذْهَبْ فَمَنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَوْفُوراً﴾.(٦)

خوا فەرمووی: بڕۆ بە لەعنەت بە کەسێک دووای تۆ کەوێ و بە قسەی تۆ بکا ئەوە دۆزەخم بۆ تۆش و ئەو کەسەش داناوە. ئنجا کاتێک شەیتان لە بەهەشت دەرکرا حەزرەتی ئادەم بە تەنها مایەوە، کەس نەبوو هاوڕێی بێ، بە قوودرەتی خوا خەوی لێ کەوت خوای تەعالا لە پەراسووی چەپی حەزرەتی حەووای دروست کرد، کە حەزرەتی ئادەم وە خەبەر هات و چاوی بە دایکە حەووا کەوت پرسی تۆ کێ‌ی؟ دایکە حەووا گوتی: من حەووام، بۆ ئەوەی دروست کراوم پێکەوە ڕابوێرین. ئینجا خوا دەفەرمووێ:

﴿وَ قُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ اَنْتَ وَ زَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾.(٧)

گوتمان ئەی ئادەم خۆت و ژنەکەت لەم بەهەشتەدا دانیشن.

﴿وَ كُلَا مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا﴾.(٨)

لە هەموو خواردەمەنی‌یەکی بخۆن بە تێر و تەسەلی.

﴿وَ لَا تَقْرَبَا هٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾.(٩)

شەیتان کە خەبەری زانی خوا مەنعی کردوون لە خواردنی بەری ئەو دارە زۆر کەیف خۆش بوو.

﴿فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا﴾.(١٠)

---

(١) ص: ٧٩. (٢) ص: ٨٠. (٣) ص: ٨١.
(٤) ص: ٨٢. (٥) ص: ٨٣. (٦) الإسراء: ٦٣.
(٧) و (٨) و (٩) البقرة: ٣٥. (١٠) البقرة: ٣٦.

بە هەر نەوعێ بوو خۆی گەیاندنێ و سوێندی زۆری بە درۆ بۆ خواردن و بە سەهوی بردن. ئەوانیش نەیاندەزانی کەس هەیە بتوانێ سوێند بە درۆ بخوا باوەڕیان کرد و چون بەری ئەو دارەیان هێنا و خواردیان. ئادەم و حەووا لە بیریان چووبۆوە کە شەیتان دوژمنیانە.

﴿فَاَخْرَجَهُمٰا مِمّٰا كٰانٰا فِيهِ﴾.(١)

بە هۆی خواردنی بەری ئەو دارە شەیتان ئادەم و حەووای لەو خۆشی‌یە دەر هێنا کە تێدا بوون. عەورەتیان ئاشکرا بوو، زۆر خەجاڵەت بوون. ئنجا خوا دەفەرمووی:

﴿وَ قُلْنٰا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَ لَكُمْ فِى الْاَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَ مَتٰاعٌ اِلىٰ حِينٍ﴾.(١)

بە ئادەم و حەووا و شەیتانمان گوت: بچنە خوارەوە بۆ سەر زەوی بۆ ئیشکردن و بۆ دوژمنایەتی لەگەڵ شەیتان و نەوەکەیدا و لە سەر زەوی ئارام دەگرن و دەمێننەوە تا ماوەی ژیانتان تەواو دەبێ.

حەزرەتی ئادەم کە زانی خوا لە بەهەشت دەریان دەکا و زانی کە گوناهێکی زۆر زلی کردوە، دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە و تۆبە و پەشیمان بوونەوە.

﴿فَتَلَقّىٰ آدَمُ مِنْ رَبِّهِ كَلِمٰاتٍ فَتٰابَ عَلَيْهِ اِنَّهُ هُوَ التَّوّٰابُ الرَّحِيمُ﴾.(٢)

خوا چەند ووتەیەکی پاڕانەوەی خستە دڵی ئادەمەوە و حەزرەتی ئادەم پڕ بە دڵ ڕووی کردە بارەگای خواو گوتی:

﴿قٰالٰا رَبَّنٰا ظَلَمْنٰا اَنْفُسَنٰا وَ اِنْ لَمْ تَغْفِرْلَنٰا وَ تَرْحَمْنٰا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخٰاسِرِينَ﴾.(٣)

ئینجا خوای گەورە دووعا و پاڕانەوەکەی گیرا کرد و لێیان خۆش بوو، جا ئادەم و حەووا کە هاتنە سەر زەوی لێک دوور کەوتنەوە، تا پاش ماوەیەکی زۆر لە کێوی عەرەفات یەکتریان دۆزیەوە و بە یەکتر شاد بورنەوە و لەو ڕۆژەوە بەو ڕۆژە دەڵێن: ڕۆژی عەرەفە و بەو کێوەش دەڵێن: کێوی عەرەفات. ئینجا دووا ئەوەی کە چل هەزار کوڕ و کچ و کوڕەزا و کچەزای خۆی چاو پێ کەوت، لە عومری نۆسەت و سی ساڵیدا وەفاتی کردوە بە ڕیوایەتێک دەڵێن لە کێوی ئەبو قوبەیس نێژراوە.

لە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی ئادەم ئەو پەند و ئامۆژگاریەمان بۆ دەر ئەکەوێ کە ئینسان لە دووا خواپەرەستی بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی دروست کراوە. ئەوەشمان بۆ دەر دەکەوێ کە خۆشەویسترین کەس لای خوا کەم وایە لە هەزاران ئەسرارو و نەهێنی غەیبی‌یەکی بزانێ. ئەوەشمان بو دەر دەکەوێ کە ئەگەر خوای تەعالا ئارەزوو بکا شتێکی زۆر بچوکیش گەورە دەکا. هەر وەکو قوڕی حەزرەتی ئادەمی کردە ئەو ئینسانە و ئەوەندەی زانیاری دایە مەلائیکە لە زانینی عاجز بوون. دەبێ ئەوەش بزانین کە ئینسان هەرچەند دانا و زانا بێ نابێ لە خۆی بایی بێ و بە قسەی شەیتان بە سەهوو بچێ. دەبێ ئەگەر گوناهی کرد تۆبە بکا، وەک حەزرەتی ئادەم. جا داواتان لێ دەکەم بە ماڵ و سەروەتی دنیا و زانیاری لە خۆتان بایی مەبن و لە گوناه تۆبە بکەن بەڵکو خوا رەحمتان پێ بکا.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# حەزرەتی ئیدریس

## باسی «حەزرەتی ئیدریس» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ للّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.

باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە پایەبەرزە کە حەزرەتی ئیدریسە ئەکەین بۆ ئەوەی پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

«لِأَنَّهُ مِنَ الْأَنْبِيٰاءِ الَّذينَ وَرَدَ ذِكْرُهُمْ فِي الْقُرْآنِ بَعْدَ آدَمَ».

چونکە حەزرەتی ئیدریس لەو پێغەمبەرانەیە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی بردوون و لە دووا حەزرەتی ئادەم ئەو بوو بە پێغەمبەر.

«وَ هُوَ اَوَّلُ مَنْ نَزَلَ عَلَيْهِ الْمَلَكُ جِبْرِيلُ بِالْوَحْيِ».

حەزرەتی ئیدریس یەکەم پێغەمبەر و ئەوەڵ کەسە کە لە لایەن خواوە حەزرەتی جبریل بە وەحی سی (٣٠) سەحیفەی بۆ هێناوە. بۆ ئیرشاد و هیدایەتی ئەولادی قابیلی کوڕی حەزرەتی ئادەم.

«لِيَرْجِعوُا عَنْ غَيِّهِمْ وَ كُفْرِهِمْ وَ يَتُوبُوا اِلَى اللّٰهِ وَ يَسيرُوا حَسْبَ شَريعَتِهِ».

بۆ ئەوەی دەست لە بت پەرستی و کوفر هەڵگرن و تۆبە بکەن و بەگوێرەی ئایینی ئەو ڕەفتار بکەن. ئەو حەزرەتە بە شەش پشت دەگاتە حەزرەتی ئادەم و عومری مبارەکی بیست ساڵ بوو کە باپیرە گەورەی حەزرەتی شیس وەفاتی کرد.

«وَالْقُرْآنَ لَمْ يَذْكُرْ شَيْئاً مُفَصَّلاً عَنْ حَيٰاتِهِ وَ تَعٰالِيمِهِ».

قورئان بە درێژی باسی ژیان و بەسەرهات و یاسای دینی حەزرەتی ئیدریسی نەکردوە. بەڵام لە سێ ئایەتدا باسی دەکا و دەفەرمووێ:

زۆر سابیر و ڕاستگۆ و پایەبەرز بووە لای خواوەندی گەورە. هەر وا کە لە سورەی «مریم»دا دەفەرمووێ:

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتٰابِ إِدْرِيسَ إِنَّهُ كٰانَ صِدِّيقاً نَبِيّاً﴾.(١) ﴿وَ رَفَعْنٰاهُ مَكٰاناً عَلِيّاً﴾.(٢)

واتە ئەی پێغەمبەر تۆ بە هۆی قورئانەوە یادی حەزرەتی ئیدریس بکەوە و بۆ ئۆممەتەکەت بەیان بکە کە چەند پێغەمبەرێکی ڕاست و ڕاستگۆ بووە و ڕوتبە و مەقامی لای خواوە بە هۆی عیبادەتەوە چەند بەرز بووە. بەڵام هیندێک لە عولەمای تەفسیر و مێژوو دەڵێن باپیری حەزرەتی ئیدریس زۆر پیاوێکی بە دین و خاوەن حەسەب و نەسەب و کەماڵ و جەماڵ بووە. خەڵک لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواڕا دەچونە خزمەتی و دیاری و سەوقاتێکی زۆریان بۆ دەبرد. پاش ئەوەی کە وەفاتی کرد لە ئێرانرا کۆمەڵێک هاتن بۆ زیارەتی. بەڵام کە زانیان وەفاتی کردوە گەڕانەوە و دیاری و سەوقاتەکەیان لەگەڵ خۆیاندا بردەوە. کوڕەکانی زۆریان پێ ناخۆش بوو کە زانیان ئەو خزمەتەی جاران ناکرێن. شەیتان کە ئەو خەبەرەی زانی خۆی بردە سەر شکڵی پیاوێکی پیرو و چۆ لای ئەولادەکانی و گوتی: دەزانن کە خەڵک زۆرتان لێ قەڵسە؟ چونکە لە دور وڵاتانڕا دێن و چاویان بە باوکتان ناکەوێ.

ئەوانیش گوتیان: جا چار چیە؟ گوتی: بێنن ڕەسم و سوڕەتی باوکتان دروست کەن و لە دیوەکەی خۆیدا دای نێن، با خەڵک زیارەتی بکەن. ئەوانیش بە قسەیان کرد تا بەو هۆیەوە بت پەرستی بەرە بەرە پەرەی ستاند. لەو کاتەدا حەزرەتی ئیدریس لە «بابل»دا بوو،

---

(١) مریم: ٥٦. (٢) مریم: ٥٧.

خواوەندی گەورە بە حەزرەتی جبریلدا وەحی بۆ نارد و کردیە پێغەمبەر.

«فَنَهَی الْمُفْسِدِینَ عَنْ مُخٰالَفَةِ شَرِیعَةِ آدَمَ وَ شیث».

حەزرەتی ئیدریس خەڵکی مەنع کرد لە بت پەرەستی و بانگی کردنەوە بۆ پەیرەوی کردن لە شەریعەتی حەزرەتی ئادەم و حەزرەتی شیس.

«فَاطٰاعَهُ اَقَلُّهُمْ وَ خٰالَفَهُ جُلُّهُمْ».

کەمێک لە خەڵکەکە دووای کەوتن و زوربەی خەڵکەکە لە قسەی دەرچوون و دەستیان لە بت پەرستی هەڵ نەگرت.

«فَخَرَجَ هُوَ وَ اَتْبٰاعُهُ حَتّیٰ وٰافُوا مِصْرَ».

حەزرەتی ئیدریس ناچار بوو لەگەڵ موسوڵمانەکان «بابل» بە جێ بێڵێ و بچێ بۆ «میسر» لە بابلەوە ڕۆیشت تا چوونە «میسر».

«یَدْعُو الْخَلاٰیِقَ اِلَی الْاَمْرِ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْیِ عَنِ الْمُنْکَرِ وَ طٰاعَةِ اللّٰهِ».

لەوێ دەستی کرد بە بانگ کردنی خەڵک بۆ خوا پەرستی و لەگەڵ وەزیفەی پێغەمبەریشدا دەستی کرد بە بەرگ دروین و خەیاتی، کە ئەووەڵ کەسێک بوو لیباسی دروەوە. چونکە تا ئەو کاتە خەڵک هەر پێستی حەیواناتیان لە بەر دەکرد. حەزرەتی ئیدریس لەگەڵ هەر تەقەڵێکدا ناوی خوای دەبرد و زکری خوای دەکرد. خولاسە بە قەد هەموو موسوڵمانەکانی ئەو کاتە عیبادەتی خوای دەکرد. تا وا ناوبانگی لە ئەرز و ئاسمان بڵاو بۆوە کە ڕۆژێک حەزرەتی ئیزرائیل عەرزی بارەگای ئەقدەسی کرد و گوتی: ئەی خوای گەورە! زۆر ئارەزو دەکەم ئیزنم بدەی بچم بۆ زیارەتی ئیدریس.

خوا ئیزنی دا. حەزرەتی ئیزرائیل خۆی بردە سەر شکڵی پیاوێک چوو بوو بە میوانی حەزرەتی ئیدریس، حەزرەتی ئیدریس ساڵ دوازدەی مانگ بە ڕۆژو دەبوو. ئێوارە کە بەربانگیان هێنایە پێش میوانەکە نانی نەخوارد، تا سێ ڕۆژ هیچ ئێوارەیەک نانی نەخوارد،ڕۆژی سێیەم حەزرەتی ئیدریس فەرمووی: دەبێ ناوی خۆتم پێ بڵێی، ئەویش لە جوابدا گوتی: من ئیزرائیلم ئیجازەم لە خوای تەعالا وەرگرتوە کە بێم ماوەیەک ڕەفاقەتی تۆ بکەم. حەزرەتی ئیدریس گوتی: باشە، بەڵام بەو شەرتە برادەریت دەکەم کە

گیانم بکێشی و زیندوم بکەیەوە، با بزانم گیان کیشان چەند ناخۆشە، تا زیاتر عیبادەتی خوا بکەم. ئیزرائیل گوتی: ئاخر بە بێ ئەمری خوا ناتوانم گیانی کەس بکێشم. نیدا لە غەیبەوە هات کە ئەی ئیزرائیل بێ ئەمری مەکە. ئیزرائیل گیانی حەزرەتی ئیدریس کێشا و زیندووی کردەوە، ئیزرائیل لێی پرسی گیان کێشان چۆنە؟ گوتی: وەکو بە زیندویی پێستت لە بەر دارنن وایە. ئنجا حەزرەتی ئیدریس هەستا باوەشی بە ئیزرائیلدا کرد و پەیمانی برایەتیان بەست. حەزرەتی ئیدریس گوتی: پێم خۆشە بەرزم کەیەوە بۆ ئاسمان و گەشتێک بکەین. ئەویش هەڵی گرت و بردی بۆ ئاسمان. لەوێ حەزرەتی ئیدریس فەرمووی: زۆر حەز دەکەم چاوم بە دۆزەخ بکەوێ. چوونە بەر دەرگای جەهەننەم و مالکی جەهەننەم دەرگای بۆ کردنەوە و تەماشایان کرد و گەڕانەوە. ئنجا گوتی: زۆرم پێ خۆشە چاویشم بە بەهەشت بکەوێ. هەستان چونە بەر قاپی بەهەشت و «دق الباب» کرد و «رضوان»ی بەهەشت بە پیریانەوە هات و دەرگای بەهەشتی بۆ کردنەوە. حەزرەتی ئیدریس چۆ ناو بەهەشتەوە تا ماوەیەک نەهاتە دەرەوە، ئیزرائیل بانگی کرد: ئەوە بۆ نایە دەرەوە؟ لە جوابدا گوتی: خوا فەرموویەتی:

﴿كُلُّ نَفْسٍ ذائِقَةُ الْمَوْتِ﴾.(١)

واتە هەموو گیان لە بەرێک دەبێ تاڵی مردن بچێژێ، من چێژتم، خوا لە ئایەتێکی کەدا فەرموویەتی:

﴿وَ اِنْ مِنْكُمْ اِلَّا وارِدُها﴾.(٢)

دەبێ هەموو کەس دۆزەخ ببینێ. خۆ من چوومە ناو دۆزەخەوە، دوبارە فەرموویەتی:

﴿وَ ما هُمْ مِنْها بِمُخْرَجِينَ﴾.(٣)

کەسێک چو بۆ بەهەشت تازە نایەتەوە دەرەوە، منیش تازە ناگەڕێمەوە.

«قالَ اللّٰهُ لِمَلَكِ الْمَوْتِ دَعْهُ فَاِنَّهُ بِاِذْني دَخَلَ الْجَنَّةَ وَ بِاَمْري لا يَخْرُجُ».

خوا فەرمووی: ئەی ئیزرائیل لێی گەڕێ چونکە ئەو بە قسە و ئیزنی من چۆتە بەهەشت و بە ئەمری منیش نایەتە دەرەوە. جا بە گوێرەی ئەو ریوایەتە ئێستا زیندووە.

---

(١) آل عمران: ١٨٥. (٢) مريم: ٧١. (٣) الحجر: ٤٨.

عومری موبارەکی «٣٦٥» ساڵ بوو کە بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان، حەزرەتی ئیدریس کەسێک بوو کە نووسینی بە قەڵەم داهێنا، هەروەها ئەووەڵ کەسێک بوو کە دەستی کرد بە خەیاتی و جل و بەرگ دروین. چونکە لە پێش زەمانی ئەودا عادەتی خەڵک وابوو پێستی حەیوانیان لە خۆیانەوە دەپێچا. هەروەها ئەوەڵ کەس بوو کە عیلمی نجووم و ئەستێرە ناسی و ریازیاتی زانیوە و تەرازوو و میزانی داناوە و ئەسلەحەی دروست کردوە. لە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی ئیدریسی پێغەمبەردا علیه السلام ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هەر ئینسانێک دڵی لەگەڵ خوا و بەندەکاندا پاک بێ ڕوتبەی لای خواوەندی گەورە بەرز دەبێتەوە. هەر کەسێک عیبادەتی خوا بکا نائومێد نابێ لە کەرەمی خوا. ئەو ئامۆژگاریەشمان دەست دەکەوێ کە دەبێ بنیادەم تا دەتوانێ بۆ سەربەرزی دنیا و قیامەت هەوڵ بدا. هەر وەکو ئیدریس پێغەمبەر لەگەڵ ئەوەشداکە پێغەمبەر بوو لە ماوەی تەمەنیدا دەستی لە کار هەڵ نەگرت، شەو و ڕۆژ خەریکی پەند و ئاموژگاری خەڵک و کار و کاسبی و عیلم و زانیاری بوو، بۆ پێش کەوتنی بەرەی ئادەمیزاد. چەند نمونەیەک لە ئامۆژگاریەکانی:

دەی فەرموو چاکە لەگەڵ بەندەگانی خوادا لە هەموو شوکرانەیەک گەورەترە. هەروەها دەی فەرموو: قەت حەسوودی بە ماڵی خەڵک مەبەن، دەی فەرموو: بە بەشی خۆتان ڕازی بن، دەی فەرموو: خۆتان لە کار و قسەی خەراپ بپارێزن، دوبارە دەی فەرموو: ئەگەر دوعاتان کرد بە دڵ لە بەر خواوەندی گەورە وەپارێن.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی ئیدریس. ئومێد دەکەم بۆ ڕاستی و ڕاست گۆیی و خوا ناسی و خزمەت چاو لەو پێغەمبەرە نازدارە بکەن، بەڵکو خواوەندی گەورە مەرتبەی دنیا و قیامەتتان بەرز کاتەوە.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلينَ.
وَالسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# حەزرەتی نوح

## باسی «حەزرەتی نوح» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلَى الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ، وَ عَلىٰ مَنْ تَبِعَهُمْ بِاِحْسٰانٍ اِلىٰ يَوْمِ الدِّينِ.

موسوڵمانینە گوێ ڕاگرن بۆ مانای ئەو ئایەتانە کە باسی حەزرەتی «نوح» دەکەن و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن و شوکرانەی خواوەندی گەورە بکەن.

ڕاوی دەڵێ لە دووا ئەوەی کە حەزرەتی ئیدریس نەما شەیتان دووبارە بە دەرفەتی زانی هەستا و خۆی بردە سەر شکڵی پیاوێکی بە دین و چوو بۆ لای نەوە و نەتیجەکانی حەزرەتی ئیدریس و گوتی: نامەردونەکەم! ئەوە بۆ حەزرەتی ئیدریستان فەرامۆش کردوە و لە بیر خۆتان بردۆتەوە؟ وەرن با وێنەیەکتان بۆ دروست کەم کە وەک ئەو بچێ و قسە کردن نەبێ هیچ جیاوازیان نەبێ. شەیتان وێنەیەکی حەزرەتی ئیدریسی بۆ دروست کردن و خەڵکەکە زۆریان حورمەت لێ دەگرت، تا بەوبۆنەوە بەرە بەرە پەرستیان و بت پەرستی بڵاو بۆوە. ئنجا«١٧٥» ساڵ پاش وەفاتی حەزرەتی ئیدریس خواوەندی گەورە لە عومری پەنجا«٥٠» ساڵیدا حەزرەتی نوحی کردە پێغەمبەر و ناردی بۆ سەر بت پەرستەکان.

هەروەکو خوای گەورە لە ئەووەلی سورەی «نوح»دا ئەوەمان بۆ باس دەکا و دەفەرمووێ:

﴿اِنّٰا اَرْسَلْنٰا نوحاً اِلیٰ قَوْمِهِ اَنْ اَنْذِرْ قَومَكَ مِنْ قَبْلِ اَنْ یَأْتِیَهُمْ عَذٰابٌ اَلیمٌ﴾.(١)

بە ڕاستی ئێمە حەزرەتی نوحمان ڕەوانە کرد بۆ سەر قەومەکەی و پێمان گوت: قەومەکەت ئاگادار بکە و بڵێ دەست لە کوفر و بت پەرستی هەڵگرن، تا عەزابی سەختیان تووش نەبووە.

﴿قٰالَ یٰا قَوْمِ اِنّي لَکُمْ نَذیرٌ مُبینٌ﴾.(٢)

حەزرەتی نوح گوتی: ئەی قەومی من بە ڕاستی من ئاگادارتان دەکەمەوە کە لە لایەن خواوە ئەمرم پێ کراوە.

﴿اَنِ اعْبُدُوا اللّٰهَ وَاتَّقُوهُ وَ اَطیعُونِ﴾.(٣)

کە پێتان ڕاگەیەنم ئیمان بە خوا بێنن و دەست لە بت پەرستی هەڵگرن و بە قسەی من بکەن. ئەگەر بە قسەم بکەن:

﴿یَغْفِرْ لَکُمْ مِنْ ذُنُوبِکُمْ وَ یُؤَخِّرْکُمْ اِلیٰ اَجَلٍ مُسَمّیً﴾.(٤)

خواوەندی گەورە لە خراپە و گوناحتان خۆش دەبێ و تا کاتی خۆی دەتان هێڵێتەوە.

﴿اِنَّ اَجَلَ اللّٰهِ اِذٰا جٰاءَ لٰا یُؤَخَّرُ لَوْ کُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾.(٥)

بەڵام ئەگەر خوا کاتی بۆ شتێک دیاری کرد ئەوە یەک سانی‌یە دووا ناکەوێ، خۆزگە ئەوەتان زانیبا و بە قسەتان بکردمایە.

﴿لَقَدْ لَبِثَ نُوحٌ في قَوْمِهِ زَمَناً طَویلاً﴾

حەزرەتی نوح ماوەیەکی زۆر لە ناو قەومەکەی‌دا مایەوە.

«یَدْعُوهُمْ اِلیٰ عِبٰادَةِ اللّٰهِ».

بانگی دەکردن بۆ خوا پەرستی، هەر وەکو خوای گەورە لە سورەی «العنکبوت»دا دەفەرمووێ:

﴿وَ لَقَدْ اَرْسَلْنٰا نُوحاً اِلیٰ قَوْمِهِ فَلَبِثَ فیهِمْ اَلْفَ سَنَةٍ اِلّٰا خَمْسینَ عٰاماً﴾.(٦)

---

(١) نوح: ١. (٢) نوح: ٢. (٣) نوح: ٣.
(٤) و (٥) نوح: ٤. (٦) العنکبوت: ١٤.

ئێمە حەزرەتی نووحمان بە پێغەمبەری نارد بۆ سەر قەومەکەی و ماوەی نۆسەت و پەنجا ساڵ لە ناویاندا مایەوە.

«وَ لٰكِنْ هٰذِهِ الْمُدَّةُ لَمْ تُؤْتِ ثِمٰارَهٰا».

بەڵام لەو ماوەیەدا و ئەو نۆسەت و پەنجا ساڵە هیچ سەمەرەی نەبوو.

«فَلَمْ يُؤْمِنْ بِرِسٰالَتِهِ اِلَّا الْقَليلُ مِنْهُمْ».

ئیمانیان پێ نەهێنا دەستەیەکی کەم نەبێ. لە سورەی «هود»دا دەفەرمووێ:

﴿فَقٰالَ الْمَلَأُ الَّذينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مٰا نَرٰاكَ اِلّا بَشَراً مِثْلَنٰا﴾.(١)

پیاو ماقووڵ و دەوڵەمەند و گەورەکانیان گوتیان: لە بەر چەند هۆیەک ئێمە تۆ بە پێغەمبەر نازانین. یەکەم تۆ ئینسانێکی وەک ئێمە دەخۆی و دەخۆیەوە، چۆن پێغەمبەر دەبێ وەک ئێمە بێ؟ لایان وا بوو پێغەمبەر دەبێ فریشتە بێ.

﴿وَ مٰا نَرٰاكَ اتَّبَعَكَ اِلَّا الَّذينَ هُمْ اَرٰاذِلُنٰا بٰادِيَ الرَّأْيِ﴾.(٢)

گوتیان: دووەم لە بەر ئەوەی ئەوانەی وەدووا تۆکەوتوون هەموویان فەقیر و هەژار و بێ عەقڵن و هەروا بە بێ بیر کردنەوە وەدووا تۆکەوتوون، نازانن حەق و ناحەق چی‌یە.

«وَ لَوْ كٰانَ حَقّاً مٰا تَقُولُ لَكُنّٰا اَسْبَقَ اِلَى الْايمٰانِ بِكَ وَ الْاِقْتِدٰاءِ بِهُدٰاكَ».

گوتیان: ئەگەر ئەوەی تۆ دەڵێی حەق بووایە چۆن ئێمە کە خاوەن بیر و هۆشین لە پێش ئەواندا ئیمانمان بە تۆ نەدێنا و وەدووات نەدەکەوتین.

﴿وَ مٰا نَرىٰ لَكُمْ عَلَيْنٰا مِنْ فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كٰاذِبِينَ﴾.(٣)

دووبارە گوتیان: خۆ ئێوە کە خۆتان بە موسوڵمان دەزانن هیچتان لە ئێمە زیاتر نی‌یە و لامان وایە درۆ دەکەن و لە درۆزنان.

لەگەڵ ئەوەشدا حەزرەتی نووح هەر بەردەوام بوو لە سەر دەعوەتی قەومەکەی و هەوڵی دەدا بۆ ڕازی کردنیان و جوابی قسەکانی دەدانەوە و دەیفەرموو:

﴿اَوَ عَجِبْتُمْ اَنْ جٰاءَكُمْ ذِكْرٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَلىٰ رَجُلٍ مِنْكُمْ لِيُنْذِرَكُمْ﴾.(۴)

ئایا زۆرو لا سەیرە کە لە لایەن خواوە یەکێک لە خۆتان بکرێ بە پێغەمبەر و یاسای ئاسمانیتان بۆ بێنێ، هیچ لاتان عەجایب نەبێ.

---

(١) و (٢) و (٣) هود: ٢٧. (۴) الأعراف: ۶٩.

﴿قٰالَ يٰا قَوْمِ اَرَاَيْتُمْ اِنْ كُنْتُ عَلىٰ بَيِّنَةٍ مِنْ رَبّي وَ آتٰاني رَحْمَةً مِنْ عِنْدِهِ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ﴾.(١)

گوتی: ئەی قەومی من ئەگەر دەلیل و بەڵگەی ئاشکراو بۆ بێنمەوە کە خوای گەورە منی کردووە بە پێغەمبەر ئێوە دەڵین چی؟ بەڵام بە داخەوە بە هۆی ماڵ و سەروەت و سامان و ڕوتبە و مەقامەوە پەردەی ڕەشی بە سەر عەقڵ و چاوتاندا کێشراوە و حەق نابینن.

«يَبْذُلُ نُوحٌ مُنْتَهىٰ وُسْعِهِ».

حەزرەتی نووح تەواوی تووانای خۆی بە خەرج دەدا.

«وَ اجْتَهَدَ بِغٰايَةِ اِمْكٰانِهِ».

هەرچی لە تووانایی‌دا بوو کردی.

«وَ طٰالَ الزَّمَنُ وَ هُوَ يُرٰاوِحُهُمْ بِالْعِظَةِ سِرّاً وَ عَلاٰنِيَةً».

لە ماوەی نۆسەد و پەنجا ساڵدا بە دزی و ئاشکرا ئامۆژگاری گەلەکەی دەکرد.

«وَ هُمْ لاٰ يَزْدٰادُونَ اِلّاٰ اِعْرٰاضاً».

بەڵام ئەوان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەر خرابتر ڕویان لێ وەردەگێڕا.

لە دووا ئەو هەموو گفتوگۆیە کافرەکان گوتیان:

﴿قٰالُوا يٰا نُوحُ قَدْ جٰادَلْتَنٰا فَاَكْثَرْتَ جِدٰالَنٰا فَأْتِنٰا بِمٰا تَعِدُنٰا اِنْ كُنْتَ مِنَ الصّٰادِقينَ﴾.(٢)

ئەی نووح دیارە تۆ زۆر کێشە لەگەڵ ئێمەدا دەکەی دە ئەگەر ڕاست دەکەی چیت لە دەست دێ بیکە؟ حەزرەتی نووح فەرمووی: ئێوە زۆر بێ عەقڵن، من چیم لە دەست نایە، منیش وەک ئێوە ئینسانم، هەموو شتێک بە دەست خوایە، ئەگەر بی هەوێ تووشی عەزابتان دەکا.

تا حەزرەتی نووح ئامۆژگاری بکردنایە ئەوان دەستیان دەکرد بە لێدانی و زۆریان لێ ئەدا. جاکە زانی بانگ کردن و ئامۆژگاریەکەی هیچ فائیدەی نیە و ڕۆژ لە دووا ڕۆژ کافرتر دەبن و زیاتری ناڕەحەت دەکەن. خوا فەرمووی:

(١) هود: ٢٨. (٢) هود: ٣٢.

﴿اِنَّهُ لَنْ يُؤْمِنَ مِنْ قَوْمِكَ اِلّا مَنْ قَدْ آمَنَ﴾.(١)

ئەوانە نەبێ کە ئیمانیان هێناوە تازە کەسی دی ئیمان ناهێنێ، دەستی کرد بە گریان و دوعاکردن لەگەلەکەی و گوتی:

﴿قالَ رَبِّ اِنّي دَعَوْتُ قَوْمي لَيْلاً وَ نَهاراً﴾.(٢) ﴿فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعائي اِلّا فِراراً﴾.(٣)

ئەی خوای گەورە خۆت ئاگاداری، من شەو و ڕۆژ و لەیل و نەهار بانگی ئەو گەلەم کردوە بۆ خواناسی بەڵام ئەوان ڕۆژ لە دوا ڕۆژ بە دەعوەتەکەی من کافرتر دەبن.

﴿رَبِّ لا تَذَرْ عَلَى الْاَرْضِ مِنَ الْكافِرينَ دَيّاراً﴾.(٤)

دەی گوت: ئەی خوای گەورە داوا دەکەم دوعام گیرا بکەی و یەکێک لەو قەومە کافرە لە سەر زەوی نەهێڵی تا تۆوی کافران نەمێنێ.

«اِسْتَجابَ اللّٰهُ لِدُعائِهِ».

خواوەندی گەورە دوعاکەی گیرا کرد.

«وَ اَرادَ سُبْحانَهُ قَبْلَ اَنْ يُهْلِكَ قَوْمَهُ الْمُكَذِّبينَ اَنْ يُهَيِّئَ لَهُ وَ لِلْمُؤْمِنينَ بِرِسالَتِهِ اَسْبابَ النَّجاةِ».

خوای گەورە ویستی لە پێش ئەوەدا کە کافرەکان بە هیلاک بچن ڕێگای نەجات بۆ حەزرەتی نووح بە خۆی و ماڵ و منداڵ و موسوڵمانەکانەوە بدۆزێتەوە. فەرمووی:

﴿وَ اصْنَعِ الْفُلْكَ بِاَعْيُنِنا وَ وَحْيِنا وَ لا تُخاطِبْني فِي الَّذينَ ظَلَمُوا اِنَّهُمْ مُغْرَقُونَ﴾.(٥)

ئەی نووح کەشتی نەجات‌دەر دروست بکە بە ئەمری من و لە ژێر چاودێری ئێمەدا، بەڵام تازە چی دی بۆ ئەو زاڵمانە لە بەر خوا مەپاڕێوە چونکە ئەمری غەرق بوونی ئەو زاڵمانەمان سادر کردوە.

﴿وَ يَصْنَعُ الْفُلْكَ وَ كُلَّما مَرَّ عَلَيْهِ مَلأٌ مِنْ قَوْمِهِ سَخِرُوا مِنْهُ﴾.(٦)

حەزرەتی نووح لە ژێر چاودێری حەزرەتی جوبرائیل‌دا بە ئەمری خوا دەستی کرد بە دروست کردنی کەشتی کافرەکان دەچوون گاڵتەیان پێ دەکرد و دەیان گوت: لە سەر پێغەمبەری ڕا بویە دارتاش؟ زۆریان ناڕەحەت دەکرد و پێی پێ دهکەنین.

---

(١) هود: ٣٦. (٢) نوح: ٥. (٣) نوح: ٦.
(٤) نوح: ٢٦. (٥) هود: ٣٧. (٦) هود: ٣٨.

﴿قٰالَ إِنْ تَسْخَرُوا مِنّٰا فَإِنّٰا نَسْخَرُ مِنْكُمْ كَمٰا تَسْخَرُونَ﴾.(١)

حەزرەتی نووح دەیفەرموو: گاڵتەی خۆتان بکەن ڕۆژێک دێ ئاواتان گاڵتە پێ بکەینەوە. خوا لە قورئاندا دەفەرمووێ: حەزرەتی نووح کەشتی‌یەکەی تەواو کرد و چاوەڕوان بوو؛

﴿حَتّٰى اِذٰا جٰاءَ اَمْرُنٰا وَ فٰارَ التَّنُّورُ﴾.(٢)

هەتا خوا ئەمری فەرموو: عەلامەت و نیشانەی تۆفان ئاشکرا بوو، بە ڕیوایەتێک دەڵێن: خوا وەحی کرد بۆ حەزرەتی نووح کە هەر کاتێ تەندوری نانی لە گڕە پێچاندا پڕ بوو لە ئاو ئەوە نیشانەی تۆفانە.

ڕۆژێ ژنی حەزرەتی نووح نانی دەکرد، بە ئەمری خوا تەندور پڕ بوو لە ئاو، ژنە هاواری کرد. حەزرەتی نووح زانی کاتی غەزەبی خوایە خوا فەرمووی:

﴿قُلْنَا احْمِلْ فيهٰا مِنْ كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَ اَهْلَكَ اِلّٰا مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَ مَنْ آمَنَ وَ مٰا آمَنَ مَعَهُ اِلّٰا قَليلٌ﴾.(٣)

هەستە لە هەموو نێرو مێیەک دووان بەرە ناو کەشتی‌یەکە و ماڵ و خێزان و موسوڵمانەکانیش. بەڵام ئەوانە ناکە عەزاب دەیان گرێتەوە، تا ئەوان خۆیان پێچایەوە، ئاسمان وەک کوندەی سەرەو ژێر ئاوی دەڕژاند و ئەرز ئاوی هەڵدەقووڵاند و شەپۆلی ئاو ئەرزو ئاسمان و دنیای پڕ کرد.

﴿وَ قٰالَ ارْكَبُوا فيهٰا بِسْمِ اللّٰهِ مَجْريهٰا وَ مُرْسٰاهٰا اِنَّ رَبّي لَغَفُورٌ رَحيمٌ﴾.(٤)

حەزرەتی نووح فەرمووی: مەترسن و ناوی خوا بێنن و بزانن کە ڕۆیشتن و گەڕان و ڕاوەستانی کەشتی بە دەست خوایە، کەشتی سەر ئاو کەوت.

﴿وَ هِيَ تَجْري بِهِمْ في مَوْجٍ كَالْجِبٰالِ﴾.(٥)

شەپۆلی ئاو وەک کێو بەرز ئەبوونەوە وکەشتی بەم لاو ئەو لادا دەفڕاند و یەک لە دوای یەک کافر غەرق دەبوون. حەزرەتی نووح خۆی کەشتی‌یەوان بوو، تەماشای کرد ئەوا

(١) هود: ٣٨. (٢) و (٣) هود: ٤٠. (٤) هود: ٤١.
(٥) هود: ٤٢.

کەنعانی کوڕی لە بەر شەپۆلی ئاو ڕادەکا بۆ سەر کێو، بەڵام دەقیقە بە دەقیقە شەپۆلەکان لێی نزیکتر دەبنەوە. لەو کاتەدا دەریای ڕەحمی هاتە جۆش و دەستی کرد بە جۆش و خرۆش. فرمێسک لە چاوانی وەک دانەی مرواری دەهاتنە خوار بە سەر ڕومەت و ڕیشی موبارەکی دا لەتاو کەنعانی کوڕی.

﴿وَ نَادىٰ نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَبْ مَعَنَا وَ لَا تَكُنْ مَعَ الْكَافِرِينَ﴾.(١)

خۆی پێ ڕانەگیرا و بانگی کرد و فەرمووی: ئەی کوڕی من وەرە سوار بە لەگەڵ ئێمە و دەست لە کوفر و کافران هەڵگرە. بەڵام کەنعان جوابی باوکی دایەوە و گوتی:

﴿قَالَ سَآوِي اِلىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ﴾.(٢)

گوتی: دەچم بۆ سەر ئەو کێوە بەرزە لە تۆفان ڕزگارم دەکا. حەزرەتی نووح دەستی کرد بە گریان و فەرمووی:

﴿لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ اَمْرِ اللّٰهِ اِلَّا مَنْ رَحِمَ وَ حَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ﴾.(٣)

ئەی کوری من هیچ شتێک ئەو ڕۆ ناتوانێ هیچ کەس لە عەزابی خوا خەلاس کا مەگەر کەسێک خوا ڕەحمی پێ بکا. ئەوان لەو گفتو و گۆیەدا بوون کە شەپۆل کەنعانی ڕفاند و ئەو باوک و فەرزەندەی لێک دیدار ئاخیرەت کردن. حەزرەتی نووح ئەوەندەی تریش غەمگین و ناڕەحەت بوو، دەگریا و دەپاڕایەوە لە بەر خواو دەیفەرموو:

﴿رَبِّ اِنَّ ابْنِي مِنْ اَهْلِي وَ اِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ﴾.(٤)

ئەی خوای گەورە خۆ کەنعان کوڕی منە و خۆشت وەعدەت دا هەرچی ئەهلی تۆ بێ نەجاتی دەبێ. لەو کاتەدا خوا وەحی کرد و فەرمووی:

﴿قَالَ: يَا نُوحُ اِنَّهُ لَيْسَ مِنْ اَهْلِكَ اِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ﴾.(٥)

ئەی نووح کەنعان بە ئەهلی تۆ حیساب ناکرێ، چونکە ئیمانی نەهێناوە. ئینجا حەزرەتی نووح تۆبە و ئیـ زۆری کرد و پاش چل شەوو چل ڕۆژ خوا فەرمووی:

---

(١) هود: ٤٢. (٢) و (٣) هود: ٤٣. (٤) هود: ٤٥.
(٥) هود: ٤٦.

﴿یا اَرْضُ ابْلَعِي مٰائَكِ وَ یا سَمٰاءُ اَقْلِعي وَ غِیضَ الْمٰاءُ وَ قُضِيَ الْاَمْرُ﴾.(١)

ئەی ئەرز ئاوی خۆت هەڵمژەوە و ئەی ئاسمان ئاوەکەت هەڵکێشەوە. ئەرز ئاوی خۆی قووت دایەوە و ئاسمان هەڵی کیشایەوە. دەتگوت قەت باران نەباریوە.

﴿وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ﴾.(٢)

کەشتی حەزرەتی نووح لە سەر کێوی جوودی لەنگەری گرت و نەجاتیان بوو. بەڵام بە ڕیوایەتێک دەڵێن لە پاش ماوەیەک حەزرەتی نووح و سێ کوڕ و سێ بووکەکەی نەبێ موسوڵمانەکان هەموویان مردن. خوا لەو شەش نەفەرە پەرەی بە ئادەمیزاد دایەوە و خاکی کوردستان بۆوە بەلانک و بێشکەی دووەمی ئادەمیزاد و بەشەر و حەزرەتی نووحیش لە عومری«١٠٥٠» ساڵیدا وەفاتی کرد و مەرقەدی موبارەکی لە شاری «موسڵە».

وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلِینَ.
وَالسَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَکٰاتُهُ.

---

(١) و (٢) هود: ٤٤.

# حەزرەتی هود

## باسی «حەزرەتی هوود» سەلامی خودای لە سەر بێ

### بسم الله الرحمن الرحیم

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلِینَ وَ عَلیٰ مَنْ تَبِعَهُمْ بِاِحْسٰانٍ اِلیٰ یَوْمِ الدّینِ.

با لە باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی هوود پێغەمبەر و بەسەرهاتی قەومی عاد کە حەزرەتی هود کرا بە پێغەمبەر و ڕوانە کرا بۆ سەریان، پەند و ئامۆژگاری زۆر وەرگرین. ئەو زاتە موبارەکە بە حەوت پشت دەچێتە سەر سامی کوڕی حەزرەتی نووح. خوای تەعالا کردی بە پێغەمبەر و ڕەوانەی کرد بۆ سەر قەومی عاد کە تائیفەیەک بوون لە بەینی «عوممان» و «حەزرەموت»دا نیشتەجێ بوون و بە ناوی باپیرە گەورەیان کە ناوی عاد بوو ناونران. بەڵام ئێستا وولاتی قەومی عاد هەر زیخ و چەوو ڕملە و ئاوەدانی لێ نیە.

خوای گەورە ئەوەندەی ناز و نیعمەت بە سەردا ڕشتبون مەگەر هەر خوا بزانێ! سەرچاوە و کانیاو و جۆ و جۆباری باشیان هەبوو، خەڵە و خەرمانیان زۆر باش و بە پیت و بەرەکەت بوو، باغ و باغاتیان زۆر بارەوەر بوو، لە بەردی تاشراو بەردی مەڕمەڕ قەسر و

خانوو و بینای باشیان دروست کردبوو، بە دەنێکی کەڵەگەت ڕەنگ و ڕوخسارێکی سوور و سپی و جوانیان هەبوو، لە خەڵکی ئەو زەمانە زۆر بە خۆوەتر و ساغتر و بـاڵا بـەرزتر بوون، ئەوەی خوا دابووی بەوان نەی دابوو بە کەس. بەڵام سەرەڕای ئەو هـەموو نـاز و نیعمەتە هیچ کاتێ بیریان لەوە نەدەکردەوە داخوا ئەو هـەموو بـەهرەیەیانە لە کـێوە پـێ گەیشتوە، نەیاندەزانی خوایەک هەیە و باڵادەستی هەموو کەسێکە، هاتبوون بە دەستی خۆیان چەند بەردیان تاشی بوو کردبویانن بە بت و دەیان پـەرستن. لە کـاتی خـوشی و شادیدا دەچوون کوڕنوشیان بۆ دەبردن و لە کاتی تەنگ و چەڵەمەشدا داوای یارمەتیان لێ دەکردن. تا بە تەواوی مەغرور بوون و دەستیان کرد بە بەد ئەخلاقی. جـا ئـەوە بـوو خوای گەورە حەزرەتی هودی کردە پێغەمبەر و بانگی کردن بۆ خواپەرەستی هەروەکـو خوای تەعالا لە چەند سووڕەتی قوڕئاندا بەسەرهاتی حەزرەتی هود و قەومی عادمان بۆ دەگێڕێتەوە. بە تایبەتی سوڕەتێکی لە قوڕئان بە ناوی سورەی «هود» ناو بردوە.

﴿وَ اِلیٰ عٰادٍ اَخٰاهُمْ هُوداً قٰالَ یٰا قَوْمِ اعْبُدُوا اللّٰهَ مٰالَكُمْ مِنْ اِلٰهٍ غَیْرُهُ﴾.(١)

خوا دەفەرمووێ: ئێمە برایەکی خۆیانمان بە ناوی هودەوە کردە پێغەمبەر و ڕەوانەمان کرد بۆ سەر قەومی عاد. دەعوەتی کردن و گوتی :قەومی من رو بکەنە عیبادەت و خوا پەرستی و دەست لە بت پەرستی هەڵگرن، چونکە خوا نەبێ کـەس شـایانی ئـەوە نـیە کوڕنوشی بۆ ببرێ و من پێغەمبەری خوام.

﴿قٰالَ الْمَلَأُ الَّذینَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ اِنّٰا لَنَرٰاكَ فی سَفٰاهَةٍ وَ اِنّٰا لَنَظُنُّكَ مِنَ الْكٰاذِبینَ﴾.(٢)

پیاو ماقووڵەکانیان گوتیان: ئێمە لامان وایە تۆ ئەقڵ سووکی و درۆ دەکەی پێغەمبەر نی.

﴿قٰالَ یٰا قَوْمِ لَیْسَ بی سَفٰاهَةٌ وَ لٰكِنّی رَسُولٌ مِنْ رَبِّ الْعٰالَمینَ﴾.(٣)

حەزرەتی هود زۆر بە نەرم و زۆر لە سەر خۆو بە ئەدەبەوە جوابی دانەوە و فەرمووی: ئەی گەلی من، من ئەقڵ سووک نیم و درۆزن نیم، بەڵکو پێغەمبەرم لە لایەن خواوە.

﴿اُبَلِّغُكُمْ رِسٰالاٰتِ رَبّی وَ اَنَا لَكُمْ نٰاصِحٌ اَمینٌ﴾.(٤)

(١) هود: ٥٠.　(٢) الأعراف: ٦۶.　(٣) الأعراف: ٦٧.
(٤) الأعراف: ٦٨.

دەستور و یاسای خواییتان پێ ڕادەگەیەنم و ئامۆژگاری کەرێکی ئەمینم بۆ ئێوە. ئەوە بۆلاتان سەیرە کە خوا یەکێک لە خۆتان بکا بە پێغەمبەر و دەعوەتتان بکا بۆ خواپەرستی و لە غەزەبی خوا بتان ترسێنێ؟

بۆ شوکری ئەو خوایە ناکەن کە ئێوەی لە جێگای قەومی نوح داناوە و بەدەن و لەشی ساغ و ملکێکی زۆری داونێ؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوا ناپەرستن.

کە چی لەگەڵ ئەو هەموو ئامۆژگارییەشدا گەلەکەی هەر زیاتر بێ ئەمریان دەکرد و زۆرتر خەریکی بت پەرستی و دنیا پەرستی دەبوون. ئەوەندە بە ماڵ و سەروەت و سامانی دنیا و روتبە و مەقام مەغرور بوون لایان وابوو کە هەتا هەتایە ئەو ماڵ و سەروەتەیان دەبێ و قەت نامرن. زۆر بە داخەوە زۆربەی خەڵکی ئێستاش وایە و وابیر دەکەنەوە. حەزرەتی هود ڕۆژێک ڕووی کردە گەلەکەی و فەرمووی:

﴿اَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ﴾.(١) ﴿وَ تَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ﴾.(٢)

ئەی گەلی من ئەوە بۆ ئەوەندە غافڵن لە سەر هەر تەپۆڵکەیەک قەسرێک بەرز دەکەنەوە؟

﴿وَ اِذَا بَطَشْتُمْ بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ﴾.(٣)

کاتێک ڕقیشتان هەستاو دەستتان بە سەر فەقیرێکدا ڕۆیشت وەک زاڵمی خەراپ وان.

﴿فَاتَّقُوا اللّٰهَ وَ اَطِيعُونِ﴾.(٤)

تەقوای خوا بکەن و بە قسەی من بکەن ئەو هەمووکانی و جۆگە و کارخانە و دروست کردون. لاتان وایە قەت نامرن و دنیا هەر بۆ ئێوەیە و هەر بۆ ئێوە دەبێ؟

﴿وَ اتَّقُوا الَّذِي اَمَدَّكُمْ بِمَا تَعْلَمُونَ﴾. ﴿اَمَدَّكُمْ بِاَنْعَامٍ وَ بَنِينَ﴾. ﴿وَ جَنَّاتٍ وَ عُيُونٍ﴾.(٥)

بۆ شوکرانەی ئەو خوایە ناکەن کە ئەو هەموو ملک و ماڵە وکچ وکوڕە و باغ و باغاتە و کانی و سەرچاوە و قەسرو قسوورەی داونێ.

---

(١) الشعراء: ١٢٨. (٢) الشعراء: ١٢٩. (٣) الشعراء: ١٣٠.
(٤) الشعراء: ١٣١. (٥) الشعراء: ١٣٢ ـ ١٣٤.

﴿إِنِّي أَخافُ عَلَيْكُمْ عَذابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾.(١)

فەرمووی: من زۆر دەترسم ڕۆژێک خوا تووشی عەزابێکی زۆر گەورەتان بکا.

﴿قالُوا يا هُودُ ما جِئْتَنا بِبَيِّنَةٍ وَ ما نَحْنُ بِتارِكِي آلِهَتِنا عَنْ قَوْلِكَ وَ ما نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ﴾.(٢)

کافرەکان گوتیان: خۆ تۆ بەڵگە و دەلیلی ئاشکرات نیە لە سەر ئەو دەعوایە. ئێمە دەست لە بت پەرستی و خوایەکانمان هەڵ ناگرین بە قسەی تۆ و ئیمانت پێ ناهێنین.

﴿إِنْ نَقُولُ إِلَّا اعْتَراكَ بَعْضُ آلِهَتِنا بِسُوءٍ﴾.(٣)

گوتیان: ئێمە لامان وایە هێندێک لە خوایەکانی ئێمە دەستیان لێ وەشاندووی و شێت بووی، بۆیە ئەو قسە پڕ و پوچ و بەتاڵانە دەکەی.

﴿قالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَ اشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِمّا تُشْرِكُونَ﴾.(٤) ﴿مِنْ دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعاً ثُمَّ لا تُنْظِرُونِ﴾.(٥)

حەزرەتی هوود جوابی دانەوە و فەرمووی: خوا شاهیدە لە سەر ڕاستی ئەوەی من دەی ڵێم و درۆناکەم، ئێوەش بە شاهید بن کە من بەریم لە کوفری ئێوە جا کەیفی خۆتانە هەرچی لە دەستتان دێ لە گەڵ خوایەکانتاندا بیکەن و دەقیقەیەک ڕامەوەستن.

﴿إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَ رَبِّكُمْ﴾.(٦)

من هیچ لە ئێوە ناترسم و موبالات و پێ ناکەم، چونکە من ئومێدم بەو خوایەیە کە هەست و خوستی منیش و ئێوەشی بە دەستە، بەڵکو؛

﴿ما مِنْ دابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِناصِيَتِها﴾.(٧)

هەرگیان لە بەرێک کە لە ئەرزو ئاسماندا هەیە ناو چاوانی بە دەست خوایە و هەرچی لە گەڵیان بکا دەسەڵاتی هەیە.

﴿قالُوا سَواءٌ عَلَيْنا أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُنْ مِنَ الْواعِظِينَ﴾.(٨)

کافرەکان گوتیان: ئێمە ئەو قسانەمان پێ هیچ نین، ئامۆژگاریمان بکەی و ئامۆژگاریمان نەکەی هەر پێمان یەک وایە. ئنجا غەزەبی خوا وە جۆش هات و نیشانەی بە هیلاک

(١) الشعراء: ١٣٥. (٢) هود: ٥٣. (٣) و (۴) هود: ۵۴.
(۵) هود: ۵۵. (۶) و (٧) هود: ۵۶. (٨) الشعراء: ١٣۶.

چوویان ئەوە بوو خوای تەعالا سێ ساڵ بارانی بۆ نەباراند و قاتی و گرانیان کەوتە ناو، حەزرەتی هوود ڕۆژێک پیاو ماقوڵەکانی کۆ کردنەوە و فەرمووی:

﴿وَ يا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا اِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّماءَ عَلَيْكُمْ مِدْراراً﴾.(۱)

ئەی قەومی من وەرن داوای لێ بوردنتان لە خوا بکەن و تۆبە لە گوناح بکەن خوا بارانتان بۆ دەبارێنێ. لە جوابدا گوتیان: دەست لە خوایەکانمان هەڵ ناگرین چەند کەس دەنێرین بۆ شاری مەککە داوای بارانمان بۆ بکەن. چەند کەسێکیان نارد بۆ مەککە و پاش چەند ڕۆژ خوا وەحی کرد بۆ حەزرەتی هوود کە کاتی بە هیلاک دانیان هاتووە و پەڵە هەورێکی چڵکنی ناردە سەریان.

﴿فَلَمّا رَاَوْهُ عارِضاً مُسْتَقْبِلَ اَوْدِيَتِهِمْ قالُوا هٰذا عارِضٌ مُمْطِرُنا﴾.(۲)

کاتێ کافرەکان چاویان بە هەورەکە کەوت زۆر دڵخۆش بوون گوتیان: ئەو هەورە ڕوی لە ئێمەیە و بارانمان بۆ دەبارێنێ، دیارە دوعای پیاوەکانمان قبوڵ بووە. بەڵام حەزرەتی هود فەرمووی:

﴿بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُمْ بِهِ رِيحٌ فِيها عَذابٌ اَلِيمٌ﴾.(۳)

دڵخۆش مەبن ئەوە هەور نیە تا بارانتان بۆ ببارێنێ، ئەوە بایە کۆڵەکەی بەستووە و بە غەزەبەوە ناردویەتی. خەڵکەکە گوتی: ئەی هود خۆ تۆ گوتت بایە و باش فێنکمان دەکاتەوە، حەزرەتی هود فەرمووی: ئاخر ئەو بایە بای غەزەبە.

﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِاَمْرِ رَبِّها﴾.(۴)

بە ئەمری خوا هەموو شتێک وێران دەکا. ئنجا خوا ئەمری کرد بە حەزرەتی هود کە خۆی و موسوڵمانەکان لە ئاوایی دور کەونەوە. هەر وەکو خوا لە قورئاندا دەفەرمووێ:

﴿وَ لَمّا جاءَ اَمْرُنا نَجَّيْنا هُوداً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ﴾.(۵)

لە کاتی هاتنی بەڵا و غەزەب بۆ سەر قەومی عاد ئێمە حەزرەتی هود و موسوڵمانەکانمان نەجات دا.

---

(۱) هود: ۵۲. (۲) و (۳) الأحقاف: ۲۴. (۴) الأحقاف: ۲۵.
(۵) هود: ۵۸.

﴿وَ اَمّا عادٌ فَاُهْلِكُوا بِريحٍ صَرْصَرٍ عاتِيَةٍ﴾.(١) ﴿سَخَّرَها عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيالٍ وَ ثَمانِيَةَ اَيّامٍ حُسُوماً﴾.(٢)

بەڵام قەومی عاد تەماشایان کرد بای غەزەب گاگەل و مەڕەکەی لە سەحرا بە ورد و درشتەوە پێش خۆ داوە. هاتن ژن و ماڵ و منداڵ و پاتەڵەکەیان هەرچی مابوو کردە ژوورانەوە، لایان وا بوو تازە با ناتوانێ زەفەریان پێ بەرێ، بەڵام کاتێ بە خۆیان زانی بای سەرسەرِ بە خۆیان کۆشک و تەلار و ماڵ و منداڵیانەوە بە هیلاکی بردن کە حەوت شەو و هەشت ڕۆژی خایاند.

﴿فَتَرَى الْقَوْمُ فيها صَرْعىٰ كَاَنَّهُمْ اَعْجازُ نَخْلٍ خاوِيَةٍ﴾.(٣)

ئەگەر چاوتان لێ بووایە دەت‌دی کە وەک دار خورما بەڕەگ و ڕیشەوە هەڵ کەنی ئاوا بەلادا دەهاتن و ئاسارى خۆیان و وەڵاتیان نەما.

ئنجا بە ڕیوایەتێک دەڵێن حەزرەتی هود لەگەڵ موسوڵمانەکان چوە (حەزرەموت) تا وەفاتی کرد. بە ڕیوایەتێکی کەش دەڵێن چوو بۆ مەککە و لە عومری«١٥٠»ساڵیدا لەوێ وەفاتی کرد و قەبری موبارەکی لای حیجری حەزرەتی ئیسماعیلە.

جا لە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی هود و قەومی عاد ئەو پەند و ئامۆژگاری‌یە دەبێ وەرگرین کە موسوڵمانی ڕاستەقینە دەبێ وەک حەزرەتی هود بێ و کافرەکان بە شێت و بێ عەقڵیان ناو دەبرد، کە چی ئەو بە زمانی خۆش جوابی دەدانەوە. نابێ وەک قەومی عاد بە ماڵ و دارایی بنازین و لە خوا و غەزەبی خوا غافڵ بین و بزانین خوا هەر ئەو خوایەیەو هەر کاتێ ئارەزو بکا هەرچی ئارەزووی لێ بێ دەیکا.

موسوڵمانینە بۆیە خوا لە سورەی «یوسف»دا فەرموویەتی:

﴿وَ لَقَدْ كانَ في قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِاُولِى الْاَلْبابِ﴾.(٤)

واتە لە باسی بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەند و ئامۆژگاری و عیبرەت هەیە بۆ ئینسانی ژیر کە پەندیان لێ وەرگرێ. هەروەها لە باسی قەومی عاد و حەزرەتی هوددا ئەوەشمان دەست دەکەوێ کە نابێ ئینسان ماڵی خۆی بۆ چاو لێ کەری خەرج کا و دەبێ وەزعی ئابوری و ئیقتسادی موراعات بکا.

---

(١) الحاقة: ۶. (٢) و (٣) الحاقة: ٧. (۴) يوسف: ١١١.

ئومێد دەکەم ڕوو بکەنە خواو پەند لە ژیانی ئەو پێغەمبەرانە وەرگرن بـەڵکـو خـوای تەعالا بۆ خاتری گەورەیی خۆیی و حورمەتی ئەو پێغەمبەرانە لێمان خۆش بێ.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# حەزرەتی ساڵح

## باسی «حەزرەتی ساڵح» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمینَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلینَ وَ عَلیٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحینَ.

حەزرەتی ساڵح پێغەمبەر لە یەکێ لە تائیفەکانی قەومی سەموود و لە ئەولادی سامی کوڕی حەزرەتی نوحە. خواوەندی گەورە کردی بە پێغەمبەر و ناردی بۆ سەر قەومی سەموود کە لە بەینی شاری مەدینە و شامدا نیشتەجێ بوون و ئیستاش عەلامەت و نیشانەی خانوەکەیان ماوە و بە وڵاتەکەیان دەڵێن «فج الناقة». قەومی سەموود بت پەرست بوون، زۆر دەوڵەمەند و خاوەن دەسەڵات بوون، مەڕو ماڵاتیان زۆر بوو، باغ و باغاتیان زۆر خاوەن بەر بوو، دەغڵ و دانیان زۆر باشی دەبڕی، زوربەی خانوەکانیان لە بەرد هەڵکەندرا بوون، زۆریان حەز لە خواردن و خواردنەوە و بەرگ و لیباسی جوان بوو، زۆر شەهوەت پەرست و هەوەس‌باز بوون. خوای تەعالا حەزرەتی ساڵحی کردە پێغەمبەر و ناردیە سەریان.

﴿وَ اِلی ثَمُودَ اَخاهُمْ صٰالِحاً قٰالَ یٰا قَوْمِ اعْبُدُوا اللّٰهَ مٰا لَکُمْ مِنْ اِلٰهٍ غَیْرُهُ﴾.(١)

حەزرەتی ساڵح چوو خەڵکەکەی کۆکردەوە و فەرمووی: ئەی گەلی من، من فرستادەم لە لایەن خواوە، وەرن مەردی خوا بن بە قسەم بکەن، دەست لەو بت پەرستی‌یە هەڵگرن و ڕو بکەنە خوا پەرستی و شەریکی بۆ پەیدا مەکەن خوا نەبێ کەسی دی خوامان نی‌یە. چۆن دەبێ کوڕنوشی بۆ نەبەن و نەی پەرستن.

﴿هُوَ اَنْشَاَکُمْ مِنَ الْاَرْضِ وَاسْتَعْمَرَکُمْ فِیهٰا﴾.(٢)

کە هەر ئەو ئێوەی لە خاک دروست کردوە و ئەسبابی ئاوەدان کردنەوەی زەوی داونێ. خوایەک کە خاوەنی ئەو هەموو ناز و نیعمەتە و فەزڵ و گەورەییە بێ زۆر شایانە و واجبە لە سەرمان کە بی پەرستین.

﴿فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا اِلَیْهِ اِنَّ رَبّی قَرِیبٌ مُجیبٌ﴾.(٣)

لە بەرامبەر ئەو خەراپی‌یە و ئەو گوناحەی کە تا ئێستاش کردوتانن داوای لێ بوردنی لێ بکەن. خوای من لە عەبدو بەندەگانی نزیکە و زۆر زوو بە دەنگیانەوە دێ و جوابی دووعایان دەداتەوە. بەڵام قەومی سەموود گوێی خۆیان کەڕ کرد و قفڵی دڵیان داخست و چاویان لە ڕاست حەق کوێر کرد و باوەڕیان پێ نەکرد.

﴿قٰالُوا یٰا صٰالِحُ قَدْ کُنْتَ فِینٰا مَرْجُوّاً قَبْلُ هٰذٰا اَتَنْهٰنٰا اَنْ نَعْبُدَ مٰا یَعْبُدُ آبٰاؤُنٰا وَ اِنَّنٰا لَفی شَكٍ مِمّٰا تَدْعُونٰا اِلَیْهِ مُرِیبٍ﴾.(٤)

پیاو ما قوڵەکان گوتیان: ئەی ساڵح خۆ تۆ پیاوێکی زۆر عاقڵی، ئێمە لامان وا بوو کە هەر ئاگرێک هەڵایسێ تۆ دەی کوژێنیەوە و لە هەموو تەنگ و چەڵەمەیەکدا فریامان دەکەوی، کە چی قسەی وا دەکەی پیاوی بێ‌عەقڵیش نای‌کا، تازە دەڵێی وەرن دەست لەو خوایانە هەڵگرن کەساڵەهای ساڵە باب و باپیرانی ئێمە دەیان پەرستن؟ ئێمە باوەڕمان بە قسەی تۆ نیە و دەست لە خوایەکانمان هەڵ ناگرین. حەزرەتی ساڵح فەرمووی:

﴿فَاتَّقُوا اللّٰهَ وَ اَطِیعُونِ﴾.(٥)

عیبادەت و تەقوای خوا بکەن و بە قسەم بکەن، خۆتان دەزانن من لە خۆتانم و قازانجی ئێوەم دەوێ.

---

(١) و (٢) و (٣) هود: ٦١. (٤) هود: ٦٢. (٥) الشعراء: ١٤٤.

﴿أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هٰهُنَا آمِنِينَ﴾.(١)

ئایا لاتان وایە خوا لێتان دەگەڕێ هەتا هەتایە ئەو باغ و باغاتە و ئەو خەلە و خەرمانە و ئەو کۆشک و تەلارە بۆ ئێوە بێ؟ وا مەزانن. تا سەر نایخۆن. ئنجا بە هۆی کۆششی حەزرەتی سالح لە ئامۆژگاریەکانیدا و دەست هەڵنەگرتن، هێندێک لە فەقیر و هەژار و دەست کورتەکانیش ئیمانیان هێنا. بەڵام دەوڵەمەندەکانیان گوتیان:

﴿قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ﴾.(٢)

ئەو قسە بێ مەعنایانە چین دەیان کەی؟ لامان وایە دەستیان لێ وەشاندووی یان سیحریان لێ کردووی، دەنا.

﴿مَا أَنْتَ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا﴾.(٣)

خۆ تۆ بنیادەمێکی وەک ئێمەی، بە حەسەب و نەسەب لە ئێمە گەورەتر نی، بە ماڵ و سەروەتیش ناگەیە ئێمە، زۆر پیاوی واشمان هەن بۆ پێغەمبەری لە تۆ لایقترن، ئەگەر خوا پێغەمبەر دانێ لەوانی دادەنێ؟

حەزرەتی سالح گوێی نەدایە قسەی دەوڵەمەندەکان و شەو و رۆژ خەریکی ئامۆژگاری کردنی گەلەکەی بوو.

ئنجا دەوڵەمەندەکان کە زانیان ئامۆژگاریەکانی زۆر دڵگیرن و لەوانەیە خەڵک باوەڕی پێکەن و ئەوان دەسەڵات و گەورەییەکەیان لە دەست دەرچێ ناچار بۆ ئەوەی زوربەی خەڵکەکە دووای نەکەون، گوتیان:

﴿فَأْتِ بِآيَةٍ إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾.(٤)

دە ئەگەر ڕاست دەکەی موعجیزەیەکمان نیشان بدە تا باوەڕت پێ بکەین. حەزرەتی سالح فەرمووی: باشە چ موعجیزەیەک داوا دەکەن؟ گوتیان: بەیانی جەژنمانە و دەچین لەو دەشتە کۆ دەبینەوە تۆ هاواری خوای خۆت بکە و ئێمەش هاوار دەکەینە بوتەکانمان، کێ هەمان جوابی درایەوە هەمومان دووای دەکەوین، حەزرەتی سالح فەرمووی: باشە.

چونە شوێنە دیاری کراوەکە و کافرەکان زۆریان هاواری بوتەکان کرد و پاڕانەوە وەدەنگ نەهاتن، لەو کاتەدا جەندەعی کوڕی عەمر کە ریش سپیان بوو ڕووی کردە

---

(١) الشعراء: ١٤٦. (٢) الشعراء: ١٥٣. (٣) و (٤) الشعراء: ١٥٤.

حەزرەتی ساڵح وگوتی: دە ئەگەر ڕاست دەکەی تۆ پیغەمبەری لەو بەردە حوشترێک با بێتە دەرێ و مێی بێ و لە پێش چاوی ئەو خەڵکە بزێ و بەشی هەموو خەڵکەکەی شیر تێدا بێ تا ئیمانت پێ بێنین! لەو کاتەدا بە فەرمانی ڕەبی جەلیل حەزرەتی جوبرەئیل هاتە خوارێ و فەرمووی: خوا دەفەرمووێ:

﴿إِنَّا مُرْسِلُوا النَّاقَةِ فِتْنَةً لَهُمْ فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ﴾.(١) ﴿وَ نَبِّئْهُمْ اَنَّ الْمٰاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُحْتَضَرٌ﴾.(٢)

بە حەزرەتی ساڵح بڵێ نەترسێ و دوعا بکا، ئێمە دوعای گیرا دەکەین، ئەو وشترەمان لەو بەردەدا خەڵق کردوە بۆ ئەوەی ببێتە فیتنە بۆ ئەوان، بەڵام پەیمانیان لێ وەرگرێ کە هیچی لێ نەکەن هەر شیرەکەی بۆ ئەوان حەڵاڵە، ئەگەر بیکوژن یان بیفەوتێنن خوا غەزەبیان لێ دەگرێ. هەروەها پێیان بڵێ دەبێ ئاوی بیرەکەیان بکەنە نۆرە ڕۆژێک بۆ وشترەکە و ڕۆژێک بۆ خۆیان و مەڕ و ماڵاتیان هەرکەسێ بەشی خۆی دەخوا. حەزرەتی ساڵح ئەو پەیمانەی لەگەڵ کردن و ئەوانیش قبوڵیان کرد. ئنجا حەزرەتی ساڵح هەستا دەستی کرد بە دوعاکردن و موسوڵمانەکانیش دەیان گوت: ئامین، لە ناکاوێک بە ئەمری خوا بەردەکەناڵەیەکی لێ هات و شەق بوو. وشترێکی لێ هاتە دەرێ کە تا ئەوکاتەکەس بە چاوی خۆی وشتری مێیی وا جوانی نەدیبوو، لە پاش ماوەیەک بەچکەیەکی بوو.

﴿قٰالَ هٰذِهِ نٰاقَةٌ لَهٰا شِرْبٌ وَ لَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَعْلُومٍ﴾.(٣)

جا حەزرەتی ساڵح شوکری خوای کرد و ڕوی کردە خەڵکەکە وگوتی: ئەی خەڵکینە ئەوە حوشتری خوایە و هەر ڕۆژە نا ڕۆژێک نۆرە ئاویەتی:

﴿وَ لٰا تَمَسُّوهٰا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذٰابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾.(٤)

فەرمووی:بەڵام نابێ نیازی خەرابتان دەر حەق ئەو حوشترە هەبێ، دەنا تووشی غەزەبی خوا دەبن. قەومی سەموود نۆ بەرە باب بوون، لەوڕۆژەدا زوربەی بەرە بابێکیان موسوڵمان بوون، ئەو حوشترە زەمانێک مایەوە تا لە نۆبەی خۆیدا دەچۆ سەر بیراوەکە و هەموو ئاوی بیرەکەی دەخواردەوە، لە نۆبەی ئەودا هیچ حەیوانێک نەدەوێرا بچێتە سەر

(١) القمر: ٢٧. (٢) القمر: ٢٨. (٣) الشعراء: ١٥٥.
(٤) الشعراء: ١٥٦.

ئاوەکە. موعجیزەی گەورە لەوەدا بوو کە ئاوەکەی دەخواردەوە و دەیان دۆشی بەشی هەموو ماڵێک و هەموو کەسی شیری تێدا بوو. ئاوەکە هەمووی دەبوو بە شیر، ئەو موعجیزە گەورەیە دڵی کافرە گەورەکانی تەزاند و دەترسان کە تەواوی خەڵکەکە وەدوای کەون و پایە و روتبە و مەقامی ئەوان نەمێنێ. ڕۆژێک موسوڵمانەکانیان کۆکردنەوە و گوتیان:

﴿اَتَعْلَمُونَ اَنَّ صٰالِحاً مُرْسَلٌ مِنْ رَبِّهِ﴾.(١)

ئایا ئێوە لاتان وایە کە ساڵح پێغەمبەرە و ئیمانتان پێیە؟

﴿قٰالُوا اِنّٰا بِمٰا اُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾.(٢)

لە جوابدا گوتیان: بەڵێ ئەوەی دەیڵێ ئیمانمان پێیە، کافرەکان گوتیان:

﴿اِنّٰا بِالَّذِي آمَنْتُمْ بِهِ كٰافِرُونَ﴾.(٣)

دەنا ئێمە ئیمان بەو ساڵحە ناهێنین و باوەڕمان پێ نیە، کافرەکان کە زانیان تازە هیچیان بۆ دەگەڵ حەزرەتی ساڵح و موسوڵمانەکان ناکرێ و مەڕ و ماڵاتەکەشیان زۆر کەوتۆتە تەنگ و چەڵەمەوە و لە نۆبەی حوشترەکەدا نەدەوێران بچنە سەر ئاوەکە، لە بەینی خۆیاندا بڕیاریان دا کە حەزرەتی ساڵح بکوژن. بەڵام خواوەندی گەورە بە هۆی حەزرەتی جوبرەئێلەوە حەزرەتی ساڵحی ئاگادار کرد و نەیانتوانی پیلانەکەیان بەرنە سەر. کە زانیان حەزرەتی ساڵح بە پیلانەکەی زانیون و ناتوانن لە بەر خزم و موسوڵمانەکان بیکوژن هاتن تەکبیریان کرد و گوتیان: بەیانی نۆرە ئاوی حوشترەکەیە لە هەر تائیفە یەک نەفەرێکیان هەڵ بژارد و ئارەقیان دەرخوارد دان و بە شیر و تیرەوە ناردیانن بۆ کوشتنی حوشترەکە.

لەو کاتەدا کە حوشترەکە سەری نابۆ ناو بیرەکە و ئاوی دەخواردەوە قیدار ناوێک تیرێکی هاویشت و لە گەردەنی حوشترەکەی دا. ئنجا لە پاشەوەڕا مصدع ناوێک بە شمشێر سەری بری و کوشتیان.

هەروەها ویستیان بەچکەکەشی بکوژن، بەڵام بۆیان نەگیرا و ڕای کرد و وەدوای کەوتن تا گەیشتە لای ئەو بەردەی کە دایکەکەی لێ هاتبۆ دەرەوە، بە قودرەتی خوا بەردەکە شەق بوو بەچکە حوشترەکە چۆوە ناوی و وێک کەوتەوە و هیچیان بۆ دەگەڵ

---

(١) و (٢) الأعراف: ٧٥. (٣) الأعراف: ٧٦.

نەکرا. جا ئەوەیە کە دەڵێن «ئەوە چیە لە دایکی هاتە دەر و چوو دەنەنکی یەوە»، خولاسەی کەلام.

﴿فَعَقَرُوا النّٰاقَةَ وَ عَتَوْا عَنْ اَمْرِ رَبِّهِمْ﴾.(۱)

حوشترەکەیان سەر بڕی و بێ ئەمری خوایان کرد و پەیمانەکەیان شکاند. بەوەش دەستیان هەڵ نەگرت گوتیان:

﴿وَ قٰالُوا يٰا صٰالِحُ ائْتِنٰا بِمٰا تَعِدُنٰا اِنْ كُنْتَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾.(۲)

ئەی سالْح دە ئەگەر ڕاست دەکەی پێغەمبەری با ئەو عەزابەی کە دەت گوت، بێتە سەرمان، حەزرەتی جۆبرەئیل هات و فەرمووی: پێیان بڵێ سێ ڕۆژیان ژیان ماوە.

﴿فَقٰالَ تَمَتَّعُوا فِي دٰارِكُمْ ثَلاٰثَةَ اَيّٰامٍ ذٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾.(۳)

حەزرەتی سالْح فەرمووی: تا سێ ڕۆژی دی رابوێرن. خۆتان دەبیننەوە.

﴿فَلَمّٰا جٰاءَ اَمْرُنٰا نَجَّيْنٰا صٰالِحاً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ﴾.(۴)

قورئان دەفەرموێ: خوا دەفەرموێ: کاتێ بە ئەمری ئێمە بەڵا نازڵ بوو ئەمرمان کرد بە حەزرەتی سالْح و موسوڵمانەکان لەو جێگایە دور کەونەوە و نەجاتمان دان. بەڵام.

﴿وَ اَخَذَ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَاَصْبَحُوا فِي دِيٰارِهِمْ جٰاثِمِينَ﴾.(۵)

بە نەعرەتەیەکی حەزرەتی جوبرەئیل تەواوی کافرەکان مردن دڵیان لەت بوو بە جەهەننەم مووشەڕڕەف بوون. حەزرەتی سالْح و موسوڵمانەکان کۆچیان کرد بۆ شام و لە عومری پەنجا و هەشت ساڵیدا لە شام وەفاتی کرد.

ئەوە بوو باسی بەسەرهاتی حەزرەتی سالْح و قەومی سەموود ئومید دەکەم پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری لێ وەرگرن تا لە دونیا و قیامەتدا سەرکەوتوو بن و خوا لە بەڵا و موسیبەت بمان پارێزێ.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(۱) و (۲) الأعراف: ۷۷. (۳) هود: ۶۵. (۴) هود: ۶۶.
(۵) هود: ۶۷.

**١**

# حەزرەتی ئیبراهیم

## باسی «حەزرەتی ئیبراهیم» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

**اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینَ وَ السَّلٰامُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا اِبْرٰاهِیمَ اَبِی الْاَنْبِیٰاءِ وَ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللّٰهِ وَ عَلیٰ سٰائِرِ الْاَنْبِیٰاءِ وَ الْمُرْسَلِینَ.**

ئەوە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی ئیبراهیم خەلیلُاللّەیە

ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە بە نۆ پشت دەچێتەوە سەر حەزرەتی «نوح» پێغەمبەر و دوو هەزار و سەد ساڵ دووا تۆفانی حەزرەتی نوح لە دایک بوە قسەی ڕاستیش ئەوەیە کە لە باکوری عێراقی ئێستادا واتە لە شاری «فداڕام» لە کوردستان لە دایک بووە. هەر چەند قورئان بە ئاشکرا باسی جێگە و کاتی لە دایک بوونی نەکردوە، بەڵام مێژوونووس و عولەمای تەفسیر هێندێکیان دەڵێن لە کاتیکدا دنیا پڕ ببوو لە بت پەرستی، کوفر و گومراهی پەرەی سەندبر [illegible] رستی نەمابوو، «نمرود» کە پاشای ئەو وڵاتە بوو، داوای خوایەتی دەکرد، هەزاران بت [illegible] پەرسترا، بە ئەمر و ئیرادەی خوا ڕۆژێک «نمرود» لە سەر تەختی جەواهێر دانیشتبوو، سەدەها زانا و مونەجم و ڕاهیب و ئەستێرەناس

کورنوشیان بۆ بردبوو. لە دەوری بە چۆکدا هاتبون و بە غەمناکی سەریان بەردابۆوە. «نمرود» سەری بەرز کردەوە و ڕوی کردە خەڵکەکە و گوتی: ئەوە چیتان بیستووە وا بە غەمناکی دانیشتوون و قسە ناکەن؟ ئەستێرەناسان گوتیان پاشا بە سەلامەت بێ. ئەستێرەیەک لە ئاسمان پەیدا بووە کە تا ئێستا ئەو ئەستێرەمان نەدیوە.«نمرود» گوتی: باشە هۆی پەیدا بوونی ئەو ئەستێرە چیە و ئێوە بۆ ئەوەندەی پێ ناڕەحەتن؟ گوتیان: ئەی پاشا ئەوە ئەستێرەی منداڵێکە کە لێرە بە دواوە لە دایک دەبێ و سەڵتەنەتی تۆ لە بەین ئەبا. «نمرود» تەزوێکی لە بەری پێی ڕاهات و لە سەری چۆ دەرێ و گوتی: کەی لە دایک دەبێ؟ گوتیان: لە ماوەی سێ شەو و ڕۆژی دیدا و بە ڕیوایەتێک گوتیان: لە ماوەی سێ مانگی دیدا لە ڕەحەمی دایکیدا قەرار دەگرێ، «نمرود» ئەمری کرد ئەو سێ شەو و ڕۆژە، یان ئەو سێ مانگە هیچ ژن و پیاوێک نەچنە لای یەکتر. نەمرود پیاوێکی بوو ناوی ئازەر بوو، ئەمینداری بوو، شەو تا بەیانی ئاگاداری نەمرودی دەکرد، بە دەستێکی شەمع ڕادەگرت و بە دەستەکەی دی شمشێر، ئەو شەوە بە قودرەتی خوا ئازەر ئارەزووی بزوت و لە دڵی خۆیدا گوتی: خۆزگە ئێستا خێزانەکەم لێرە دەبوو لە گەڵم ڕادەبوارد، بە ئەمر و ئیرادەی خوا هەر لەو کاتەشدا ژنەکەی خەوی لێ گۆڕابوو ئارەزوی کرد کە چۆن بچێتە لای ئازەر و تۆزێک پێکەوە ڕابوێرن، هەر ئەم دیو ئەو دیوی کرد، ئاخری خۆی بۆ ڕا نەگیرا نیوە شەو لە ماڵ هاتە دەرەوە و خۆی گەیاندە کۆشکی «نمرود» کە لە دورەوە ڕوانی هەموو قەرەوڵ و پاسەوان و حەرەسەکان خەویان لێ کەوتبوو، بە لادا هاتبون، بە سپاوی چۆ ژوورەوە. کە ڕوانی ئەوا ئازەر لە سەر سەری «نمرود» ڕاوەستاوە و بە دەستێکی شمشێر و بە دەستەکەی دی شەمعێکی گرتووە و «نمرود» لە پرخەی خەودایە و ئازەر پاسەوانی دەکا چووە ژورەوە، ئەو ژن و مێردە کە چاویان بە یەکتر کەوت لە باتی بترسن ئەوەندەی دیش ئارەزوویان بزوت، بەڵام ئازەر هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە دزیەوە گوتی: جا چبکەم خۆمن هەردو دەستم گیراون، ڕاوی دەڵی بە ئەمری خوا لە غەیبەوە پەریەک پەیدا بوو، شەمع و شمشێری لە ئازەر وەرگرت و ئەو ژن و مێردە هەر لە کۆشکی «نمرود»دا وێک کەوتن و نوتفەی حەزرەتی ئیبراهیم لە پشتی باوکیڕا چۆ ناو ڕەحەمی

دایکی و دایکی گەرایەوە بو ماڵ. بۆ بەیانی «نمرود» کە لە خەو هەستا تەماشای ناو چاوانی ئازەری کرد و گوتی: ئازەر ئەو ڕۆ ناو چاوانت زۆر جوان و نورانیە چ قەوماوە؟ ئازەر کورنوشێکی بۆ برد و گوتی: قوربان ئەوە نیشانەی خۆشەویستی بتەکانە و عیبادەتی زۆرمە. ئنجا «نمرود» وەکو ڕۆژان چوو لە سەر تەختی سەڵتەنەت دانیشت و ڕەهبان و مونەجحم و ئەستێرەناسی بانگ کردن و گوتی: پێم بڵێن داخوا ئەو منداڵە چۆتە ڕەحەمی دایکی‌یەوە یان نا؟ ئەستێرەناسان تەماشای ڕمل و ئوسترلابیان کرد و گوتیان: ئەی پاشا قەزا کاری خۆی کردوە و ئەو شەۆ ئەو نوتفەیە چۆتە ناو رەحەمی دایکی‌یەوە. «نمرود» دەستوری دا کە هەر ژنێک سکی پڕە ئاگاداری بکەن کە منداڵەکەی بوو ئەگەر کوڕ بوو بیکوژن، هەر ژنێک لەو چەند مانگەی دواییدا کوڕی بوو کوڕەکەیان کوشت. بەڵام کە خوا ئارەزووی لە شتێک بوو بە کەس مەنع ناکرێ، جا دایکی حەزرەتی ئیبراهیم کە نۆ مانگ و نۆ ڕۆژەی تەواو بوو دەستی کرد بەگریان و گوتی: جا چی بکەم خۆ ئەگەر بزانن کوڕە دەی کوژن، هەستا بە دزیەوە خۆی گەیاندە ئەشکەوتێک و لەوێ کوڕێکی بوو، زۆر بۆ حاڵی خۆی و منداڵەکە گریا. بەڵام هیچ چاری نەبوو کراسێکی دەمنداڵەکەوە پێچا و لە ئەشکەوتەکەدا بە جێی هێشت و گەڕایەوە بۆ ماڵ. بەڵام هەر وەکو دەڵێن و گوتویانە: کە خوا ویستی شتێک بکا سەبەبی بۆ دەرەخسێنێ، خوا حەزرەتی جوبرەئیلی نارد و دەستی منداڵەکەی لە کراسەکە هێنایە دەرێ و قامکی شەهادەی منداڵەکەی خستە دەمی منداڵەکەوە و دەستی کرد بە مژینی.

وەک مەمکی دایکی شیری لێ دەهات. لە پاشان هەموو هەفتەیەک دایکی دەچوو سەری لێ دەدا و دەگەڕایەوە، تا پازدە مانگ لە ئەشکەوتەکەدا مایەوە.

ڕۆژێک ئازەر لە خێزانەکەی دەپرسێ و دەڵێ ئەرێ سکەکەت چی لێ بەسەر هات؟ ژنەکەی گوتی: وەرە با پێت بڵێم، بە دزیەوە چوون بۆ ئەشکەوتەکە، ئازەر کە چاوی بە منداڵەکەوت زۆر کەیف خۆش بوو، بردیانەوە بۆ ماڵ، ڕۆژ بە ڕۆژ نیشانە و عەلامەتی گەورەیی لە بیر و باوەڕی ئاشکرا دەبوون، هەر وەکو قوڕئان دەفەرموێ:

﴿وَ لَقَدْ آتَیْنٰا اِبْرٰاهِیمَ رُشْدَهُ مِنْ قَبْلُ وَ کُنّٰا بِهِ عٰالِمِینَ﴾.(١)

واتە هەر لە منداڵیڕا بیر و باوەڕ و عەقڵ و شعورمان دا بە ئیبراهیم و ئێمە دەمان زانی دەبێتە چ پیاوێک، ئنجا کە زانی باوک و باپیر و خەڵکەکە بت و سەنەم و مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە دەپەرستن زۆری پێ ناخۆش بوو. دەیگوت: نابێ خوا شتێک بێ بە دەست دروست کرابێ، تا خوا کردی بە پێغەمبەر و دە سەحیفەی بۆ نارد پڕ بوون لە ئامۆژگاری.

حەزرەتی ئیبراهیم بە پێویستی سەر شانی زانی کە لە پێش هەموو کەس دا باوکی بانگ بۆ خوا پەرستی. بەڵام ویستی بە زمانی شیرین و بە ئەدەب قسە لەگەڵ باوکیدا بکا،فەرمووی:

﴿یٰا اَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مٰا لٰا یَسْمَعُ وَ لٰا یُبْصِرُ وَ لٰا یُغْنِي عَنْكَ شَیْئاً﴾.(٢)

ئەی باوکە بۆچی عیبادەت بۆ شتێک دەکەی کە ڕوحی لە بەردا نیە و هیچ نابینێ و ناتوانێ نە خێرتان پێ بگەیەنێ، نە تووشی شەڕتان بکا؟

حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی:

﴿یٰا اَبَتِ اِنّي قَدْ جٰاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ مٰا لَمْ یَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي اَهْدِكَ صِرٰاطاً سَوِیّاً﴾.(٣)

ئەی باوکە لە لایەن خواوە شتێکم پێ گوتراوە و دەی زانم کە تۆ نایزانی وەرە بە قسەم بکە و دەست لە بتپەرستی هەڵگرە و وەرە سەر ڕێگای ڕاست. گوتی:

﴿یٰا اَبَتِ لٰا تَعْبُدِ الشَّیْطٰانَ اِنَّ الشَّیْطٰانَ کٰانَ لِلرَّحْمٰنِ عَصِیّاً﴾.(۴)

ئەی باوکە شەیتان بێ ئەمری خوای کردوە بە قسەی مەکە

﴿یٰا اَبَتِ اِنّي اَخٰافُ اَنْ یَمَسَّكَ عَذٰابٌ مِنَ الرَّحْمٰنِ فَتَکُونَ لِلشَّیْطٰانِ وَلِیّاً﴾.(۵)

ئەی باوکە زۆر دەترسم بە هۆی بتپەرستی و وەدوا کەوتنی شەیتان تووشی عەزابی خوا ببی.

بەڵام ئەو هەموو ئامۆژگاری‌یە جوانانە هیچ سوودی‌یان نەبوو، نەک هەر سودی‌یان نەبوو، بەڵکو ئازەر زۆر بە ناشیرینی و تووڕەییەوەش جوابی دایەوە و گوتی:

﴿قٰالَ: اَرٰاغِبٌ اَنْتَ عَنْ آلِهَتِي یٰا اِبْرٰاهِیمُ لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ لَاَرْجُمَنَّكَ وَاهْجُرْنِي مَلِیّاً﴾.(۶)

---

(١) الأنبیاء: ۵١. (٢) مریم: ۴٢. (٣) مریم: ۴٣.
(۴) مریم: ۴۴. (۵) مریم: ۴۵. (۶) مریم: ۴۶.

ئایا تۆ ئیمانت بە خوای من نیە و ڕووی لێ وەر دەگێری؟ زۆر سەیرە ئەگەر دەست لەو قسانە هەڵ نەگری و واز نەهێنی ڕەجمت دەکەم و بەردەبارانت دەکەم و لەماڵی مندا جێت نابێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەزرەتی ئیبراهیم حورمەتی باوک و فرزەندی نەشکاند و بە پەرۆشەوە فەرمووی:

﴿قالَ: سَلٰامٌ عَلَيْكَ سَاَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبّي اِنَّهُ كٰانَ بي حَفِيّاً﴾.(١)

ئەی باوکە لە لایەن منەوە هیچ زەرەرت پێ ناگا و لە خواش داوا دەکەم عەزابت نەدا. خوا وەعدەی داوە بە من حورمەتم بگرێ و جوابی دوعام بداتەوە. ئنجا ئێوارەیەک حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ کۆمەڵێک لە خەڵکەکە ڕا وەستا بوو، چاوە ڕوانی هەل و فرسەتێک بوو، دەشی زانی کە خەڵکەکە هەر وەک بتپەرستن مانگ و ڕۆژ و ئەستێرەش دەپەرستن.

﴿فَلَمّٰا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأىٰ كَوكَباً قٰالَ هٰذٰا رَبّي﴾.(٢)

کە شەو داهات بۆ ئەوەی پێیان بسەلمێنی کە مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە بۆ پەرستن نابن، ڕوی کردە ئاسمان و ئیشارەی بۆ ئەستێرەیەک کرد و گوتی: ئەوە خوای منە.

﴿فَلَمّٰا اَفَلَ قٰالَ لاٰ اُحِبُّ الْآفِلِينَ﴾.(٢)

بەڵام کە ئەستێرەکە ئاوا بو گوتی هەر خۆشم ناوێ چ جایێکی بپەرستم، چونکە ئەوەی ئاوا بێ بۆ خوایەتی دەست نادا.

﴿فَلَمّٰا رَاَى الْقَمَرَ بٰازِغاً قٰالَ هٰذٰا رَبّي فَلَمّٰا اَفَلَ قٰالَ لَئِنْ لَمْ يَهْدِني رَبّي لَاَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضّٰالّينَ﴾.(٣)

بۆ شەوی دوایی کە مانگ دەرکەوت گوتی ئەوە خوای منە، بەڵام کە ئەویش ئاوا بوو گوتی مانگیش بۆ پەرستن نابێ ئەگەر خوا هیدایەتم نەدا منیش گومڕا دەبم.

﴿فَلَمّٰا رَاَى الشَّمْسَ بٰازِغَةً قٰالَ هٰذٰا رَبّي هٰذٰا اَكْبَرُ فَلَمّٰا اَفَلَتْ قٰالَ يٰا قَوْمِ اِنّي بَرِيءٌ مِمّٰا تُشْرِكُونَ﴾.(٤)

---

(١) مريم: ٤٧. (٢) و (٢) الأنعام: ٧٦. (٣) الأنعام: ٧٧.
(٤) الأنعام: ٧٨.

ئنجا بەیانی ڕۆژی سێیەم کە ڕۆژ دەرکەوت ڕوی کردە خەڵکەکە و ڕوی کردە ڕۆژ و گوتی: ئەوە خوای منە لە مانگ و ئەستێرەش گەورەترە بەڵام کە ئێوارە داهات و ڕۆژ ئاوا بوو گوتی ئەویش بۆ پەرستن نابێ. گوتی: خەڵکینە بە شاهید بن من بەریم لەو خوایانەکە ئێوە دەیان پەرستن.

﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمٰوٰاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفاً وَ مٰا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾.(١)

گوتی: من بۆ پەرستن ڕوو دەکەمە ئەو خوایە کە ئەرز و ئاسمانی دروست کردوە، من خۆم لە گۆمراهی دور دەخەمەوە و شەریک بۆ خوا پەیدا ناکەم. حەزرەتی ئیبراهیم شەو و ڕۆژ خەریکی ئامۆژگاری خەڵکەکە بوو، بەڵام هیچ فائیدەی نەبوو.

جا خەبەری تەبلیغاتی بڵاو بۆوە و نەمرود زانی و حەزرەتی ئیبراهیمیان بانگ کرد و نەمرود گوتی ئیبراهیم ئەو خوایە تۆی کردوە بە پێغەمبەر و خەڵک بانگ دەکەی بۆ پەرستنی کێیە و دەتوانی چ بکا؟ فەرمووی: خوای من ئەو کەسەیە خەڵک دەمرێنێ و زیندویان دەکاتەوە. نەمرود گوتی:

﴿أَنَا أُحْيِي وَ أُمِيتُ﴾.(١)

جا منیش دەتوانم خەڵک بمرێنم و زیندویان بکەمەوە، ئەمری کرد دوو پیاویان هێنان مەحکوم بە ئیعدام بوون. یەکێکیان کوشت و ئەوی دیان ئازاد کرد نەمرود گوتی: ئەوم مراند و ئەمیانم زیندو کردەوە، حەزرەتی ئیبراهیم هەرچەند دەیزانی جوابەکە ڕاست نیە بەڵام بۆ بۆڕدانی نەمرود فەرمووی:

﴿فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ﴾.(٢)

خوای من ئەو خوایەیە هەموو ڕۆژێک لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕۆژ دەبا بۆ ڕۆژئاوا، دە تۆش کە ڕاست دەکەی خوای لە ڕۆژئاواوە بیگێڕەوە بۆ ڕۆژهەڵات.

﴿فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ﴾.(٣)

نەمرود بۆڕی خوارد و سەری بەر دایەوە و قسەی نەکرد، حەزرەتی ئیبراهیم بە بێ

---

(١) الأنعام: ٧٩. (١) و (٢) و (٣) البقرة: ٢٥٨.

دەنگی هەستا چۆ دەرەوە، لەکات و دەرفەتێک دەگەڕا دەستێک بگەیەنێتە بوتەکان و بیان شکێنێ. تا ڕۆژێک ڕۆژی جەژنیان بوو لەو ڕۆژەدا هەموو خەڵک لە شار دەچوونە دەرەوە و لە جێژنگایەکەیان کۆ دەبونەوە، تا ئێوارە ڕایان دەبوارد و ئێوارە کە دەگەڕانەوە لە پێشدا دەچوونە بتخانە سوجدە و کوڕنۆشیان بۆ بتەکان دەبرد و سەر و پارویان لەو تەعامە دەخوارد کە بۆ متفەرِک بردبویانە بتخانە. لەکاتی ڕۆیشتندا بە حەزرەتی ئیبراهیمیان گوت وەرە با بچین بۆ جێژنگایەکەمان و بزانە دینی ئێمە چۆنە.

﴿فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي النُّجُومِ﴾.(١) ﴿فَقَالَ اِنِّي سَقِيمٌ﴾.(٢)

حەزرەتی ئیبراهیم تەماشای عیلمی ئەستێرە ناسی کرد و گوتی: من نەخۆشم ناتوانم لەگەڵتان بێم، جا چونکە زوربەی خەڵکەکە عیلمی ئەستێرەناسیان دەزانی و لە نەخۆشی زۆر دەترسان.

﴿فَتَوَلَّوْا عَنْهُ مُدْبِرِينَ﴾.(٣)

لێ دورکەوتنەوە و جێیان هێشت. حەزرەتی ئیبراهیم سوێندی خوارد و گوتی:

﴿وَ تَاللّٰهِ لَاَكِيدَنَّ اَصْنٰامَكُمْ بَعْدَ اَنْ تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ﴾.(٤)

قەسەم بە خوا دووا ڕۆیشتنتان دەچم هەموو بتەکان تێک دەشکێنم.

﴿فَرٰاغَ اِلىٰ آلِهَتِهِمْ فَقٰالَ اَلاٰ تَأْكُلُونَ﴾.(٥) ﴿مٰا لَكُمْ لاٰ تَنْطِقُونَ﴾.(٦)

دووا ڕۆیشتنی خەڵکەکە چۆ بتخانە و تەماشای کرد ئەنواعی بت و سەنەم لە بەرد و دار دروست کراون و لە هەموو جۆرە خواردەمەنی و میوەجاتێک لە بەردەمی بتەکان دانراوە، بەگاڵتەوە گوتی: ئەوە بۆ ناخۆن؟ بۆ قسە ناکەن؟

﴿فَجَعَلَهُمْ جُذٰاذاً اِلَّا كَبِيراً لَهُمْ لَعَلَّهُمْ اِلَيْهِ يَرْجِعُونَ﴾.(٧)

ئنجا بە مستەکۆڵە و پێلاقە دای گرتن، کە ماندو بوو تەورێکی هێنا و هەمووی تێک شکاندن، بتە گەورەکەیان نەبێ. لە پاشان تەورەکەی بە شانی بتە گەورەکەدا کرد و هاتە دەرێ گوتی جا با بێنەوە لە بتەکان بپرسن دا خوا کێ شکاندونی. ئێوارە کە گەڕانەوە لە

(١) الصّافّات: ٨٨. (٢) الصّافّات: ٨٩. (٣) الصّافّات: ٩٠.
(٤) الأنبياء: ٥٧. (٥) الصّافّات: ٩١. (٦) الصّافّات: ٩٢.
(٧) الأنبياء: ٥٨.

پێشدا چوونە بتخانە تەماشایان کرد بتەکانیان هەموو تێک شکاون بتە گەورەکەیان نەبێ، گوتیان:

﴿قالُوا مَنْ فَعَلَ هٰذا بِآلِهَتِنا اِنَّهُ لَمِنَ الظّالِمِينَ﴾.(١)

کەسێک وای لە خوایەکانمان کردوە زۆر زاڵمە دەبێ کێ ئەو بێ ئیحتیرامی یەی بە خۆمان و خوایەکانمان کردبێ؟

﴿قالُوا سَمِعْنا فَتىً يَذْكُرُهُمْ يُقالُ لَهُ اِبْراهِيمُ﴾.(٢)

بەعزێکیان گوتیان ئێمە بەیانی گوێمان لە کوڕێکی گەنج بوو پێی دەڵێن ئیبراهیم باسی خوایەکانمانی دەکرد و لۆمەی ئێمەی دەکرد کە دەیان پەرستین. بێ و نەبێ ئەوکوڕە ئەو کارەی کردوە.

﴿قالُوا فَأْتُوا بِهِ عَلىٰ اَعْيُنِ النّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ﴾.(٣)

نەمرود و پیاو ماقوڵەکان تووڕە بوون و گوتیان بچن ئەو کوڕە بێنن با لە پێش چاوی خەڵک دادگای بکەین و شاهیدی لە سەر بدەن و بە جەزای خۆی بگەیەنین.

﴿فَأَقْبَلُوا اِلَيْهِ يَزِفُّونَ﴾.(٤)

بە پەلە چوون هێنایان.

﴿قالُوا ءَاَنْتَ فَعَلْتَ هٰذا بِآلِهَتِنا يا اِبْراهِيمُ﴾.(٥)

نەمرود و حاکمەکان گوتیان ئەوە تۆ وات لە خوایەکانی ئێمە کردوە ئەی ئیبراهیم؟

﴿قالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هٰذا فَسْئَلُوهُمْ اِنْ كانُوا يَنْطِقُونَ﴾.(٦)

حەزرەتی ئیبراهیم زۆر بە ئارامی فەرمووی: من وام لێ نەکردون، بەڵکو ئەو بوتە گەورە وای لێ کردون. نەمرود و کافرەکان سەریان بەردایەوە و گوتیان:

﴿لَقَدْ عَلِمْتَ ما هٰؤُلاءِ يَنْطِقُونَ﴾.(٧)

تۆ گاڵتەمان پێ دەکەی دەنا دەزانی ئەو خوایانە قسە ناکەن زمانیان نیە، حەزرەتی ئیبراهیم گوتی: جا بۆ چی شتێک دەپەرستن کە هیچی بە دەست نیە ماڵ وێرانێنە، بۆ عاقڵ

---

(١) الأنبياء: ٥٩. (٢) الأنبياء: ٦٠. (٣) الأنبياء: ٦١.
(٤) الصّافّات: ٩٤. (٥) الأنبياء: ٦٢. (٦) الأنبياء: ٦٣.
(٧) الأنبياء: ٦٥.

نابن. ئنجا کە زانیان بە قسە و بەڵگە نای ویْرنێ گوتیان:

﴿قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانْصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ﴾.[١]

ئەگەر دەتان هەوێ یارمەتی خوایەکانمان بدەن ئیبراهیم بسووتێنن دەنا دەستیان لێ هەڵناگرێ. جا با لێرەدا خوا حافیزی لە حەزرەتی ئیبراهیم بکەین و تا مەجلیسی سبەینێ هەموو لایەک بە خوا دەسپێرین.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِياءِ وَالْمُرْسَلينَ.
وَالسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكاتُهُ.

---

(١) الأنبياء: ٦٨.

## ٢

# حەزرەتی ئیبراهیم

## باسی «حەزرەتی ئیبراهیم» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.

گوێ گرینە با بچینەوە سەر باسی بە سەرهاتی حەزرەتی ئیبراهیم.

﴿قٰالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيٰاناً فَاَلْقُوهُ فِى الْجَحِيمِ﴾.(١)

کاتێک حەزرەتی ئیبارهیمیان هێنا بۆ لای نەمرود بۆ سووتاندن هەموو ڕەئیان هاتە سەر ئەوە گوتیان: بینایەکی زۆر گەورە بکەین لە دارو بۆ پەند و عیبرەت ئیبراهیمی تێدا بسوتێنین. بە ئەمری نەمرود جاڕیاندا کە تەواوی خەڵک دەست بکەن بە بینا دروست کردن و دار کۆ کردنەوە، بە ماوەی چەند مانگ بینایێکی زۆر گەورەیان دروست کرد و داری زۆریان کۆ کردەوە، تەنانەت ژنی نەخۆش لە سەر خۆی نەزر دەکرد ئەگەر چاک وەبێ بچێ کۆڵە دارێک بێنێ بۆ مەنجەنیقی حەزرەتی ئیبراهیم. ژنی حامیلە دەیگوت: ئەگەر حەملەکەم کوڕ بێ شەرت بێ کۆڵە دارێک بێنم.

---

(١) الصّافّات: ٩٧.

ئنجا بە ئەمری نەمرود ڕۆژێک جارچی جاری‌دا تەواوی خەڵکی وولات کۆ بوونەوە و ئەو هەموو دارەیان لە ناو بیناکەدا لە لیژنە دا و ئاگریان تێ بەر دا و بڵێسەی دەچۆ ئاسمان. باڵدار نەی دەتوانی کیلۆمەترێک نیزیک وەبێ باڵی دەپرووزا. ویستیان حەزرەتی ئیبراهیم بخەنە ناو ئاگرەکە، بەڵام کەس لە توانایدا نەبوو لە ئاگرەکە نزیک بێتەوە، هاتن مەنجەنیق‌یان دروست کرد کە ئالەتێکی حەربیە. حەزرەتی ئیبراهیمیان لە سەر دانا و بە چەند نەفەر دەستیان لێ کێشا و هاویشتی‌یانە ناو ئاگرەکە. لەو کاتەدا خوای گەورە فەرمووی:ئەی مەلائیکە دەرگای حەوت تەبەقەی ئاسمان بکەنەوە تەماشا دۆستی من بکەن چۆنم داوەتە دەست دوژمن و خەریکە بی‌سووتێنێ. مەلائیکە دەستیان کرد بە گریان و قوڕ پێوان و بە سوجدەدا کەوتن و گوتیان: ئەی خوای گەورە خۆ خۆت زانا و عالمی لە سەر پشتی ئەرز هەر حەزرەتی ئیبراهیمە کە سوجدەت بۆ بەرێ و ئەویشت داوەتە دەست نەمرود بی‌سووتێنێ؟ خوا فەرمووی: ئەی جوبرەئیل لەگەڵ حەفتا هەزار مەلائیکە بچۆ سەر زەوی بۆ لای دۆستی من و داوای هەرچی کرد بێ‌دڵی مەکە و ئەگەر پەنای بۆ هێنای پەنای بدە، دەنا لێی‌ی گەڕێ. حەزرەتی جوبرەئیل هاتە لای حەزرەتی ئیبراهیم و گوتی: چی داوا دەکەی تا داوا بکەم؟ فەرمووی: هیچ کارم بە تۆ نیە کارم بەو خوایەیە کە کەون و کائیناتی بە دەستە. ئنجا کە هاویشتیانە ناو ئاگرەکە مەلائیکەی ئەرز و ئاسمان دەستیان کرد بە گریان و قوڕ پێوان. بەڵام خواوەندی گەورە لە هەموو کاتێکدا فریای دۆستی خۆی دەکەوێ.فەرمووی:

﴿قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَ سَلَاماً عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ﴾.(١)

ئەی ئاگر سارد وەبە و دۆستی من بە سەلامەتی ئاگاداری بکە. خوا ئەمری کرد بە حەزرەتی جوبرەئیل چوو لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم لە ناو ئاگرەکەدا دانیشت و بۆیان بوو بە باغ و باغاتێکی زۆر سەوز و جوان، ئەو پشکۆ سور و گەشانە بوون بە گەوهەر و دوڕ و مەرجان. ڕاوی دەڵێ: حەزرەتی جوبرەئیل زۆر بە سەرسامی تەماشا حەزرەتی ئیبراهیمی دەکرد. حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: یا جوبرەئیل بۆ وا تێم ڕاماوی؟ حەزرەتی جوبرەئیل

---

(١) الأنبياء: ٦٩.

فەرمووی: هەر چەند لە گەورەیی خوا سەرسامم، بەڵام سەبرگرتنی تۆ زیاتری سەرسام کردووم، کە لەو حاڵە ناخۆشەدا هاواری کەست نەکرد و پەنات بۆ خوا نەبێ بۆ کەس نەبرد. حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی:

«حَسْبِيَ اللهُ وَ نِعْمَ الْوَكِيلُ».

ئنجا خەڵکەکە تەماشایان کرد ئاگرەکە بۆتە باغ و باغات و حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ پیاوێکی سەر و سیما جوان لە ناو ئاگرەکەدا پیاسە دەکا سەرسام بوون و کۆمەڵێک بە دزی نەمرود ئیمانیان هێنا. یەکێ لەوان حەزرەتی (لوت)ی برازای حەزرەتی ئیبراهیم بوو. یەکی‌تر سارا خاتونی حەرەمی بوو، ڕاوی دەڵێ نەمرود کە وای چاو پێ کەوت ناردی بە شوێن حەزرەتی ئیبراهیمدا و لێ‌ی پرسی ئەوە کێ بوو لە ناو ئاگرەکەدا لە گەڵت بوو؟ فەرمووی: ئەوە حەزرەتی جوبرەئیل بوو خوا ناردبوی بۆ ئاگاداری من. نەمرود گوتی: بە ڕاستی خوایەکەت زۆر گەورەیە تازە بۆ خاتری ئەو هیچت لێ ناکەم.

ئنجا حەزرەتی ئیبراهیم عێڕاقی بە جێ هێشت و ڕۆیشت بۆ شام و لە شاری حەڕان نیشتەجێ بوو حەزرەتی لوت و سارا خاتون و چەند موسوڵمانیشی لە خزمەتدا بوون.

لە پاش ماوەیەک گرانی کەوتە وڵاتی شام و حەزرەتی ئیبراهیم لەوێش باری کرد و چوو بۆ میسر. ڕۆژێک پیاوێکی دوو زمان لای فیرعەون گوتی: پیاوێک هاتووە بۆ میسر ژنێکی پێیە تا ئێستا چاوی بنیادەمی میسری دافرەتی وا جوانی نەدیوە. فیرعەون ناردی بە دووا حەزرەتی ئیبراهیمدا و لێ‌ی پرسی ئەو ژنە چیتە لە گەڵتە؟ حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: خوشکمە «واتە لە دیندا» فیرعەون گوتی: دەبێ ئیمشۆ وەی ڕازێنی و بۆ منی بنێری، حەزرەتی ئیبراهیم زۆر بە غەمباری هەستاهاتەوە بۆلای سارا خاتوون کارەساتی بۆ گێڕایەوە و ئەو ژن و پیاوە موسوڵمان و غەریبە دەستیان کرد بە گریان و پاڕانەوە لە بەر خواو دوعایان دەکرد و دەیان گوت: ئەی خوای گەورە لە ئاگری نەمرود نەجاتت داین لە بەڵای فیرعەونیش بمان پارێزە. لەو کاتەدا پیاوەکانی فیرعەون هاتن بە زۆری سارا خاتوونیان برد بۆ بارەگای فیرعەون و لیباسی جوانیان لە بەر کرد و بردیان بۆ فیرعەون بەڵام خواوەندی گەورە بۆ ئەوەی ئەو ژن و مێردە دڵیان لێک نەگۆڕێ پەردەی لە بەیندا لا

بردن و چاویان لە یەکتر بوو شەو کە فیرعەون چۆ هۆدەی سارا خاتوون و تەماشای کرد ئافرەتی وا جوانی نەدیبوو بەڵام زۆر غەمبار و غەمگین و مەحزونی هاتە پێش چاو لە دڵی خۆیدا گوتی: خۆ تازە لە دەستم ناچێ، چۆوە دیوەکەی خۆیی و خەوی لێ کەوت، لە خەودا پێیان گوت: ئەو ئافرەتە مێردی هەیە، ئەگەر بەیانی بە سەلامەتی ئەو ژنە نەدەیەوە دەستی خاوەنی تەخت و بەختت لە دەست دەچێ، ئەو شەوە سێ جار وە خەبەر دەهات و دەنووستەوە و هەمان خەونی دەدی‌یەوە، بەیانی زوو پوڵ و پارەیەکی زۆر و چەند سەر مەڕ و ماڵات و حوشتری بۆ حەزرەتی ئیبراهیم نارد و جاریەێکیشی بە ناوی هاجەرە خاتوون دا بە سارا خاتوون بۆ خزمەت کردنی و داوای لێ بووردنی لێ کردن. ئەو خوایەی کە حەزرەتی ئیبراهیمی لە ئاگری نەمرود نەجات دا هەروەها لەدەست زوڵم و زۆر و عەیب و عاری فیرعەونیشی نەجاتدان. ئنجا لە میسریش باریان کرد و گەڕانەوە بۆ فەلەستین و جاکە لە دووا چەند ساڵ مەڕ و ماڵاتیان زۆر بوو حەزرەتی ئیبراهیم حەزرەتی لوتی نارد بۆ وەڵاتی ئەردەن و خۆی لە فەلەستین مایەوە، حەزرەتی ئیبراهیم لە سارا خاتوون هیچ ئەولادی نەبوو، زۆری پێ خۆش بوو خوا کوڕێکی ساڵحی بداتێ، دوعای کرد و فەرمووی:

﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ﴾.(١)

واتە ئەی خوای گەورە ئەولادی ساڵحم بدەیە و بێ بەشم مەکە، لەم لاشەوە سارا خاتووون بەینێک بوو لە حەزرەتی ئیبراهیم گەیشتبوو کە زۆری ئارەزوو هەیە خوا کوڕێکی بداتێ، دەشی زانی کە خۆی ئەولادی نابێ. ڕۆژێک بە حەزرەتی ئیبراهیمی گووت: خۆ تازە من ئەولادم نابن با تۆش وەجاخ کوێر نەبی وەرە هاجەرە مارە بکە و بەڵکو خوا کوڕێکت بداتێ، حەزرەتی ئیبراهیم هاجەرە خاتونی مارە کرد.

پاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و نۆ سەعات و نۆ دەقیقە و نۆ سانیە کوڕێکی بوو ناویان نا ئیسماعیل بەڵام لە پاش چەند ڕۆژ هەر وەکو عادەتی هەموو ژنێک وایە سارا خاتوون حەسوودی بە هاجەرە خاتوون برد و گوتی: ئەگەر هاجەرە بە خۆیی و منداڵکەیەوە

---

(١) الصّافّات: ١٠٠.

وولاتی فەلەستین بە جێ نەهێڵن خۆم دەکوژم. لەم لاشەوە حەزرەتی جوبرەئیل هات و وەحی بۆ هێنا کە هاجەرە خاتوون و ئیسماعیل لە وولاتی فەلەستین ڕا بەرێ بۆ خاکی حیجاز بەیانی زوو حەزرەتی ئیبراهیم کووندە ئاوێک و هەمانەیەک خورما و هاجەرە خاتوونی ژنی و ئیسماعیل کوڕێ هەڵگرت و بردنی تا ئەو جێگایەکە ئێستا ماڵی بەیتە. لە غەیبەوە بانگ کرا کە یا ئیبراهیم لەو جێگایە دایاننێ و بە جێیان بێڵە چوونکە ئەوە جێگای ماڵی بەیتە و جێ تەوافی موسوڵمانانە. حەزرەتی ئیبراهیم لەوێ دایناو بە بێ دەنگی گەڕایەوە، دایکی ئیسماعیل زۆری بانگ کرد و هاواری دەکرد و دەگریا و دەیگوت: ئەوە بۆ لەو چۆڵ و هۆڵە بە بێ کەسی بە جێمان دێڵێ؟ بۆ بەزەیت بەو دایک و فرزەندەدا نایەتەوە؟ حەزرەتی ئیبراهیم بە سواری حوشترەکە فرمێسکی وەک دوڕ و مرواری بە سەر ڕیشی موبارەکیدا هەڵدەوەراندن و بە دڵ وەک مەنجەڵ دەکوڵی و وەک سەماوەر دڵی هاتبۆ جۆش و ئاوڕی نەدەدایەوە تا ئاخری هاجەرە خاتوون چاکی کەواکەی گرت و گوتی: تو خوا ئەوە خوا ئەمری فەرمووە بە بێ کەسی بە جێمان بێڵی؟ فەرمووی: بەڵێ، ئنجا هاجەرە خاتوون بە چاوی پڕ لە گریانەوە گوتی: ئەگەر خوا ئەمری پێ کردوی خوا حافیزت بێ. لە کاتێکدا ئەو ژن و مێردە لێک جیا بوونەوە بە گریانەوە لێک وون بوون. حەزرەتی ئیبراهیم لە حوشترەکە دا بەزی ڕوی کردە ئاسمان و گوتی:

﴿رَبَّنَا اِنِّي اَسْكَنْتُ مِنْ ذُرِيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ﴾.(١)

ئەی خوای گەورە من ماڵ و منداڵی خۆم لەو شیوە بێ ئاو و سەوزە و زەراعەت لای ماڵی بەیت بە جێ هێشتووە.

﴿رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلٰوةَ﴾.(٢)

بۆ ئەوەی عیبادەتی خوا بکەن.

﴿فَاجْعَلْ اَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي اِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾.(٣)

ئەی خوای گەورە کۆمەڵێک ئادەمیزاد بنێرە بۆ لایان و رزقیان بدە ئومێد دەکەم

---

(١) و (٢) و (٣) ابراهیم: ٣٧.

شوکرانەی ناز و نیعمەتی تۆ بکەن، ئەو دووعایەی کرد و بۆ فەلەستین گەڕایەوە.

ئنجا لە پاش چەند ساڵ و چەند جار چوونی بۆ لای ئیسماعیلی کوڕی و دروست کردنی ماڵی بەیت ڕۆژێک دوعای کرد و گوتی: خوایە تا خۆم داوای مردن نەکەم نەمرم. ڕۆژێک لە ڕۆژان چاوەڕوانی میوانانی دەکرد. تەماشای کرد ئەوا بە گەرمای نیوەڕۆ پیاوێکی پیر بەرەو ماڵی حەزرەتی ئیبراهیم دێ. فەوری کەرێک و پیاوێکی نارد و چوو کابرا پیرەی هێنایە دیوەخانێ و زۆر بە خێر هاتنیان کرد، کاتێک نانیان بۆ دانا کابرا پیرە جاری وا بوو بۆ لوتی دەبرد. ئنجا دەیخستە دەمیەوە، حەزرەتی ئیبراهیم لێی پرسی ئەوە بۆ وا دەکەی و وا نان دەخۆی؟ میوانە پیرە گوتی: لە بەر پیریان، حەزرەتی ئیبراهیم گوتی: عومرت چەند ساڵە؟ پیرە گوتی: دو ساڵ لە تۆ بە عومرترم، حەزرەتی ئیبراهیم گوتی: بۆ کە دو ساڵی دی تێ پەڕی منیش وام لێ دێ؟ کابرا پیرە گوتی: بەڵێ. حەزرەتی ئیبراهیم دوعای کرد و گوتی: ئەی خوای گەورە داوا دەکەم کە پێش ئەوە وام لێ بێ گیانم بکێشە. کابرا پیرە هەستا و چۆ پێش حەزرەتی ئیبراهیم گوتی: دوعات گیرا بوو، من ئیزرائیلم بۆ گیان کێشانی تۆ هاتووم، ڕۆحی کێشا و وەفاتی کرد و لە عومری دوو سەد ساڵیدا بە ڕیوایەتێک لە عومری ١٧٥ یان ١٩٥ ساڵیدا وەفاتی کرد، لە لای سارا خاتونی ژنی لە شاری «حبرون» کە ئێستا پێی دەڵێن «مدينة الخليل» تەسلیم بە خاکیان کرد و ناژتیان.

جا موسوڵمانینە ئەگەر بیر لە باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە بکەینەوە دەتوانین هەزاران پەند و عیبرەتی لێ وەرگرین. هەر زاتێکی وەک حەزرەتی ئیبراهیم دەتوانێ بە تاقە سوارە لە ناو هەزاران کافر و زاڵمی وەک نەمرود ئەسپی خۆی لە مەیدانی دینداریدا لینگ بدا، هەر حەزرەتی ئیبراهیم دەتوانێ بۆ زوڵمی نەمرود خۆی ڕاگرێ و هاواری کەس نەکا، لە کاتێکدا حەزرەتی جوبرەئیل لە ناو ئاگرەکەدا چۆ لای و پێ گوت: چ دەڵێی دا بیکەم لە جوابدا گوتی: ئەوەندەم بەسە کە خوا ئاگای لە حاڵمە، هەر حەزرەتی ئیبراهیم دەتوانێ بۆ ڕەزا بوونی خوا دەست لە باوک و کەس کار هەڵگری و بچێ بۆ غەریبی و لەوێش لە بەرامبەر زوڵم و زۆری فیرعەوندا خۆی ڕاگرێ، هەر حەزرەتی ئیبراهیمە دەتوانێ هاجەرە خاتوونی ژنی و کۆرپە ساواکەی بۆ ڕەزا بوونی خوا

بەرێ لە چۆڵ و بیابان بە جێیان بێڵێ. هەر حەزرەتی ئیبراهیمە دەتوانێ لە بەر ڕەزای خوا کوڕی جگەرگۆشەی و بەری دڵی سەر ببڕێ و بیکا بە قوربانی، ئەگەر بە چاوی دڵ تەماشای ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی ئیبراهیم بکەین دەبێ ئیمانمان بە خوا پتەوتر بێ و سوجدەی شوکر بەرین و بە قەزا و قەدەر ڕازی بین و لە کاتی تەنگ و چەڵەمەدا خۆمان ڕاگرین و سابیر بین تا خواوەندی گەورە وەکو حەزرەتی ئیبراهیم لە هەموو بەڵاو موسیبەت و فیتنەی زاڵمان نەجاتمان بدا و ڕەحممان پێ بکا.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلٰى سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلٰى جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

٣

# حەزرەتی ئیبراهیم

## باسی «حەزرەتی ئیبراهیم» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ جَمیعِ الْأَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلِینَ.

لە دەرسەکانی پێشوودا گوتمان کە حەزرەتی ئیبراهیم لە میسر گەڕایەوە بۆ فەلەستین و بە قسەی سارا خاتوون هاجەرە خاتوونی مارە کرد و کوڕێکی جوانی بوو ناویان‌نا ئیسماعیل، لە پاشان سارا خاتوون زۆر ناڕەحەت بوو، داوای لە حەزرەتی ئیبراهیم کرد کە هاجەرە خاتوون بە خۆی و بە کۆرپەکەیەوە لە فەلەستین دوور بخاتەوە، حەزرەتی ئیبراهیمیش بە وەحی لە لایەن خواوە و بە قسەی سارا خاتوون، هاجەرە خاتوون و ئیسماعیلی کوڕی برد بۆ وڵاتی حیجاز و لەو جێگایە کە ئێستا ماڵی بەیت و «کعبة الله»یە بە جێی هێشتن و بۆ خۆی گەڕایەوە بۆفەلەستین. جا با لە مەجلیسی ئەوڕۆشماندا بە ئەدەب دانیشین و گۆی ڕاگرین بۆ باسی بە سەر هاتی حەزرەتی ئیسماعیل و بە دڵ پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

ڕاوی دەڵێ کە حەزرەتی ئیبراهیم گەڕایەوە بەرەو فەلەستین هاجەرە خاتوون وەدوای

کەوت و زۆری بانگ کرد. بەڵام حەزرەتی ئیبراهیم جوابی نەدایەوە تا هاجەرە خاتوون گوتی: ئەوە خوا ئەمری پێ کردووی من و ئەو کۆرپە ساوایە بێ کەس و بێ دەر لەو چۆڵ و هۆڵ و ئازەر قەهارە بە جێ بێڵی؟ لە کاتێکدا کە هەر دووکیان دەگریان حەزرەتی ئیبراهیم دڵی وەک مەنجەڵ دەکوڵی و فرمێسکی وەک دانەی مرواری بە سەر ڕیشی موبارەکی‌دا هەڵ دەوەراندن فەرمووی: بەڵێ بە ئەمری خوایە، هاجەرە خاتوون بە پەرۆشەوە گوتی ئەگەر خوا ئەمری پێ کردووی بڕۆ خوا حافیزی تۆش و ئێمەش بێ. هاجەرە خاتوون چوو کوڕەکەی لە سەر کۆشی دانا و بە مەحزونی دانیشت و دەستی کرد بە شیردانی کوڕەکەی و ڕوی کردە قاپی کەرەمی خوا.

تا ئاوی کوندەکە تەواو بوو هەر باش بوون، بەڵام زۆری پێ نەچوو خۆی و کوڕەکەی لە تینوان تینیان بۆ هات، تەنانەت وای لێ هات شیریشی لە مەمکا نەما. نە شیری تێدا مابوو بیدا بە کوڕەکەی، نە ئاو هەبوو لێوی پێ تەڕکا. زۆر غەمبار و ناڕەحەت بوو، چاوی بەرینانی نەدەدا لە کاتێکدا کوڕەکە لێوی وشک ببوون تەماشای بکا، لە تاوان هەستا و کوڕەکەی دانا و چوو بۆ سەر کێوی «سەفا» بۆ ئەوەی کەسێک ڕەچاوکا، یان چۆڕە ئاوێکی دەست کەوێ، بەڵام نە کەسی ڕەچاو کرد و نە ئاوی چاو پێ کەوت لە تاوی کوڕەکە ڕای کردەوە بۆ دۆڵەکە، دوبارە خۆی بۆ ڕانەگیرا و قەراری نەگرت چوو بۆ سەر کێوی «مەڕوە» لەوێش نە کەسی چاو پێ کەوت نە ئاوی دەست کەوت، هاتەوە بۆ لای کوڕەکە، تا حەوت جار هەر دەچۆ سەر کێوی سەفا و دەگەڕایەوە بۆ لای کوڕە کۆرپەکەی، دووبارە ڕای دەکردەوە بۆ سەر کێوی مەڕوە و دەگەڕایەوە، تا کەڕەتی ئاخری لە سەر کێوی مەڕوە دەستی کرد بە گریان و لە بەر خوا دەپاڕایەوە و دەی گوت: ئەی خوای گەورە، ئەو منداڵە جگەر گۆشەم قورگ و گەروی وشک بوو، نە شیرم تێدایە گەروی پێ تەڕ کەم نە ئاو دەست دەکەوێ، خۆ هیچ خواردەمەنیش نیە بیدەمێ، ئەی خوای گەورە ڕەحم بە حاڵی ئەو دایکە غەریب و بێ کەسە بکە، ڕەحم بە حاڵی ئەو تیفڵە ساوایە بکە، لە غەیبەوە گوێی لە دەنگێک بوو، بەڵام نەی دەزانی دەڵێ چی، دوبارە گوێی ڕاگرت و دەنگەکەی بیستەوە، لە تاوی کوڕەکەی ڕای کردەوە بۆ لای کە تەماشای کرد حەزرەتی جوبرائیل

شاباڵی لە نزیک حەزرەتی ئیسماعیل لە عەرزێ داوە و ئاو هەڵ دەقوڵێ، هاجەرە خاتوون کە ئەوەی دی لە خۆشیان وەخت بوو گەشکە بگرێ، چوو بە لاماری کوندەکەی دا و گورج پڕی کرد لە ئاو، ئنجا کوڕەکەی تێراو کرد و خۆی تێر و پڕی خواردەوە و بە ئاوەکەی گوت: زەمزەم واتە لە جێگای خۆت ڕاوەستە.

پێغەمبەر لە حەدیسدا فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لە دایکی حەزرەتی ئیسماعیل، ئەگەر نەیگوتایە زەمزەم تا ڕۆژی قیامەت دەبوو بە سەر چاوەیەک و جاری دەبوو، بەڵام لەو کاتەوە لە جێگای خۆی ڕاوەستاوە و لە بەری ناڕوا. لەو کاتەوە تا ڕۆژی قیامەت موسوڵمانان بە متفەڕک دەیخۆنەوە و شارە و شار دەی بەن.

ئنجا حەزرەتی جوبرائیل فەرمووی: ئەی هاجەرە خاتوون مەترسە و لێرە وەمێنە، ئاوەدانی دکەوێتەوە ئەو وولاتە و ئەو کوڕەی تۆ دەبێتە پێغەمبەر و لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیمی باوکی بە ئەمری خوا ئەو جێگایە دەکات بە ماڵی بەیت و «کعبة الله». زۆری پێ نەچوو کۆمەڵێک لە تائیفەی جورهەمیان بەنزیک وێدا دەڕۆیشتن، تەماشایان کرد تەیر و باڵندە لەو دەور و بەرە هات و چۆیان دەکرد و کۆ دەبوونەوە و دادەبارین. کاروانیەکان خۆبەخۆ گوتیان: خۆ تا ئێستا ئەو مەڵبەندە هیچ ئاوی لێ نەبوو، قاسیدێکیان نارد تەماشای کرد ئاوا ئافرەتێک بە خۆی و منداڵێکەوە لە سەر کانییەک دانیشتووە، کابرا بە پەلە گەڕایەوە موژدەی‌دا بە کاروانیەکان و خەڵکەکە هاتن بۆ لای هاجرە خاتوون و لێیان پرسی تۆ چ کەسی و لێرە چ دەکەی؟ هاجەرە خاتوون بە سەرهاتی خۆی و ئیسماعیلی کوڕی و پەیدا بوونی ئاوی زەمزەمی بۆ گێڕانەوە، خەڵکەکە زۆریان پێ خۆش بوو، گوتیان باشە ئەگەر ئیجازەمان بدەی ئێمە دێینە لات و ئاوەکەشمان بە ئیجارە بدەیە با تۆش شتێکت دەست کەوێ، هاجەرە خاتوون گوتی باشە، جورهەمیەکان هاتن و ئاوەدانیان کردەوە.

ئنجا حەزرەتی ئیسماعیل گەورە بوو، لە جورهەمیەکان فێری زمانی عەرەبی بوو، لە پاشان ژنی لێ خواستن و دوازدە کوڕی بوو، کە پێغەمبەری ئێمە دەچێتەوە سەر قیداری کوڕی. حەزرەتی ئیبراهیم لە فەلەستینەوە جار جار سەری لە هاجەرە خاتوون و ئیسماعیلی کوڕی دەدا و دەچوو بۆ لای، جارێک لە خەودا پێیان گوت دەبێ بەیانی زوو

ئیسماعیلی کوڕت سەر ببڕی و بیکەی بە قوربانی، خۆ دیارە خەونی پێغەمبەرانیش ڕاستە، ئەو ڕۆژە بەیانی زوو کە لە خەو هەستا گوریسێک و چەقۆیەکی هەڵگرت و ئیسماعیلی کوڕی بانگ کرد و گوتی وەرە با بڕۆین قوربانی بکەین! حەزرەتی ئیسماعیل وەدوا باوکی کەوت.

شەیتان خەبەری زانی چوو بۆ لای هاجەرە خاتوون و گوتی: تۆ نازانی ئیبراهیم خەیاڵی وایە بۆ خەونێکی بە درۆ ئیسماعیل سەر بڕێ؟ هاجەرە خاتوون گوتی: ئەگەر خوا ئەمری پێ کردبێ من ڕازیم. ئنجا شەیتان لە سێ جێگا هاتە سەر ڕێگای ئیسماعیل و گوتی: تۆ نازانی باوکت دەتبا سەرت ببڕێ و بتکا بە قوربانی؟ حەزرەتی ئیسماعیل گوتی: ئەگەر خوا ئەمری پێ کردبێ هەزار ڕوح و گیان بە قوربانی ڕەزای خوا دەکەم، شەیتانی ڕەجم کرد و بەردبارانی کرد، جا لەو کاتەوە ڕەجمی شەیتان بۆتە واجب لە سەر هەموو حاجی‌یەک لەو سێ جێگایە کە ئەو شەیتانی لێ ڕەجم کردووە، ئنجا کە گەیشتە «مینا» حەزرەتی ئیسماعیل لە باوکی پرسی ئەی باوکە ئەوە کوا حەیوانی قوربانیەکە؟ حەزرەتی ئیبراهیم بە گریانەوە و بە دڵی بریانەوە فەرمووی:

﴿يٰا بُنَيَّ اِنّي اَرىٰ فِي الْمَنٰامِ اِنّي اَذْبَحُكَ فَانْظُرْ مٰاذٰا تَرىٰ﴾.(١)

ئەی کوڕی خۆشەویستم لە خەودا پێیان گوتم تۆ بکەم بە قوربانی بزانم تۆ دەڵێی چی و بڕوانە بزانە چی دەبینی.

﴿قٰالَ يٰا اَبَتِ افْعَلْ مٰا تُؤْمَرُ سَتَجِدُني اِنْ شٰاءَ اللّٰهُ مِنَ الصّٰابِرينَ﴾.(٢)

گوتی: ئەی باوکە چیت ئەمر پێ کراوە بیکە و ڕامەوەستە، بە ئومێدی خوا من زۆر سابیر دەبم.

﴿فَلَمّٰا اَسْلَمٰا وَ تَلَّهُ لِلْجَبينِ﴾.(٣)

کاتێک ئەو باوک و فرزەندە تەسلیمی قەزا و قەدەر بوون و حەزرەتی ئیبراهیم حەزرەتی ئیسماعیلی لە عەرزیدا بۆ سەر بڕین. حەزرەتی ئیسماعیل فەرمووی: ئەی باوکە خۆت دەزانی ڕوح زۆر خۆشەویستە وەرە دەست و قاچم توند ببەستە با نەجوڵێم و

---

(١) و (٢) الصّافّات: ١٠٢. (٣) الصّافّات: ١٠٣.

له سەر ڕووان ڕامکێشە با چاومان لە چاوی یەکتر نەبێ و ڕەحم و میهرەبانی باوک و فرزەندیمان نەبزوێ و بێ ئەمری خوامان بێتە سەرێ، دووبارە فەرمووی: ئەی باوکە وەسیەت بێ کراسە خوێناویەکەم بۆ دایکم بەرەوە توو خوا با بۆنیەوەکا، چونکە هیچ کوڕی دیکەی نیە دڵی پێ خۆش کاو سەبووری پێ بێ، ئینجا لەکاتێکداکە فرمێسک وەک مرواری بە سەر ڕیشی موبارەکیدا هەڵدەوەرین و دڵی جۆشی گرتبوو دەست و قاچی حەزرەتی ئیسماعیلی بەست و ڕای کێشا و چەقۆی ئەڵماسی لە سەر قوڕگ و گەردەن دانا و ناوی خوای لێ هێنا و دەستی لێ کێشا، لەوکاتەدا مەلائیکەی ئەرز و ئاسمان دەستیان کرد بە گریان، دوعایان دەکرد و لە بەر خوا دەپارانەوە دەیان گوت: ئەی خوای گەورە ڕەحم بە حاڵی ئەو پیاوە پیرە بکە، ڕەحم بە حاڵی ئەو منداڵە بێ گوناحە بکە، ڕەحم بە حاڵی ئەو دایکە غەریب و بێ کەسە بکە، حەزرەتی ئیبراهیم بە هەموو تاقەتی خۆی دەستی لێ کێشا بەڵام بە قودرەتی خوا چەقۆی ئەڵماس مووی لار نەکردەوە. حەزرەتی ئیسماعیل فەرمووی: ئەی باوکە ڕەحمم پێ مەکە، نووکی چەقۆکە لە گەردەنم تووند بکە و باڵی پێوەنێ، لەوکاتەدا لە لایەن خواوە بانگ کرا:

﴿وَ نَادَيْنَاهُ اَنْ يَا اِبْرَاهِيمُ﴾.[1] ﴿قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا﴾.[2]

ئەی ئیبراهیم خەونەکەت ڕاست بوو ڕاستت گێڕا. دەست لە سەربڕینی حەزرەتی ئیسماعیل هەڵگرە.

حەزرەتی ئیبراهیم کە ئەو دەنگەی بیست سەری بەرز کردەوە تەماشای کرد حەزرەتی جوبرائیل هات و بەرانێکی هێنا و فەرمووی: خوا سەلامت لێ دەکا و دەفەرموێ: ئەو بەرانە سەر ببڕێ لە باتی حەزرەتی ئیسماعیل.

ئنجا ئەو باوک و فرزەندە ناو چاوانی یەکتریان ماچ کرد و بەرانەکەیان سەر بڕی و شوکرانەی خوایان کرد و بەرەو ماڵ گەڕانەوە و حەزرەتی ئیبراهیم گەڕایەوە بۆ فەلەستین لە پاش بەینێک هاجەرە خاتوون وەفاتی کرد. ئنجا خواوەندی گەورە حەزرەتی ئیسماعیلی کرد بە پێغەمبەر لە سەر جەرهەمیەکان و خەڵکی حیجاز، هەر وەکو خوا لە قورئاندا باسی ئەوە دەکاکە حەزرەتی ئیسماعیل پێغەمبەر بووە و دەفەرموێ:

---

(١) الصّافّات: ١٠٤. (٢) الصّافّات: ١٠٥.

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ اِسْمَاعِيلَ اِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَبِيّاً﴾.(١)

واتە ئەی پێغەمبەر بە هۆی قورئانەوە باسی حەزرەتی ئیسماعیل بۆ ئوممەتەکەت بکە کە چەند پێغەمبەرێکی ڕاست بووە و قەت خیلافی وەعدەی نەکردوە، هەر بەڵێنێکی دابێ بردویەتی‌یە سەر، ماوەیەکی زۆر ئەو باوک و فرزەندە لێک دوور بوون ئەم لە حیجاز و ئەو لە فەلەستین بەڵام جار جار دەچوو سەری لە حەزرەتی ئیسماعیل دەدا. جارێک حەزرەتی جوبرەئیل هات بۆ لای حەزرەتی ئیبراهیم و فەرمووی: خواوەندی گەورە سەلامت لێ دەکا و دەفەرمووێ: بچێ لەو جێگایە کە ئێستا ماڵی بەیتە خانوویەک دروست بکەن لەگەڵ حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی، بۆ ئەوی خەڵک زیارەتی بکەن و عیبادەتی خوای تێدا بکرێ.

حەزرەتی ئیبراهیم هەستا چوو بۆ حیجاز و بە حەزرەتی ئیسماعیل شاد بۆوە و یەکتریان ماچ کردو و فەرمووی: ئەی ئیسماعیل ئەوکەڕەتە بۆ کارێکی زۆر گرنگ هاتووم دەبێ یارمەتیم بدەی، حەزرەتی ئیسماعیل فەرمووی: ئەی باوکی خۆشەویست چی ئەمر دەکەی ئامادەم، ئنجا حەزرەتی جوبرەئیل هات ئەو جێگایە کە ئێستا ماڵی بەیتە بۆی دەست نیشان کردن، هەروەکو خوا لە قورئاندا دەفەرمووی:

﴿وَ اِذْ بَوَّأْنَا لِاِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ﴾.(٢)

کاتێک جێگای ماڵی بەیتمان بۆ حەزرەتی ئیبراهیم دیاری کرد دەستیان کرد بە دروست کردنی، حەزرەتی ئیبراهیم بوو بە وەستا و حەزرەتی ئیسماعیل بوو بە شاگردی.

﴿وَ اِذْ يَرْفَعُ اِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَ اِسْمَاعِيلُ﴾.(٣)

لە کاتێکدا حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیسماعیل دیواریان بەرز کردەوە و ماڵی بەیتیان تەواو کرد گوتیان:

﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا اِنَّكَ اَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾.(٤)

ئەی خوای گەورە ئەوەی فەرمووت کردمان، لێمان وەرگرە، ئنجا لە لایەن خواوە گوترا.

---

(١) مريم: ٥٤. (٢) الحج: ٢٦. (٣) و (٤) البقرة: ١٢٧.

﴿وَ اَذِّنْ فِی النّاسِ بِالْحَجِّ﴾.(١)

ئەی ئیبراهیم خەڵک بانگ بکە با بێن بۆ حەج و زیارەت و تەوافی ئەو بەیتە، حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: ئەی خوای گەورە جا چۆن دەنگی من بە گوێی خەڵک ڕادەگا؟ خوا فەرمووی:

﴿یَأْتُوكَ رِجٰالاً وَ عَلیٰ كُلِّ ضٰامِرٍ یَأْتینَ مِنْ كُلِّ فِجٍّ عَمیقٍ﴾.(٢)

ئەی ئیبراهیم تۆ بانگ بکە و من دەنگەکەی تۆ بە گوێی خەڵک ڕادەگەیەنم، ئەگەر لە زگی دایکیان دابن، یان لە پشتی باوکیاندا، یان لە سەر دنیا بن، حەزرەتی ئیبراهیم بانگی کرد و فەرمووی: ئەی ڕوحانیەتی هەموو ئادەمیزادان خوای گەورە ماڵی «کعبة الله»ی بو ئێوە دروست کردوە وەرن حەج بکەن. جا ئەوەی خوا حەجی بە نەسیب کردبێ ڕوحانیەتی جوابی داوەتەوە لە هەموو گۆشە و کەناری جیهاندا بە پیادە و بە سوواری دەچێ حەج دەکا.

ئنجا حەزرەتی ئیبراهیم خوا حافیزی لە حەزرەتی ئیسماعیل کرد و گەڕایەوە بۆ فەلەستین. حەزرەتی ئیسماعیلیش ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد تا لە تەمەنی سەت و سی و حەوت ساڵیدا وەفاتی کرد و لە نزیک ماڵی بەیت نێژراوە.

موسوڵمانینە باسی حەزرەتی ئیسماعیلیشمان لێرەدا تەواو بوو ئومێد دەکەم پەند و ئامۆژگاریتان لێ وەرگرتبێ.

وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلینَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَیْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(١) و (٢) الحج: ٢٧.

# حەزرەتی ئیسحاق

## باسی «حەزرەتی ئیسحاق» سەلامی خودای لە سەر بێ

بسم الله الرحمن الرحيم

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.

گۆێ ڕاگرن بۆ باسی لە دایک بوون و ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی ئیسحاق پێغەمبەر و پەند و ئامۆژگاری لێ وەر گرین.

لە ئامۆژگاری پێشوماندا گوتمان: کە حەزرەتی ئیبراهیم «خلیل‌الله» خوا حافیزی لە هاجەرە خاتوون و حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی کرد و گەڕایەوە بۆ فەلەستین با ئەوەش زانین کە حەزرەتی ئیبراهیم عادەتی وا بوو، قەت بە تەنێ نانی نەخواردووە و زۆر نان بدە بووە، واڕێکەوت کە بە ڕیوایەتێک پازدە ڕۆژ و بە قەولێک حەوت شەو و حەوت ڕۆژ میوانی نەهاتن، زۆر نارەحەت بوو، ڕۆژیک لە ڕۆژان لە ماڵ هاتبۆ دەرەوە چاوەڕوانی میوانانی دەکرد، کە ڕوانی ئەوا کۆمەڵێک میوان بەرەو ماڵی ئەوان دێن، زۆر پێ خۆشحاڵ بوو، لە دوورەوە بە پیلیانەوە چوو،زۆری بەخێر هاتن کردن و وەپێشیان کەوت بۆ ماڵەوە و لە میوان‌خانەکەدا دانیشتن، جا ئەوەیە کە خواوەندی گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەی «هود»دا ئەو باسەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووی:

﴿وَ لَقَدْ جٰاءَتْ رُسُلُنٰا اِبْرٰاهِيمَ بِالْبُشْرىٰ قٰالُوا سَلٰاماً قٰالَ سَلٰامٌ﴾.(١)

واتە بە ڕاستی ڕەسول و فرستادەکانی ئێمە چوون بوون بە میوانی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ موژدە پێدانی و سەلامیان کرد و حەزرەتی ئیبراهیم زۆر بە جوانی جوابی سەلامەکەی وانی دایەوە و زۆر بە خێرهاتنی کردن و زۆری پێ خۆش بوو، چونکە چەند ڕۆژ بوو نانی نەخواردبوو، لە لایەکی تریشەوە تا ئەو ڕۆژە میوانی وا جوان و نەجیب و بە ئەدەبی نەهاتبوون. هەستا چوو بۆ حەرەم سەرا و ئەمری کرد گوێرەکەیەکی قەڵەویان سەر بڕی و برژاندیان و فەرمووی: چونکە تا ئێستا میوانی وام نەهاتوون دەبێ هەر خۆم خزمەتیان بکەم.

﴿فَمٰا لَبِثَ اَنْ جٰاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾.(٢)

زۆری نەخایاند حەزرەتی ئیبراهیم هاتەوە سفرەی ڕاخست و گۆشتی گوێرەکەی برژاوی هێنا و لە پێش میوانەکانی دانا و گوتی: فەرموون نان بخۆن و خۆشی لە بەر خۆیەوە دەستی کرد بە نان خواردن، کە سەری بەرز کردەوە.

﴿فَلَمّٰا رَأىٰ اَيْدِيَهُمْ لٰا تَصِلُ اِلَيْهِ﴾.(٣)

تەماشای کرد میوانەکانی بێ دەنگ دانیشتوون و نان ناخۆن.

﴿نَكِرَهُمْ وَ اَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً﴾.(٤)

زۆری پێ ناخۆش بوو ترسێکی زۆری ڕێنیشت، چونکە ئەو زەمانە عادەت وا بوو میوان بچووبایە بۆ هەر ماڵێک و نانی نەخواردایە ئەوە مەعنای وایە فکری دەرحەق بە خێزانی ئەو ماڵە خەرابە، حەزرەتی ئیبراهیم گوتی: ئەوە بۆ نان ناخۆن؟ گوتیان: ئێمە بە بی بەها ـ واتە بە بێ ئەوەی قیمەتی نانەکە بدەین ـ نای خۆین. حەزرەتی ئیبراهیم گوتی: باشە پارەکە بدەن گوتیان: نرخی ئەو نان و خوانە چی یە و چەندە؟ فەرمووی «بسم الله» کردنە لە پێش دەست پێ کردندا و «الحمدلله» گوتنە لە پاش لێ بوونەوەدا. میوانەکان گوتیان: بە ڕاستی شایانی ئەوەی کە خوا بە دۆستی ناو بردووی و ناوی ناوی «خلیل‌الله» ئنجا زانیان کە حەزرەتی ئیبراهیم زۆر دەترسێ گوتیان:

﴿قٰالُوا لٰا تَخَفْ اِنّٰا اُرْسِلْنٰا اِلىٰ قَوْمِ لُوطٍ﴾.(٥)

---

(١) و (٢) هود: ٦٩. (٣) و (٤) و (٥) هود: ٧٠.

یا ئیبراهیم هیچ مەترسە ئێمە مەلائیکەی خواین دەچین قەومی حەزرەتی لوت بە هیلاک دەبەین، خواوەندی گەورە ئەمری پێ کردین و فەرمووی: ئەی مەلائیکەینە ئەوە حەوت شەو و ڕۆژە حەزرەتی ئیبراهیم بە ڕۆژووە و نانی نەخواردووە، چونکە میوانی نەچوون، ئێوە بچن و ببنە میوانی بەڵکو ڕۆژووەکەی بشکێنێ و موژدەشی بدەنێ بە خۆی و خێزانی کە کوڕێکیان دەبێ ناوی ئیسحاق دەبێ و ئەویش کوڕێکی دەبێ ناوی یەعقوب دەبێ و زوربەی پێغەمبەران لە ئەولادی ئەوان دەبن..

﴿فَبَشَّرْنٰاهٰا بِاسْحٰاقَ وَ مِنْ وَرٰاءِ اِسْحٰاقَ يَعْقُوبَ﴾.(١)

هەروەکو قورئان دەفەرمووی: ئێمە موژدەمان دا بە سارا خاتوون و حەزرەتی ئیبراهیم کە کوڕێکیان دەبێ بە ناوی ئیسحاق و کوڕەزایەکیان دەبێ بە ناوی یعقوب.

لە کاتی ئەو گفتوگۆیەشدا سارا خاتوون لە پشت دەرگا خۆی گرتبوو ڕاوەستا بوو، کەزانی ئەوان مەلائیکەی مژدەی کوڕو کوڕەزایان بۆ هێناوە و فکریان خەراپ نیە وەکو قورئان بۆمان باس دەکا و دەفەرموێ:

﴿وَامْرَاَتُهُ قٰائِمَةٌ فَضَحِكَتْ﴾.(٢)

سارا خاتوونی خێزانی ڕاوەستا بوو کە زانی پیاو خەراپ نین و مژدەی واشیان پێیە دەستی کرد بە پێکەنین.

﴿قٰالَتْ يٰا وَيْلَتىٰ اَاَلِدُ وَ اَنَا عَجُوزٌ وَ هٰذٰا بَعْلي شَيْخاً اِنَّ هٰذٰا لَشَىءٌ عَجِيبٌ﴾.(٣)

و لە دەمی خۆی ڕاکێشا و گوتی: ئەیاڕۆ جا چۆن من تازە منداڵم دەبێ، من بوومە پیرەژن و مێردەکەشم ئەوەتا بۆتە پیرە پیاو، بە ڕاستی زۆر قسەیەکی عەجائب دەکەن کە دەڵێن تۆ لە عومری نەوەدساڵیدا و ئیبراهیم لە عومری سەد ساڵیدا منداڵتان دەبێ.

﴿قٰالُوا اَتَعْجَبِينَ مِنْ اَمْرِ اللّٰهِ رَحْمَتُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ عَلَيْكُمْ اَهْلَ الْبَيْتِ اِنَّهُ حَمِيدٌ مَجِيدٌ﴾.(٤)

مەلائیکەتەکان گوتیان: ئایا ئێوە ئەی سارا خاتوون لاتان عەجایبە کە لەو سینن و ساڵەدا منداڵتان ببێ بە ئەمری خوا؟ نازانن کە خواوەندی گەورە هەموو کارێکی لە دەست

---

(١) و (٢) هود: ٧١. (٣) هود: ٧٢. (٤) هود: ٧٣.

دێ؟ بە تایبەتی ئەی ئەهل و بەیتی ئیبراهیم ئەوە بەرەکەت و ڕەحمەتێکە خوا لەگەڵ ئێوەدا دەیکا بۆ ئەوەی ستایشی بکەن.

ئنجا مەلائیکەتەکان هەستان خوا حافیزیان کرد و ڕۆیشتن. ئەو شەوە نوتفەی حەزرەتی ئیسحاق لە ڕەحەمی دایکیدا قەراری گرت و لە پاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و نۆ دەقیقە و نۆ سانیە حەزرەتی ئیسحاق بەوەلەدبوو. وردە وردە گەورە بوو، خواوەندی گەورە کردی بە پێغەمبەر بۆ بانگ کردنی خەڵکی شام و دەستی کرد ە ئامۆژگاری خەڵک. خواوەندی گەورە لە سورەی «الصَّافَّات»دا دەفەرمووێ:

﴿وَ بَشَّرْنٰاهُ بِإِسْحٰاقَ نَبِيّاً مِنَ الصّٰالِحِينَ﴾.[1]

واتە ئێمە بە هۆی مەلائیکەتانەوە مژدەماندا بە حەزرەتی ئیبراهیم کە سارا خاتوون کوڕێکی دەبێ و دەیکەینە پێغەمبەر و زۆر صاڵح دەبێ.

جا ئەوا وەفامان بە وەعدە کرد و کردمان بە پێغەمبەر بۆ سەر خەڵکی شام.

حەزرەتی ئیبراهیم زۆری پێ ناخۆش بوو کە حەزرەتی ئیسحاقی کوڕی ژن لە کەنعانیان بخوازێ، چونکە دەیزانی زۆر لە خوا نەترسن. ڕۆژێک ئەمینداریکی هەبوو بانگی کرد و فەرمووی: دەبێ بچی بۆ عێراق و کچی بتوئیلی برام بۆ ئیسحاق بخوازی، ئەویش لەگەڵ چەند کەسدا هاتن بۆ عێراق و ڕەفقەتی کچی بتوئیلیان بۆ خواست و هێنایان بۆ فەلەستین، لەوکاتەدا سارا خاتوونی دایکی وەفاتی کردبوو، لە پاش تازیە تەواو بوون ڕەفقەتیان لێ مارە کرد و بە قودرەتی خوا تا بیست ساڵ هیچ منداڵیان نەبوو، ئنجا لە پاش بیست ساڵ ڕەفقەتی خێزانی حامیلە بوو دوو کوڕی بە زگێک بوون، یەکێکیان ناو نا عەیس و ئەوی تریان ناو نا یەعقوب کە بە ئومێدی خوا لە کۆڕ و مەجلیسەکانی داهاتوودا بۆتان بەیان دەکەم کە زوربەی پێغەمبەرەکان لە ئەولادی حەزرەتی ئیسحاق و حەزرەتی یەعقوبی کوڕنی.

حەزرەتی ئیسحاق لە دوا دەردی سەری و نارەحەتی زۆر وکوێر بوون لە تەمەنی سەد و هەشتا ساڵیدا وەفاتی کرد و گۆڕی موبارەکی لە فەلەستین لە «خلیل الرحمن»ە لای مەرقەدی حەزرەتی ئیبراهیمی باوکی.

---

(١) الصَّافَّات: ١١٢.

پەند و ئامۆژگاری لە باسی بەسەرهات و لە دایک بوون و ژیانی حەزرەتی ئیسحاق و حەزرەتی ئیسماعیل لەوەدایە کە دەبێ ئینسانی موسوڵمان قەت لە ڕەحمەتی خوا نائومێد نەبێ، دایکی حەزرەتی ئیسحاق لە تەمەنی نەوەد ساڵیدا و باوکیشی حەزرەتی ئیبراهیم لە تەمەنی سەد و چەند ساڵیدا بوون کە خواوەندی گەورە حەزرەتی ئیسحاقی پێ بەخشین.

هەروەها لە بەسەرهاتی حەزرەتی ئیسماعیلیشدا کوڕ دەبێ وەک حەزرەتی ئیسماعیل بۆ فەرمانی باوکی گوێ ڕایەڵ بێ، تەنانەت ڕۆح وگیانی خۆشی بە قسەی باوک لەگرە و نێ و دڵی نەشکێنی. باوکیش وەک حەزرەتی ئیبراهیم دەبێ کە بۆ ڕەزا بوونی خوا جگەرگۆشە و بەری دڵی کە حەزرەتی ئیسماعیل بوو کردە قوربانی، ڕازی بوو نەمرود بی‌سووتێنێ و دەست لە بانگ کردنی خەڵکەکە هەڵ نەگرێ. هەر لە بەر ڕەزای خوا بوو تووشی غەریبی و دەربەدەری بوو، ڕوو خۆش بوو، سەخی بوو، میوان گر بوو خواوەندی گەورە لە هەموو کات و لە هەموو تەنگ و چەڵەمەیەک رزگاری کرد.

ئەگەر ئێمەش چاو لەو پیاوە گەورانە بکەین و پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین، ئومێد دەکەم خوا لە دنیا و قیامەت سەربەرزمانکا و لە بەڵا و موسیبەت لامان دا.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# حەزرەتی لوت

## باسی «حەزرەتی لوت» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.

گوێگرینە ئەوە باسی ژیان و بەسەرهاتی لوتی پێغەمبەرە ئومێد دەکەم پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری باش و بە نرخی لێ وەرگرن خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿لَقَدْ كٰانَ في قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِى الْأَلْبٰابِ﴾.(١)

لە باسی گێڕانەوەی ژیانی پێغەمبەراندا پەند و ئامۆژگاری زۆر هەیە بۆ کەسێک خاوەن بیر و هۆش بێ. لە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی ئیبراهیمی «خليل‌الله»داگوتمان: ئیبراهیم چوو بۆ میسر حەزرەتی لوتی برازای لە خزمەتدا بوو، ئیمانی بە حەزرەتی ئیبراهیم هێنا بوو، لە گەڕانەوەشدا بۆ فەلەستین هەر لە خزمەتیدا گەڕایەوە.

ڕاوی دەڵێ لە پاش چەند ساڵ [illegible] مام و برازایە دەوڵەمەند بوون و مەڕ و ماڵاتیان زۆر بوو، وای لێ هات بەسەر یەکەوە نەدەحەوانەوە، زۆر جار شووانەکانیان بە شەڕ دەهاتن لە

---

(١) یوسف: ١١١.

سەر مۆڵە مەڕو دەراوە مەڕوو لەوەڕگا، تا ڕۆژێک حەزرەتی ئیبراهیم حەزرەتی لوتی برازای بانگ کرد و فەرووی: وام پێ باشە مەڕو و ماڵاتەکەمان لێک دوور کەوێتەوە، جا خۆت سەرپشک بە کۆی بە باش دەزانی بچۆ بۆوێ، حەزرەتی لوت ووڵاتی ئەردەنی ئێستای هەڵبژاردو و ماڵی بار کرد و چوو بۆ شاری سدوم. لەو زەمانەدا ووڵاتی ئەردەن بریتی بوو لە پێنج شار کە پێیان دەگوتن: موئتەفیکات خەڵکی ئەو شارانە تا بڵێی کافر و بێ دین و بەد ئەخلاق و دزو و ڕو گرژ و خوا نەناس بوون، خەیانەتیان لەگەڵ برای خۆشیاندا دەکرد، زۆر بێ حورمەت بوون، ئەگەر غەوارەیەک، غەریبەیەک ڕێگای بکەوتایە ناویان خەراپەیان لەگەڵ دەکرد و هەتیوباز بوون، خواوەندی گەورە بە هۆی حەزرەتی جوبرەئیلەوە وەحی نارد بۆ حەزرەتی لوت و کردی بە پێغەمبەر و دەستی کرد بە بانگ کردنی خەڵک بۆ خواپەرستی و دوورکەوتنەوە لە خەراپە، هەر وەکو لە سورەی «الشعراء»دا خوا بۆمان باس دەکا و دەفەرمووێ: حەزرەتی لوت فەرمووی:

﴿اِنّي لَكُمْ رَسُولٌ اَمينٌ﴾.(١)

ئەی خەڵکینە بە ڕاستی من فرستادەی خوام بۆ سەر ئێوە و خەیانەتتان لەگەڵ ناکەم و ئەمینم.

﴿فَاتَّقُوا اللّٰهَ وَ اَطيعُونِ﴾.(٢)

لە خوا بترسێنن و بە قسەم بکەن و لە قسەم دەر مەچن.

﴿وَ ما اَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ اَجْرٍ﴾.(٣)

لە بەرامبەر ئەو بانگ کردن و پێڕاگەیاندنەشدا داوای هیچتان لێ ناکەم.

﴿اِنْ اَجْرِيَ اِلّا عَلىٰ رَبِّ الْعالَمينَ﴾.(٤)

پاداشتی بانگەوازی من هەر لە سەر خوایە و خوا پاداشتم دەداتەوە.

﴿اَتَأْتُونَ الذُّكْرانَ مِنَ الْعالَمينَ﴾.(٥)

بەڵام خەڵکەکە ئەوەندە لە ئینسانیەت و ئەدەب و ویقار و حورمەت دوور بوون و دور کەوتبوونەوە، نەک هەر جوابیان نەدایەوە بەڵکو بە تووڕەییەوە گوتیان:

---

(١) الشعراء: ١٦٢. (٢) الشعراء: ١٦٣. (٣) و (٤) الشعراء: ١٦٤.
(٥) الشعراء: ١٦٥.

﴿قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا لُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِينَ﴾.(١)

ئەگەر دەست لەو قسانە هەڵنەگری و چیدی لە سەری بڕۆی لەو وولاتە دەرت دەکەین. حەزرەتی لوت زۆر بە ئیمانەوە فەرمووی:

﴿قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُمْ مِنَ الْقَالِينَ﴾.(٢)

من لە هەڕەشەی ئێوە ناترسم و کردەوەی ئێوەم زۆر پێ ناخۆشە و لە کۆڵتان نابمەوە و تا ماوم ئامۆژگاریتان دەکەم. بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خەڵکەکە بێ دینتر و بەد ئەخلاقتر دەبوون و بە ئاشکرا خەراپەیان زیاتر دەکرد. بەو هەموو پەند و ئامۆژگاری‌یەی حەزرەتی لوت چەند کەسێک نەبێ موسوڵمان نەبوون. تەنانەت ژنەکەی ئیمانی نەهێنا.

حەزرەتی لوت کە زانی دەست لە کاری فاحیشە هەڵناگرن دووعای کرد و لە بەر خوا پاڕایەوە و فەرمووی: ئەی خوای گەورە خۆت زانا و عالمی تا من ئاموژگاریان زیاتر بکەم و زیاتر بیان ترسێنم ئەوان کافرتر و بێ شەرمتر دەبن، فەرمووی: ئەی خوایە دووعام گیرا بکەی عەزابیان بۆ نازڵ بکەی. خواوەندی گەورە دووعای گیرا کرد و ئەمری کرد بە حەزرەتی جوبرەئیل لەگەڵ چەند مەلائیکە بچن میوانی حەزرەتی ئیبراهیم بن و مژدەی بدەنێ کە سارا خاتوون کوڕی دەبێ و لەوێرا بچن قەومی لوت بە هیلاک بەرن، ئەوە بوو کە لە باسی حەزرەتی ئیبراهیمدا تا ئەو جێگایە باسمان کرد کە حەزرەتی ئیبراهیم نەی ناسین تا خۆیان ئاشکرا کرد و مژدەیاندا بە سارا خاتوون کە کوڕیان دەبێ.

﴿قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُوا أَهْلِ هٰذِهِ الْقَرْيَةِ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ﴾.(٣)

گوتیان: دەچین قەومی لوت بە هیلاک دەبەین. حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: ئاخر لوتی برازام و چەند موسوڵمانیان لە ناودان ئەوانیش تووشی عەزاب و غەزەب دەبن. حەزرەتی جوبرەئیل فەرمووی:

﴿يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هٰذَا إِنَّهُ قَدْ جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَ إِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ﴾.(٤)

---

(١) الشعراء: ١٦٧. (٢) الشعراء: ١٦٨. (٣) العنكبوت: ٣١.
(٤) هود: ٧٦.

ئەی ئیبراهیمی(خلیل‌الله) واز لەو قسانە بێنە، تازە خوا ئەمری کردوە بە عەزابدانیان و ڕەدبوونەوەی نیە، دووبارە حەزرەتی ئیبراهیم خۆی ڕا نەگرت و فەرمووی:

﴿قٰالَ اِنَّ فیهٰا لُوطاً﴾.(١)

ئاخر لوت بە خۆی و بە موسوڵمانەکان لە ناویاندان.

﴿قٰالُوا نَحْنُ اَعْلَمُ بِمَنْ فیهٰا لَنُنَجِّیَنَّهُ اِلَّا امْرَاَتَهُ کٰانَتْ مِنَ الْغٰابِرینَ﴾.(٢)

مەلائیکەتەکان گوتیان: ئێمە باشتر دەزانین وولاتی ئەردەن چەند موسوڵمانی لێن. حەزرەتی لوت و موسوڵمانەکان و منداڵەکانی‌یان نەجات دەدەین، ژنەکەی نەبێ کە تووشی عەزاب دەبێ.

ئنجا مەلائیکەتەکان خوا حافیزیان کرد و بەرەو وولاتی ئەردەن کەوتنە ڕێ. هەر وەکو خوای گەورە لە سورەی «هود»دا دەفەرمووێ:

﴿وَ لَمّٰا اَنْ جٰاءَتْ رُسُلُنٰا لُوطاً سیءَ بِهِمْ وَ ضٰاقَ بِهِمْ ذَرْعاً﴾.(٣)

لە کاتێکدا فرستادەکانی ئێمە چوون بوونە میوانی حەزرەتی لوت زۆری بەخێرهاتن کردن. بەڵام زۆر دڵ تەنگ و غەمبار بوو. لەوە دەترسان خەڵکەکە بزانن و بەرۆکیان بگرن و ناڕەحەتیان بکەن.

﴿وَ قٰالَ هٰذٰا یَوْمٌ عَصیبٌ﴾.(٤)

لە دڵی خۆیدا گوتی: دیارە ئەڕۆ ڕۆژێکی زۆر ڕوو بە شەڕە. زۆری نەخایاند ژنەکەی بە دزیەوە بە خەڵکەکەی ڕاگەیاند کە چەند کوڕی گەنجی قۆزیان میوانن.

﴿وَ جٰاءَهُ قَوْمُهُ یُهْرَعُونَ اِلَیْهِ﴾.(٥)

کە خەبەریان زانی بە ڕاکردن هاتن بۆ بەر دەرگای ماڵی حەزرەتی لوت و داوای میوانەکانیان کرد.

﴿قٰالَ یٰا قَوْمِ هٰؤُلٰاءِ بَنٰاتی هُنَّ اَطْهَرُ لَکُمْ فَاتَّقُوا اللّٰهَ وَ لٰا تُخْزُونِ فی ضَیْفی اَلَیْسَ مِنْکُمْ رَجُلٌ رَشیدٌ﴾.(٦)

---

(١) و (٢) العنکبوت: ٣٢. (٣) العنکبوت: ٣٣. (٤) هود: ٧٧.
(٥) و (٦) هود: ٧٨.

حەزرەتی لوت بە تووڕەییەوە ڕووی کردە گەورەکانیان و گوتی: بۆ خاتری خوا حەیاتان بێ، شەرم بکەن، قسەی وا مەکەن، وەرن کە تا ئێستا کچەکانم دەقابیل ئێوە نەدەدین مارەیان بکەن و دەست لە کاری فاحیشە هەڵگرن و ئابڕوم مەبەن، ئەوە پیاوێکی ئاقڵتان تێدا نیە یارمەتیم بدا؟

﴿قالُوا لَقَدْ عَلِمْتَ ما لَنا في بَناتِكَ مِنْ حَقٍّ وَ اِنَّكَ لَتَعْلَمُ ما نُريدُ﴾.(١)

خەڵکەکە هەر وازیان نەهێنا و گوتیان: تۆ دەزانی کە کارمان بە کچەکانت نیە و دەزانی داوای چی دەکەین، حەزرەتی لوت زۆر ناڕەحەت بوو، دەستی کرد بە گریان و ڕووی کردە میوانەکان و گوتی:

﴿قالَ لَوْ اَنَّ لي بِكُمْ قُوَّةً اَوْ آوي اِلىٰ رُكْنٍ شَديدٍ﴾.(٢)

ئەگەر لە ئێوەم ڕابدیایە و بمزانیایە دەستە و کەر دەکەن و دەست دەکەنەوە بە گژ ئەو خەڵکدا دەچووم، بەڵام وا دیارە ئێوە ناتوانن شەڕ بکەن، پەنا دەگرم بە خوا لە شەڕی ئەو کافرانە و خوا بمان پارێزێ.

ئنجا مەلائیکەتەکان کە زانیان خەڵکەکە زۆر بێ حەیان و واز ناهێنن و حەزرەتی لوتیش زۆر ناڕەحەتە و دەستی لێ هەڵناگرن و خەریکن دەرگایماڵی حەزرەتی لوت بشکێنن و بچنە ژورەوە. حەزرەتی جوبرەئیل ئیجازەی عەزابی لە خوای گەورە وەرگرت و باڵی لێک دان و هەموویان کوێر بوون و سەرگەردان بوون و نەیاندەزانی ڕوو لە کۆی کەن. هەروەکو خوای گەورە لە سورەی «القمر»دا دەفەرمووێ:

﴿وَ لَقَدْ راوَدُوهُ عَنْ ضَيْفِهِ فَطَمَسْنا اَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذابي وَ نُذُرِ﴾.(٣)

کاتێک کافرەکان ویستیان خەراپە لەگەڵ میوانەکانی دا بکەن کوێرمان کردن و گوتمان: دە عەزابی خوا بچێژن. بەڵام چونکە خوای گەورە بە تەواوی غەزەبی لێ گرتبون لەو حاڵەشدا دەیان گوت بە ڕاستی میوانەکانی لوت زۆر ساحیرن و بە سیحر ئێمەیان کوێر کردووە و سەر دەر ناکەین.

﴿قالُوا يا لُوطُ اِنّا رُسُلُ رَبِّكَ لَنْ يَصِلُوا اِلَيْكَ﴾.(٤)

(١) هود: ٧٩. (٢) هود: ٨٠. (٣) القمر: ٣٧.
(٤) هود: ٨١.

خۆیان ئاشکرا کرد و گوتیان مەترسە ئێمە بەشەر نین مەلائیکەی خوا و فرستادەی خواین، هاتووین تۆ رزگار بکەین لە دەست ئەو قەومە و نەهێڵین دەستیان بگاتە تۆ و ئەزیەتت بدەن. حەزرەتی لوت کە زانی مەلائیکەن و خوا دوعاکەی گیرا کردووە وەک گوڵێکی سیس گەشایەوە و گوتی: دە بە قوربانتان بم هەر ئێستا بە هیلاکیان بەرن هەتا زووە.

حەزرەتی جوبرەئیل فەرمووی:

﴿فَاَسْرِ بِاَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِنَ اللَّيْلِ وَ لٰا يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ اَحَدٌ اِلَّا امْرَاَتَكَ اِنَّهُ مُصيبُهٰا مٰا اَصٰابَهُمْ اِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ اَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَريبٍ﴾.(١)

تۆ شەوی بمێنیّ خۆت و منداڵەکانت و موسوڵمانەکان لە شار بچنە دەرەوە و ئاوڕ مەدەنەوە، بەڵام ژنەکەت مەبە لەگەڵ خۆت چونکە عەزابەکە ئەویش دەگرێتەوە، هەروەها فەرمووی: پەلە مەکە چونکە کاتی عەزابیان دیاری کراوە بەری بەیانیە، ئایا بەیانی نزیک نیە؟

﴿فَلَمّٰا جٰاءَ اَمْرُنٰا جَعَلْنٰا عٰالِيَهٰا سٰافِلَهٰا﴾.(٢)

خوای گەورە دەفەرمویّ: لە کاتێکدا ئەمرمان کرد بە مەلائیکەتان بۆ بە هیلاک دانی قەومی لوت و وێران کردنی شارەکانیان، مەلائیکە لە بەری بەیانیدا لە شەقەی باڵانیان دا و ئەو شارانەیان بە خانوو بەرەو گیان لەبەرەوە بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و سەرە و بنیان کردنەوە و خاپوریان کردن.

﴿وَ اَمْطَرْنٰا عَلَيْهٰا حِجٰارَةً مِنْ سِجّيلٍ مَنْضُودٍ﴾.(٣) ﴿مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ﴾.(٤)

خوا دەفەرمویّ: ئەوەی لە ناو شارەکانیشدا نەبوو بەرد لە دوای بەرد بە سەرماندا باراندن و سەنگبارانمان کردن بە بەردی ڕەشی نیشانە کراو بۆ پەند و عیبرەت، تا یەک نەفەریان نەما و مردن.

﴿وَ مٰا هِيَ مِنَ الظّٰالِمينَ بِبَعيدٍ﴾.(٥)

ئەو جۆرە عەزابدانە لە لایەن خواوە دوور نیە بۆ ئەوکەسانەی زوڵم بکەن و زاڵم بن.

---

(١) هود: ٨١. (٢) و (٣) هود: ٨٢. (٤) و (٥) هود: ٨٣.

ڕاوی دەڵێ چوارسەد هەزار لەو پێنج شارەدا بەو غەزەبە بە هیلاک چوون و ئێستا جێگای ئەو پێنج شارە بۆتە بەحر و پێی دەڵێن «البحر المیت» ئنجا حەزرەتی لوت لە پاش ماوەیک وەفاتی کرد و گۆڕی موبارەکی لە فەلەستینە.

ئەوە بوو باسی حەزرەتی لوتی کوڕی هاڕانی برازای حەزرەتی ئیبراهیم و بە هیلاک چوونی قەومەکەی. ئومێد دەکەم پەند و عیبرەتی لێ وەرگرن و وەک حەزرەتی لوت ڕێز و حورمەت لە میوان بگرن و خۆتان لە هەموو جۆرە خەراپەیەک بپارێزن. تا وەکو قەومی حەزرەتی لوت و موسوڵمانەکان بتان پارێزێ لە غەزەبی خۆی.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# حەزرەتی یەعقوب

## باسی «حەزرەتی یەعقوب» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلَى جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.**

براکانم ئەوە باسی حەزرەتی «یەعقوب»ی پێغەمبەرە، با بە دڵ پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

ئەو زاتە موبارەکە کوڕی حەزرەتی «ئیسحاق»ی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم «خلیل‌الله»یە. دایکیشی ناوی «رەفقەت»ی کچی «بتوئیل»ی کوڕی «ناحور»ی برای حەزرەتی ئیبراهیمە. حەزرەتی «ئیسحاق»ی پێغەمبەر کە «رەفقەت»ی مارە کرد لە پاش بیست ساڵ ژن و مێردی خوای تەعالا بە سکێک دوو ئەولادی دانێ. ئەو ڕیوایەتەی کە ئێستا سەبارەت بەو دوو کوڕە بۆتان دەگێڕمەوە و هەرچەند لەوانە نیە ڕاست بێ، بەڵام ئەگەر واش بێ بۆ قودرەتی خوا هەر کەمە و دور نیە.

دەڵێن کاتێک دایکی حەزرەتی یەعقوب کەوتە ژان و منداڵ بوون دوو منداڵی لە

سگ‌دا بوو، ئەو دوو کۆرپە لە سکی دایکیاندا لێیان بوو بە شەڕ یەعقوب ویستی لە پێش عەیس‌دا لە دایک بێ و بێتە سەر دنیا، بەڵام عەیس سوێندی خوارد و گوتی: ئەگەر تۆ لە پێش مندا ببی من لە سگی دایکمدا دەمێنمەوە تا دایکم دەمرێ. یەعقوب خۆی دواخست و عەیس لە پیشدا بوو. دەڵێن: هە لە بەر ئەوەیە بە عەیس دەڵێن عەیس چونکە عیسیانی کردوٚ بە یەعقوب دەڵێن یەعقوب چونکە لە عەقەب واتە لە دووایە هاتە دەرەوە. حەزرەتی ئیسحاق عومری شێست ساڵ بوو کە خوا ئەو دوو کورەی دانێ. کاتێک ئەو دوو کوڕە بە دایک و باب گەورە بوون. حەزرەتی ئیسحاق عەیسی خۆشتر دەویست و دایکیشیان یەعقوبی خۆشتر دەویست عەیس دەستی کرد بە ڕاو کردن و هەمیشە هە ڕاوی دەکرد. ڕۆژێک حەزرەتی ئیسحاق «عەیس»ی کوڕی بانگ کرد و فەرمووی: ئەی کوڕی خۆشەویستم ئیمڕۆ زۆرم ئارەزوو لە گۆشتی حەیوانە بچۆ بۆ ڕاو کەباێکم بۆ بکە تا لە پاداشتیدا ئەو دوعایەت بۆ بکەم کە باوکم بۆ منی کرد لە کاتی خۆیدا. عەیس دەستی دایە تیر و کەوان و ڕۆیشت بۆ ڕاو، «ڕەفقەت»ی دایکیان چونکە یەعقوبی خۆشتر دەویست، کە ئاگای لەو گفتووگۆیە بوو لە دوا ڕۆیشتنی عەیسی کوڕی ڕای کردە دەرەوە بە یەعقوبی گوت: هەستە گورج حەیوانێک سەر ببڕە کەبابێکی زۆر نایاب بکە و بیهێنە خزمەتی با ئەو دوعایە کە با پیرت بۆ باوکتی کردوە باوکیشت بۆ تۆی بکا. حەزرەتی یەعقوب بە قسەی دایکی هەستا چوو حەیوانێکی سەربڕی و گۆشتەکەی برژاند و هێنای لە پێش باوکی دانا و باوکی دەستی کرد بە خواردنی و لە بەر خوا پاڕایەوە و فەرمووی: ئەی خوای گەورە داوا دەکەم کە لە ئەولادی ئەو کوڕەم چەند پێغەمبەر و پاشای بە ناو بانگ پیدا ببن و دنیا پڕ بکەن لە دادگەری و عەداڵەت و خواپەرستی بڵاو بکەنەوە لە سەر زەوی. ئێوارە کە عەیس هاتەوە حەیوانە کێوێیکی کوشتبوو گۆشتی برژاند و هێنای بۆ خزمەت باوکی. حەزرەتی ئیسحاق زانی کە ڕەفقەتی دایکی فێڵی لە عەیس کردوە و دوعاکەی کە قەرار وا بوو بۆ عەیسی بکا بۆ یەعقوبی کرد. ڕووی کردە عەیس و فەرمووی: ناڕەحەت مەبە دوعات بۆ دەکەم کە ئەولادی تۆ لە دنیادا لە هەموو کەس زۆرتر بن. بەڵام عەیس زۆر ناڕەحەت بوو ڕەقی هەستا و گوتی: دەبێ ڕۆژێک یەعقوب هەر بکوژم.

لەم لاوە رەفقەتی دایکیان شەو و رۆژ خەوی لێ نەدەکەوت و لەوە دترسا رۆژێک عەیس یەعقوب بکوژێ، خۆی ڕانەگرت یەعقوبی بانگ کرد و گوتی زۆر حەز دەکەم سەفەرێکی لای خاڵت بکەی و ماوەیەک لە عێراق وەمێنی بەڵکو عەیسی براشت ئەو رق و غەزەب و غەرەزەی لە دڵدا نەمێنێ بۆ بەیانی یەعقوب چۆ خزمەت باوکی و عەرزی کرد قوربان هاتووم بۆ شکایەت لە دست عەیسی برام، چونکە لەوکاتەوە تۆ دووعات بۆ کردووم هەڕەشەم لێ دەکا و دەڵێ دەتکوژم. حەزرەتی ئیسحاق زۆر نارەحەت بوو، زۆری پێ ناخۆ بوو کە دوو برا برایە تیان بگاتە ئەو ڕادە و بەینیان ئەوەندە ناخۆش بێ خەیاڵی کوشتنی یەکتر بکەن. هەناسێکی دوور و درێژی هەڵکێشا و پشوی خواردەوە و دەستی کرد بەگریان و فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم وەکو دەمبینی من تازە پەکم کەوتووە، مووی ڕەشم لە سەر و ڕیشدا نەماوە، پشتم دوولا هاتۆتەوە، تاقەتم لێ بڕاوە، شەو و ڕۆژ چاوەڕوانی مردن دەکەم بێتە میوانم، ئەگەر برایەکەت زوڵمت لێ بکا یان بت کوژێ من هیچ دەسەڵاتێکم نیە، کوڕ و خزم و کەس و کاری ژنەکەی زۆرن، دوویارە لە تۆش بە تاقەتترە و تۆ نای وێرییی، وای بە مەسڵەحەت و چاک دەزانم بە دزی براکەت بڕۆی بۆ عیراق بۆ ماڵی «لابان»ی خاڵت و ماوەیەک لای وەمێنی و کچێکیشی لێ بخوازی، ئومێد دەکەم ئەگەر بە قسەم بکەی لە براکەت سەرکەوتووتر بی و خۆش گوزەرانتر بی و خوا ئاگاداریت بکا.

نەسیحەت و ئامۆژگاری‌یەکەی باوکی کاری کردە سەر بیر و هەستی و زۆر دڵی پێ خۆش بوو، هەستا خوا حافیزی لە باوک و دایکی کرد و بەرەو عێراق بە تاقی تەنێ کەوتە ڕێ، لە ڕێگادا تووشی زۆر شیو و دۆڵ و هەوراز و نشێو و بەرزی و نزمی و ڕێگای سەرە و ژێرو سەرە و ژوور بوو لە زۆر جێگا ڕێگای لێ هەڵە دەبوو، شەو ڕەوی زۆر کرد و هەر بەو بۆنەش ناو برا بە ئیسرائیل واتە شەوڕۆ، چونکە تا ئەو سەفەرەی نەکرد کەس بە شەو بە ڕێگادا نەدەڕۆیشت، ئێستاش بە ئەولادەکانی دەڵێن «بەنی ئیسرائیل» واتە کوڕی یەعقوبی شەوڕۆ، زۆر کاتی واش دەبوو ڕادەوەستا و دەیگوت: دەڵێم وەگەڕێم، بەڵام کە بیری لە قسەکانی باوکی و ئامۆژگاری‌یەکانی دەکردەوە دەستی دەکردەوە بە ڕۆیشتن. ڕۆژێک زۆر

ماندو ببوو ویستی تاوێک وەحەسێ و ئیسراحەت بکا، پاڵیدا بە بەردێکەوە و سەری وە بەردێک کرد و خەوی لێ کەوت، لە خەویدا خەونێکی زۆر خۆشی دی، لە خەوەکەیدا پەیژەیەک لە ژوور سەریەوە نەسب کرابوو بۆ ئاسمان و پەیتا پەیتا مەلائیکە هات و چۆیان پێدا دەکرد. هەروەها لە خەوەکەیدا خوای تەعالا وەحی کرد بۆ لای و فەرمووی: ئەی یەعقوب من خوای تۆ و باب و باپیری تۆ و ئیبراهیم و ئیسحاق و هەموو کەون کائناتم، موژدە بێ ئەو وولاتە پیرۆزە کە بریتیە لە وولاتی کەنعان واتە فەلەستین دەبێتە ملکی تۆ و ئەولادی تۆ و پیت و بەرەکەت دەخەمە ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانی تۆ و ئەولادەکانتەوە. لە خەو هەستە و بە ئاسودەیی برۆ بۆ سەفەرەکەت من ئاگاداریت دەکەم و بە مراد و ئارەزووی خۆت دەگەی، یەعقوب کە لە خەوەکەی خەبەری بۆوە و وەخەبەر هات شادە و ئیمانێکی بە حەقی هێنا و بە دڵی پڕ لە خۆشی و شادیەوە کەوتەرێ، تا گەیشتە خاکی عێراق و چوو بۆ شاری «فدارام» تووشی هەرکەسێک دەبوو لێی دەپرسی و دەیگوت: ئەرێ «لابان»ی کوڕێ «بتوئیل» دەناسی؟ لە جوابدا دەیان گوت: کێ هەیە لابان نەناسێ، ئنجا گوتی: بە خێری خۆتان ماڵی لابانم نیشان بدەن، گوتیان: ئەوە «راحیل»ی کچی لابانە بەرەو ئێرە دێ. یەعقوب کە تەماشای کرد تا ئەو کاتە ئافرەتی وا جوان و شۆخ و شەنگ و رێک و پێکی نەدیبوو، دڵی کەوتە خەیاڵ و خەتەرەوە و زمانی لاڵ بوو لە خۆشیان، چوو بۆ لای راحیل و وگوتی: دەزانی من و تۆ خزمێکی زۆر نزیکین؟ من «یەعقوب»ی کوڕی حەزرەتی ئیسحاقم و دایکیشم کچی باپیری تۆیە. راحیل زۆری بە خێر هاتن کرد و لە گەڵی چۆوە بۆ ماڵی خۆیان و یەعقوب خۆی بە خاڵی ناساند و ئەو خاڵ و خوارزایە بە یەکتر شاد بوون و یەکتریان ماچ کرد. ئنجا یەعقوب بە تەواوی بە سەر هاتی خۆی و هۆی هاتنی بۆ لای خاڵی گێڕایەوە و گوتی: بە تایبەتی باوکم فەرموویەتی: دەبێ کچی خاڵت بخوازی و ئێستاش دەبێ ڕاحیلم لێ مارە بکەی، خاڵی گوتی: باشە بەو شەرتە حەوت ساڵ شوانیم بۆ بکەی. یەعقوب حەوت ساڵی شوانی بۆ خاڵی کرد و کە حەوت ساڵە تەواو بوو خاڵی لە جیاتی راحیل «لیای» کچە گەورەی لێ مارە کرد و بۆمی ڕازاندەوە و دەپاڵی کرد، بەیانی زوو یەعقوب چوو بۆ لای خاڵی و ناڕەزایی خۆی دەربڕی

و گوتی: من داخوازی ڕاحیلم کرد کە چی تۆ لیات دەپاڵ کردوم! خاڵی گوتی: ئاخر لە شەریعەتی ئێمەدا دروست نیە تا خوشکی گەورە لەوێ بێ خوشکی بچوک مارە بکرێ و شو بکا. بەڵام ئەگەر هەر پەلپ و بیانووش دەگری حەوت ساڵی دیش شوانیم بۆ بکە تا ڕاحیلیشت لێ مارە کەم، لە شەریعەتی ئێمەدا دروستە دوو خوشک بە سەرێکەوە ببنە ژنی پیاوێک. سەرو نەهێشێنم حەوت ساڵی دیشی شوانی بۆ خاڵی کرد و ڕاحیلیشی لێ مارە کرد و دووجاریەشی دا بە دوو کچەکانی بۆ قەرەواشی و خزمەت کردنیان، ئەوانیش هەر دوو جاریەکەیان بە یەعقوبی مێردیان بەخشی و یەعقوب بوو بە خاوەنی چوار ژن. لە پاش بیست ساڵ مانەوە لای خاڵی و دووا ئەوەی کە بوو بە خاوەنی چوار ژن و یازدە کوڕ، ڕۆژێک یەعقوب غوربەتی هەستا و یادی دایک و باوک و وەتەنی کردەوە و داوای لە خاڵی کرد ئیزنی بدا بڕواتەوە بۆ فەلەستین و خاڵی ئیجازەی دا.

ڕاوی دەڵێ بە ژن و منداڵ و سەروەت و سامان وەرێ کەوت بۆ فەلەستین و خواحافیزی لە خاڵی و خەڵکی «فدارام» کرد. کاتێک لە فەلەستین نزیک بوونەوە، یەعقوب تەماشای کرد کۆمەڵێک سوارە وە دیار کەوتن، کە سەرنجی دانێ عەیسی برای ناسیەوە، یەعقوب بە کوڕ و پیاو و شوانەکانی گوت: ئەگەر ئەو سوارانە لێیان پرسیین ئەو مەڕو ماڵاتە ئی کێیە؟ بڵێن ئی یەعقوبی غوڵامی عەیسی کوڕی حەزرەتی ئیسحاقە. سوارەکان پرسیان کرد و ئەوانیش وایان جواب دایەوە عەیس کە ناوی یەعقوبی بیست فرمێسکی بە چاواندا هاتنە خوارێ و گوتی یەعقوب غوڵام نیە برای منە و لە ڕوحم خۆشەویسترە.

کە یەکتریان ناسیەوە باوەشیان بە یەکترداکردو و یەکتریان ماچ کرد و پێک شاد بوونەوە و بە خۆشی و شادی چوونە خزمەت حەزرەتی ئیسحاقی باوکیان و ڕەفقەتی دایکیان. لە پاش بیست ساڵ لێک دوور کەوتنەوە ئەو باوک و دایک و فرزەندە بە یەک شاد بوونەوە. ئنجا خواوەندی گەورە حەزرەتی یەعقوبی کرد بە پێغەمبەر و لە ڕاحیلی دایکی حەزرەتی یوسف و بونیامینی بوو، حەزرەتی یەعقوب بوو بە باوکی دوازدە کوڕ و لە دواییدا بە هۆی کوڕەکانیەوە تووشی زۆر خەفەت و ناڕەحەتی و کوێر بوون و کوێرە وەری بوو، کە لە باسی

حەزرەتی یوسفی کوڕیدا انشاءالله باسی دەکەین.

جا لە ئاخری عومری‌دا چوو بۆ میسر و لەوێ لە عومری سەد و شێصت ساڵیدا وەفاتی کرد و حەزرەتی یوسف جەنازەی باوکی هێنایەوە بۆ فەلەستین و لە خەلیلی رەحمان لە خزمەت حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیسحاق بە خاکیان سپارد.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

## ١

# حەزرەتی یوسف

## باسی «حەزرەتی یوسف» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلِینَ.

جوانترین چیرۆک باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی یوسفی کوڕی حەزرەتی یەعقوبی کوڕی حەزرەتی ئیسحاقی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمی «خلیل‌الله»یە.

ڕاوی دەڵێ ڕۆژێک حەوت جوولەکە لەگەڵ حەزرەتی عومەردا کەوتنە گفتوگۆو گوتیان «تەوڕات» لە «قوڕئان» گەورەترە چونکە تەوڕات باسی حەزرەتی یوسفی تێدایە بەڵام تا ئێستا قوڕئانی ئێوە باسی نەکردوە. حەزرەتی عومەر جوابی پێ نەدرایەوە هات بۆ لای پێغەمبەر و گفتوگۆیەکەی گێڕایەوە. پێغەمبەر تۆزێک ڕاما و زۆری نەخایاند حەزرەتی جوبرەئیل هات و سورەی حەزرەتی یوسفی بە خەڵات بۆ پێغەمبەر هێنا و خوا فەرمووی:

﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَیْكَ اَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمٰا اَوْحَیْنٰا اِلَیْكَ هٰذٰا الْقُرْآنَ وَ اِنْ كُنْتَ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الْغٰافِلِینَ﴾.[١]

---

(١) یوسف: ٣.

ئەی پێغەمبەر ئێمە جوانترین چیرۆک کە باسی مێژو و ژیانی بە سەرهاتی حەزرەتی یوسفە بۆت دەگێڕینەوە هەرچەند تا ئێستا تۆ ئەو باسەت بە خەیاڵیشدا نەهاتووە و نەت بیستووە. لە باسی حەزرەتی یەعقوبدا بۆم باس کردن کە حەزرەتی یەعقوب دوو ژن و دو جاری‌یەی هەبوون، لەو چوار ئافرەتە دوازدە کوڕی بوو، لە ڕاحیلی کچی خاڵی دوو کوڕی بوون بە ناوی یوسف و بونیامین. حەزرەتی یەعقوب یوسفی لە هەموو کوڕەکانی خۆشتر دەویست. حەزرەتی یوسف ئەوەندە جوان بوو کە دەتوانین لە باسی جوانی ئەودا بڵێین ئەوهتی دنیا دنیایە و دایک منداڵی دەبێ جوانی وا نەهاتۆتە سەر دنیا و هیچ دایکێک کۆریەی وای بە باوەشەوە نەگرتووە. دەڵێن: ئەوەندە جوان بوو ڕۆژێک تەماشا ئاوێنەی کرد و بە خۆی گوت: ئەگەر تۆ عەبد و بەندە بویتایە بە کەس نەدەکرای. بۆ شەوێ خەونی دی و بەیانی زوو هاتە خزمەت باوکی و خەونەکەی بۆ گێڕایەوە، وەکو قورئان دەفەرمووێ:

﴿إِذْ قٰالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يٰا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَباً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سٰاجِدِينَ﴾.(١)

یوسف چۆ خزمەت باوکی و عەرزی کرد ئەی باوکە خوا وە خێری بگێڕێ لە خەومدا یازدە ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ هاتن سوجدەیان بۆ بردم، حەزرەتی یەعقوب یان بە وەحی، یان بە فەراسەت زانی کە ئەو خەونە گەورەیی یوسف دەگەیێنێ و خوا دەیکا بە پێغەمبەر.

﴿قٰالَ يٰا بُنَيَّ لٰا تَقْصُصْ رُؤْيٰاكَ عَلىٰ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا لَكَ كَيْداً﴾.(٢)

فەرمووی: ئەی کوڕی بچکۆلە و شیرین و نازدار و خۆشەویستم ئەو خەونە بۆ براکانت مەگێڕەوە مەبادا حەسودیت پێ بەرن و بەڵایەکت بە سەر بێنن.

﴿إِنَّ الشَّيْطٰانَ لِلْإِنْسٰانِ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾.(٣)

چونکە بە ڕاستی شەیتان دوژمنێکی زۆر ئاشکرایە بۆ ئینسان و دەترسم بە سەهویان بەری.

﴿وَ كَذٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَ يُعَلِّمُكَ مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحٰادِيثِ﴾.(٤)

---

(١) یوسف: ٤. (٣) و (٣) یوسف: ٥. (٤) یوسف: ٦.

فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم هەر وەک خوا ئەو خەونەی نیشانداوی و گەورەیی تۆ دەگەیێنێ، هەروەهاش خوا فێری عیلمی لیک دانەوەی خەونانت دەکا.

﴿وَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَ عَلىٰ آلِ يَعْقُوبَ كَمٰا اَتَمَّهٰا عَلىٰ اَبَوَيْكَ مِنْ قَبْلُ اِبْراهِيمَ وَ اِسْحٰاقَ اِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾.(١)

خوا ناز و نیعمەتی زۆر بە سەر تۆدا دەرژێنێ و دەتکا بە پێغەمبەر، هەروەها براکانیشت دەکا بە پێغەمبەر، هەروەک لە پێش تۆدا ڕژاندی بە سەر باوکە گەورەکانی تۆدا کە حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیسحاق بوون، فەرمووی: ڕۆڵە بە ڕاستی خوا زانایە و ئیش لە جێگای خۆیدا دەکا. ئنجا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ براکانی بۆیان دەردەکەوت کە باوکیان یوسفی لەوان خۆشتر دەوێ، ڕۆژێک هەر دە براکە کۆ بوونەوە و گوتیان:

﴿اِذْ قٰالُوا لَيُوسُفُ وَ اَخُوهُ اَحَبُّ اِلىٰ اَبِينٰا مِنّٰا وَ نَحْنُ عُصْبَةٌ اِنَّ اَبٰانٰا لَفِي ضَلٰالٍ مُبِينٍ﴾.(٢)

نازانین بۆ چی باوکمان یوسف و بنیامینی لە ئێمە خۆشتر دەوێ؟ خۆ ئێمە لەوان گەورەترین و توانامان لەوان زۆرترە و دنیا دیدەترین و دەتوانین خزمەتی باوکمان باشتر بکەین و باشتریشی دەکەین، دەبێ باوکمان بۆیە یوسف و بنیامینی لە ئێمە خۆشتر بوێ چونکە دایکی وانی لە دایەکانی ئێمە خۆشتر دەوێ؟ گوتیان: جا ئێمە چ گوناحێکمان هەیە؟ دیارە باوکی ئێمە لە حەق لای داوە.

﴿اُقْتُلُوا يُوسُفَ اَوِ اطْرَحُوهُ اَرْضاً يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ اَبِيكُمْ وَ تَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْماً صٰالِحِينَ﴾.(٣)

یەکێکیان گوتی: وەرن یوسف بکوژن یان ببیەنە دەشت و سەحرایەکی دوور با گورگ و دڕندە بیخۆن، ئەوکاتە باوکمان دڵی دێتە سەر ئێمە و یوسفی لە بیر دەچێتەوە و لە پاشانیش تۆبە دەکەین و خوا لێمان خۆش دەبێ و دەبینە پیاوی چاک.

﴿قٰالَ قٰائِلٌ مِنْهُمْ لٰا تَقْتُلُ[illegible]فَ وَ اَلْقُوهُ فِي غَيٰابَةِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيّٰارَةِ اِنْ كُنْتُمْ فٰاعِلِينَ﴾.(٤)

---

(١) یوسف: ۶. (٢) یوسف: ٨. (٣) یوسف: ٩.
(۴) یوسف: ١٠.

یەهوزا کە لە هەموانیان عاقڵتر و داناتر و لە سەر خۆتر بوو هەستایە سەر پێ و گوتی: ئەی براینە ئێمە کوڕە پێغەمبەرین، نەوەی حەزرەتی ئیبرایهیمین، لە لای خۆی خۆمان بە ئاقڵ و بە دین دەزانین، پیاو کوشتن نە بە عەقڵ دروستە نە بە دین، یوسفیش منداڵێکی بێ گوناحە و هیچی خەراپی نەکردووە، ئەگەر بە قسەی من دەکەن بە هەر فێڵێک بێ بیبەن بیخەنە ناو ئەو بیرە کە لە سە ڕێگای کاروانیانە، بەڵکو کە بۆ ئاو هەڵێنجان چوونە سەر بیرەکە دەری بێننەوە و لەگەڵ خۆیان بیبەن بۆ وەڵاتی خۆیان جا ئەوکاتە ئێمە بە ئارەزووی خۆمان دەگەین و لە گوناهی پیاو کوشتنیش ڕزگارمان دەبێ، هەمووان تەگبیرەکەیان پێ باش بوو، بۆ بەیانی چوونە خزمەت باوکیانو گوتیان:

﴿قٰالُوا يا اَبانٰا مٰا لَكَ لٰا تَأْمَنّٰا عَلىٰ يُوسُفَ وَ اِنّٰا لَهُ لَنٰاصِحُونَ﴾.(١)

ئە باوکی ئێمە تۆ بۆ لە ئێمە ئەمین نی و یوسف لە ئێمە دوور دەخەیتەوە؟ خۆ ئێمە هەموومان کوڕی تۆین و یوسف برامانە و خۆشمان دەوێ و ئاگاداری دەکەین.

﴿اَرْسِلْهُ مَعَنٰا غَداً يَرْتَعْ وَ يَلْعَبْ وَ اِنّٰا لَهُ لَحٰافِظُونَ﴾.(٢)

بەیانی هەموومان دەچین بۆ دەشت و سەحرا یوسفیشمان لەگەڵ بنێرە با بۆ خۆی شت بخوا و یاری بکا و بای باڵی خۆی بدا و هەوای ئازاد هەڵمژێ، ئێمەش ئاگاداری دەکەین.

﴿قٰالَ اِنّي لَيَحْزُنُني اَنْ تَذْهَبُوا بِهِ وَ اَخٰافُ اَنْ يَأْكُلَهُ الذِّئْبُ وَ اَنْتُمْ عَنْهُ غٰافِلُونَ﴾.(٣)

باوکیان فەرمووی: ئاخر من ئولفەتم بە یوسفەوە گرتووە، ئەگەر لێم دور کەوێتەوە زۆرم پەرۆش دەبێ و بۆی مەحزون و بێ تاقەت دەبم. لەوەش دەترسم ئێوە خافڵی کەن و گورگ بیخوا.

﴿قٰالُوا لَئِنْ اَكَلَهُ الذِّئْبُ وَ نَحْنُ عُصْبَةٌ اِنّٰا اِذاً لَخٰاسِرُونَ﴾.(٤)

هەموانیان سوێندیان خوارد و گوتیان: ئەگەر گورگ بیخوا لە کاتێکدا ئێمە هەموومان بە

---

(١) یوسف: ١١. (٢) یوسف: ١٢. (٣) یوسف: ١٣.
(٤) یوسف: ١٤.

سەر یەکەوەین و بەتاقەتین، دەبێ ئێمە پیاو نەبین بێڵین تووشی ناڕەحەتی بێو حەزرەتی یەعقوب زۆر بە نابەدڵی ئیجازەی دان لەگەڵ خۆی بەرن. یوسفی بانگ کرد و دەباوەشی گرت و ناو چاوانی ماچ کرد و بە گریانەوە گوتی: بڕۆ لەگەڵیان خوا ئاگادارت بێ نەوەک نەت بینمەوە.

﴿فَلَمّٰا ذَهَبُوا بِهِ وَ اَجْمَعُوا اَنْ يَجْعَلُوهُ فِي غَيٰابَةِ الْجُبِّ﴾.(١)

کاتێک یوسفیان برد، یوسف زۆر بە شادی و یاری کردنەوە دەڕۆیشت تا دور کەوتنەوە، براکانی دەستیان کرد بە لێدانی، یوسف دەی گوت: بۆ چی لێم دەدەن چ گوناحێکم کردووە، دەگریا و دەی گوت: خۆ باوکم منی بە ئێوە سپارد و سوێندتان بۆ خوارد، خۆ منیش برای ئێوەم، هیچ نەبێ لە بەر خاتری باوکم وازم لێ بێنن، هیچ فائیدەی نەبوو، زۆر بە بێ ڕەحمی لێیانم دەدا. یوسفیان بردە سەر بیرەکە و ڕوتیان کردەوە و فرێیان دایە ناو بیرەکەوە. پێش ئەوەی بگاتە بن بیرەکە خوای تەعالا حەزرەتی جوبرەئیلی نارد و لە حەوا گرتیەوە و بە سپاوی لە سەر بەردێکی دانا. حەزرەتی یوسف لە ناو بیرەکەدا زۆر غەمبار بوو، زۆری بەزەیی بە خۆیدا هات.

﴿وَ اَوْحَيْنٰا اِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُمْ بِاَمْرِهِمْ هٰذٰا وَ هُمْ لٰا يَشْعُرُونَ﴾.(٢)

خوا دەفەرموێ: لەوکاتەدا خستمانە دڵیەوەکە خەم مەخۆ و نەترسی خەلاست دەکەین و ڕۆژێک دێ ئەو خەراپە بە چاوی براکانتدا بدەیتەوە و ئەوان موحتاجی دەستی تۆ بن و دەستە و نەزەر لە پێشت ڕاوەستن نەت ناسنەوە، تۆ ئەوەندە مەرتەبەت بەرز دەبێ.

یوسف لە چاڵەکەدا بوو، ئەوانیش هاتن بەرخێکیان سەر بڕی و کراسی یوسفیان بە خوێنەکەی خوێناوی کرد.

﴿وَ جٰاءُوا اَبٰاهُمْ عِشٰاءً يَبْكُونَ﴾.(٣)

ئێوارە هەموویان بە گریانەوە هاتنەوە بۆ لای باوکیان و گوتیان:

﴿قٰالُوا يٰا اَبٰانٰا اِنّٰا ذَهَبْنٰا نَسْتَبِقُ وَ تَرَكْنٰا يُوسُفَ عِنْدَ مَتٰاعِنٰا فَاَكَلَهُ الذِّئْبُ﴾.(٤)

ئەی باوکە ئێمە خەریکی یاری کردن بووین یوسفمان لای شتومەکەکانمان بە جێ هێشتبوو، تا پێمان زانی گورگ خوارد بووی و ئەو خەم و ناڕەحەتیەی بۆ بە جێ هێشتین.

(١) و (٢) یوسف: ١٥. (٣) یوسف: ١٦. (٤) یوسف: ١٧.

﴿وَ مٰا اَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنٰا وَ لَوْ كُنّٰا صٰادِقِينَ﴾.(١)

هەرچەند ئەگەر ڕاستیش بڵێین تۆ هەر باوەڕمان پێ ناکەی.

﴿وَ جٰاءُو عَلىٰ قَمِيصِهِ بِدَمٍ كَذِبٍ﴾.(٢)

کراسە خوێناویەکەیان لە پێش باوکیان دانا و گوتیان: ئەوە کراسەکەیەتی کە لە خوێناوەکەیدا شەلاڵ بووە. حەزرەتی یەعقوب کە تەماشای کراسەکەی کرد لە هیچ لایەکەوە نەدڕاوە و نەقرنجاوە زانی درۆ دەکەن و گورگ نەی خواردوە.

﴿قٰالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ اَنْفُسُكُمْ اَمْراً﴾.(٣)

فەرمووی: درۆ دەکەن ئەوە خوێنی یوسف نیە و بۆنی خوێنی یوسفی لێ نایە، ئێوە کارێکی زۆر خەراپ و زۆر گەورەتان کردووە و بە کەمی دەزانن.

﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللّٰهُ الْمُسْتَعٰانُ عَلىٰ مٰا تَصِفُونَ﴾.(٤)

فەرمووی: من سەبر دەگرم و هاوار ناکەم و لە خوا داوا دەکەم کە درۆ و ڕاستی ئێوە ئاشکرا بکا. لەپاش سێ شەو و سێ ڕۆژ کاروانی میسریان لە مەدیەن گەڕابوونەوە و بەرەو میسر دەچوونەوە ڕێگایان لێ هەڵە بوو، ڕێیان کەوتە نزیک ئەو بیرە کە یوسفی تێدا بوو، کاروان چیەکان مالیکی کوڕی زەعری خوزاعیان نارد بۆ سەر بیرەکە، کە تا ئەوان بار دەخەن ئەم ئاویان بۆ هەڵێن جێ، وەکو قورئان دەفەرمووێ:

﴿وَ جٰاءَتْ سَيّٰارَةٌ فَاَرْسَلُوا وٰارِدَهُمْ فَاَدْلىٰ دَلْوَهُ﴾.(٥)

کاروانەکە هات و دەستیان کرد بە بار خستن و مالیک چوو دۆڵچەکەی داهێشتە ناو بیرەکە و یوسف چۆ ناو دۆڵچەکەوە و مالیک کە هەڵی کێشایەوە زۆر قورس بوو، کە تەماشای کرد کوڕێکی زۆر گەنج و جوان و لاو چاک لە ناو دۆڵچەکەی دایە، لە خۆشیان گەشەی گرت و هاواری کردو گوتی:

﴿قٰالَ يٰا بُشْرىٰ هٰذٰا غُلاٰمٌ﴾.(٦)

موژدە بێ ئەی کاروانچینە ئەوە غوڵامێکە تا ئێستا کەس جوانی وای نەدیوە. کاروان چیەکان لێی کۆ بوونەوە و سەرسام مان گوتیان: تۆ ئادەمیزادی، پەری زادی، فریشتەی چێت؟ گوتی: ئادەمیزادم و بردیان لای خۆیان دایاننا.

---

(١) یوسف: ١٧. (٢) و (٣) و (٤) یوسف: ١٨. (٦) یوسف: ١٩.

ڕاوی دەڵێ یەهوذای برای پەرۆشی بوو، هەموو ڕۆژێک دەهاتە سەر بیرەکە و نانی بۆ دێنا، ئەو ڕۆژە هات تەماشای کرد یوسف لەوێدا نەماوە، کە ڕوانی ئەوا لای کاروانچیەکان دانیشتووە، بە غار لە ترسان چۆوە و بە براکانی گوت و هەموویان هاتن، گوتیان: ئەو کوڕە عەبد و غولامی ئێمەیە و ڕای کردووە، یان لێمان بکڕن، یان بماندەنەوە، یوسف لە ترسان دەنگی نەکرد.

یوسفیان بە مالیک فرۆشت بە پارەیەکی زۆر کەم و گەڕانەوە بۆ ماڵ و کاروانیەکان یوسفیان برد بۆ میسر، ناو بانگی جوانی یوسف لە شاری میسر بڵاو بووە، خەڵک دەستە دەستە بەرە و ماڵی مالیک ڕا دەخزین بۆ تەماشا کردنی یوسف، مالیک حەمامی بە یوسف کرد و لیباسی ئاوریشمی لە بەر کرد و کڵاوی زێڕینی لە سەر نا و لە سەر کورسێکی جەواهێر بەندی دانا و جاڕچی جاڕی دا کە هەر کەس دەخۆی ڕا دەبێنی بێ جوانترین و زاناترین و گوێ گرترین و شەرمێوین‌ترین و بە حەیاترین عەبد و بەندە بکڕێ بچێتە ماڵی مالێک. تەواوی خەڵکی شاری میسر بە فەقیر و دەوڵەمەند و ژن و پیاوەوە ڕووی کردە ماڵی مالێک. هەر کەس چاوی بە جەماڵ و جوانی یوسف دەکەوت شێت و حەیران و سەرسام دەبوو، لە تەماشا کردنی تێر نەدەبوو. دەڵێن تەنانەت پیرێ ژنێک گلۆڵە ڕیسێکی هەبوو هەر بۆوەی پێ‌ی بڵێن کریارە، هاتبوو دەی گوت: منیش موشتەریم. تاجر و دەوڵەمەندان لە سەر یەکتر زەمیان کرد، تا ئاخری عەزیزی میسر بە پارەیێکی زۆر یوسفی کڕی و بردیەوە ماڵەوە.

﴿وَ قَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِنْ مِصْرَ لِامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَىٰ أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَداً﴾.(١)

عەزیزی میسر بە زولەیخای گوت: دەبێ زۆرت ئاگا لە یوسف بێ، نابێ وەک عەبدان تەماشای کەی با لامان وەمینی، ڕۆژێک دێ سوودی بۆمان هەبێ، یا دەی کەین بە کوڕی خۆمان. زولەیخا کە چاوی بە یوسف کەوت موچڕکێکی لە بەری پێیان ڕا هات و لە تۆقی سەری دەر چوو، بە دڵ عاشقی یوسف بوو، شەو و ڕۆژ خەریکی خزمەت کردنی

(١) یوسف: ٢١.

یوسف بوو، کام خواردەمەنیە باش بووایە و کام لیباسی جوان بوایە و کام گڵاوە زورتر بە گەوهەر و مرواری جوانتر بڕازایەوە بۆی ئامادە دەکرد، ئەوەندە یوسفی خۆش دەویست تا حەوت ساڵ نەی هێشت هیچ کارێک بکا. ئاقیبەت زولەیخا سەبر و ئارام و قەراری لێ هەڵگیرا و کێردی گەیشتە ئێسقان بەڵام تا زولەیخا زۆرتری دەلاواندەوە یوسف زیاتر لێی دور دەکەوتەوە و ڕووی تێ نەدەکرد. زولەیخا بەو هەموو خوێن گەرمی و شۆخ و شەنگیەوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە تاوی یوسف زەرد و زەعیف و کز و لاوازتر دەبوو.

ڕۆژێک پیرێژنێک کە زۆر جار دەهات بۆ لای، گوتی: ئەی بە سەدەقەت بم و دەبەرت گەڕێم ئەوە بۆ وا زەرد و زەعیف بووی و ڕەنگی ڕوانت نەماوە؟ ئەیەڕۆ چیت لێ قەوماوە؟ زولەیخا تا ئەوکاتە لای کەس نەی درکاندبوو، گوتی: چیت لێ وەشارم، یوسف دڵی بردووم و ئارامم نەماوە و قەرارم لێ هەڵگیراوە لە تاوانی، بەڵام هەر چەند دەکەم و دەکرێم ڕوم تێ ناکا و جوابم ناداتەوە. پیرێژن گوتی: ئەی مەلەکەی میسر من تەگبیرێکت بۆ دەکەم و لەو غەمە رزگارت دەکەم، بەڵام دەبێ دڵت بە پارەوە نەبێ، زولەیخا هەر هەستا و کلیلی خەزنەی عەزیزی میسری دایە دەست پیرێژن و گوتی:ها چی دەکەی و چ خەرج دەکەی بیکە! پیرێژن وەستا و بەننا و عەمەلە و کرێکاری بانگ کردن و لە ماوەیەکی کەمدا قەسرێکیان دروست کرد کە حەوت هۆدە بە سەر یەکەوە بوون و حەوت دەرگا لە سەر یەک دادەخران، تەواوی دیواری ژورەکانیان بە وێنەی یوسف و زولەیخا ڕازێندرا بوونەوە، تەنانەت سەقف و فەرشی هۆدەکانیش هەر بە ڕەسم و وێنەی یوسف و زولەیخا کاشی کاری کرا بوون، سەرە ڕای ئەوەش بە فەرش و دۆشەکی ڕازاوە بە گەوهەر و مرواری پڕ فەرش کرابوون، عود و شەمع و عەنبەریان تێدا داگیرساندبوون و هەڵ کردبوون و تەختێکی زێرینیان لە ناوە ڕاستی ژوری حەوتەمدا دانا بوون، کە ئەو تەدارەکە تەواو بوو، زولەیخا کلیلی بە دەستەوە گرتن و یوسفی بانگ کرد و چوونە ژورەوە. زولەیخا لە چوونە ژوورەوەدا دەرگاکانی یەک لە دوا یەک دادەخست، یوسف کە چۆ ژورەوە و تەماشای کرد زانی کە ئەو دەزگایە لە بەر خاتری ئەوو بۆ بە سەهوو بردنی وی ڕازێندراوەتەوە، لە دڵدا قەراریدا کە ئەگەر زولەیخا لەت و کوتیشی بکا جوابی نەداتەوە.

﴿وَ رٰاوَدَتْهُ الَّتي هُوَ في بَيْتِهٰا عَنْ نَفْسِهِ وَ غَلَّقَتِ الْأَبْوٰابَ وَ قٰالَتْ هَيْتَ لَكَ﴾.(١)

زولەیخا دووا ئەوەی چوونە ژوورەوە ڕوی کردە یوسف و گوتی: وەرە خەریک بە خۆم بۆ تۆ ئامادە کردوە و ئەو دەزگایەم لە بەر خاتی تۆ ڕازاندۆتەوە، چ دەبێ ئەگەر بە چاوی موشتەری تەماشام بکەی و برینی ئەو دڵە غەمبارەم بە گۆشەی چاوت سارێژ کەی؟ یوسف لە جوابی زولەیخادا گوتی: دەترسم لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ کۆمەڵی گوناح کاراندا حەشرم بکرێ و لای خۆشی من کوڕە پێغەمبەرم چۆن دەبێ کاری خەراپ بکەم. زولەیخا گوتی: دە تۆزێک وەرە باوەشمەوە با سەبوریم بێ و تۆزێک فەرامۆشیم بشکێ، یوسف گوتی: ئاخر لە ئاگری جەهەننەم دەترسم، زولەیخا گوتی: دەستم دەیە با بە سەر دڵمدا بیهێنم و فەرەحیم بە دڵدا بێ، یوسف گوتی: ئاخر لە ترسی خوا ناوێرم، زولەیخا گوتی: بە خوا جوانی، یوسف گوتی: ئەوەی منی دروست کردووە لە من جوانترە، زولەیخا گوتی: مووەکانت زۆر دڵگیر و جوانن، یوسف گوتی: چ فائیدە لە گۆڕدا زوو هەڵدەوەرن. زولەیخا گوتی: بۆ چی تۆ هیچم بە قسە ناکەی؟ یوسف گوتی: لە بەر دوو شت. یەکەم لە ترسی خوا؛ دووەم لە بەر عەزیز کە پیاوەتی لەگەڵ من کردووە. جا با لێرەدا حەزرەتی یوسف بە خوا بسپێرین و لە مەجلیسی بەیانیدا دەچینەوە خزمەتی و لە بەشێکی دیکەی ژیانی ئەو پێغەمبەرە نازدارە دەگەین

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

(١) یوسف: ٢٣.

٢

# حەزرەتی یوسف

## باسی «حەزرەتی یوسف» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.

لە بەشی دوێنێدا گوتمان: کە ئاخرین قسەی حەزرەتی یوسف ئەوە بوو فەرمووی: نمەک بە حەرامی ناکەم عەزیز پیاوەتی لەگەڵ مندا کردوە. زولەیخا لە جوابدا گوتی: هیچ لە عەزیز مەترسە من شەربەتێکی وای دەدەمێ کە تا ڕۆژی قیامەت سە بەرز نەکاتەوە و تۆش دەکەمە میرات گری عەزیز، گوتی: خۆ تۆ دەڵێی خوای من کەریمە ئەگەر بە قسەم بکەی لە پاشان تەواوی گەنجینە و دوڕ و گەوهەر و لەعل و مەرجان و زێڕ و زیو و جەواهێراتەکەم لە ڕێگای خوادا دەکەم بە خێر و خێرات و دەی دەم لە کەفارەتی گوناحەکەت و خوا عەفووت دەکا، یوسف لە جوابدا گوتی: خوای من ڕیشوە و بەرتیل وەرناگرێ.

﴿وَ لَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَ هَمَّ بِهٰا لَوْلٰا اَنْ رَأىٰ بُرْهٰانَ رَبِّهِ﴾.(١)

---

(١) یوسف: ٢٤.

زولەیخا هەر خەیاڵی کاری خەراپی دەکرد و یوسف خەیاڵی بە قسە نەکردنی و خۆ پاراستن، تا خوا بەڵگەی نەجات بوونی نیشاندا.

ڕاوی دەڵێ لەوکاتەدا زولەیخا چارشێوەکەی بە سەر بتێک دادا و دای پۆشی، یوسف پرسی ئەوە بۆ چیت دا پۆشی؟ زولەیخا گوتی: ئەوە خوامە، زۆری شەرم لێ دەکەم، با لەو کاتەدا چاوی لێ نەبم، یوسف گوتی: ئەی زولەیخا تۆ شەرم لەو بتە دەکەی کە هیچ نازانێ و هیچ نابیسێ و هیچ نابینێ بەڵام من دەبێ شەرم لەو خوایە نەکەم کە خەبیر و و بەسیرە و ئاگای لە ئاشکرا و نەهێنی هەیە؟ ئەوەی گوت و ڕووی وەرگێڕا و بەرە و دەرگا ڕای کرد. زولەیخا بە قیژاندن و هاوار کردن وەدووای کەوت، بەڵام بە ئەمری خوا یوسف دەچۆ بن هەر دەرگایەک دەرگاکە لە خۆڕا دەکرایەوە و لە سەر پشت دەکەوت تاگەیشتە بن دەرگای حەوتەم.

﴿وَاسْتَبَقَا الْبَابَ وَ قَدَّتْ قَمِيصَهُ مِنْ دُبُرٍ وَ اَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا الْبَابِ﴾.(١)

لە بن دەرگای حەوتەم گەیشتنە یەکتر و زولەیخا لە پاشەوەڕا ئێخە کراسەکەی گرت و بۆ پاشەوەی ڕاکێشا و کراسەکەی دڕاند. لەوکاتەدا عەزیز گەیشتە بن دەرگا و بە سەر ئەو کارەساتەدا کەوت، زولەیخا چاوی بە عەزیز کەوت بێ سێ و دوو ڕووی کردە عەزیز و گوتی:

﴿قَالَتْ مَا جَزَاءُ مَنْ اَرَادَ بِاَهْلِكَ سُوءً اِلَّا اَنْ يُسْجَنَ اَوْ عَذَابٌ اَلِيمٌ﴾.(١)

جەزای ئەو کەسە چیە کە لەگەڵ خێزانی تۆدا بی‌هەوێ خەراپە بکا؟ جەزای هیچ نیە ئەوە نەبێ یان زیندانی بکرێ، یان زۆری عەزاب بدەی. عەزیز ڕووی کردە یوسف و گوتی: من تۆم بە کوڕی خۆم لە قەڵەم دابوو، بە ئەمینم داتا بووی لە ماڵیدا، کە چی تۆ ئاوام پاداشت دەدەیەوە؟ خەیانەتم پێ دەکەی و نامووسم دەبەی، یوسف گوتی: قوربان بە قسەی ژنان باوەڕ مەکە، زولەیخا درۆ دەکا، خەتا لە لایەن ئەوەیە، ئەو پەلاماری منی داوە، من لە دەستانی ڕام کردووە.

﴿قَالَ هِيَ رَاوَدَتْنِي عَنْ نَفْسِي﴾.(٢)

---

(١) و (١) یوسف: ٢٥. (٢) یوسف: ٢٦.

عەزیز گوتی: هیچ بەڵگە و دەلیلت بە دەستەوەن کە تۆ تاوان بار نی؟ یوسف ئیشارەی بۆ منداڵێکی خزمی زولەیخا کرد و گوتی: لەو منداڵە پرسن ڕاستی‌یەکەتان پێ دەڵێ و درۆ و ڕاستی من و زولەیخا دردەخا.

﴿وَ شَهِدَ شٰاهِدٌ مِنْ اَهْلِهٰا﴾.(١)

لە منداڵەکەیان پرسی و منداڵەکە وەدەنگ هات و گوتی:

﴿اِنْ کٰانَ قَمیصُهُ قُدَّ مِنْ قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَ هُوَ مِنَ الْکٰاذِبینَ﴾.(٢)

ئەی عەزیز تەماشا کەن ئەگەر کراسەکەی یوسف لە پێشەوەڕا درابێ ئەوە زولەیخا ڕاست دەکا و یوسف درۆ دەکا.

﴿وَ اِنْ کٰانَ قَمیصُهُ قُدَّ مِنْ دُبُرٍ فَکَذَبَتْ وَ هُوَ مِنَ الصّٰادِقینَ﴾.(٣)

ئەگەر لە پاشەوەشڕا دڕا بوو ئەوە زولەیخا درۆ دەکا و یوسف ڕاست دەکا.

﴿فَلَمّٰا رَأیٰ قَمیصَهُ قُدَّ مِنْ دُبُرٍ قٰالَ اِنَّهُ مِنْ کَیْدِکُنَّ اِنَّ کَیْدَکُنَّ عَظیمٌ﴾.(٤)

عەزیز کە تەماشای کرد کراسەکەی لە پاشەوەڕا دڕا بوو ڕووی کردە زولەیخا و گوتی: ئەوە خەتای تۆیە و مەکری تۆیە بە ڕاستی مەکری ژنان گەورەیە.

﴿یُوسُفُ اَعْرِضْ عَنْ هٰذٰا واسْتَغْفِري لِذَنْبِكِ اِنَّكِ کُنْتِ مِنَ الْخٰاطِئینَ﴾.(٥)

گوتی: ئەی یوسف ئەو قسە و باسە لە بیر خۆت بەرەوە و باسی مەکە با خەڵک نەزانێ. ڕوشی کردە زولەیخا و گوتی: تۆش تۆبە بکە و وەپاڕێ و داوای لێ بوردن بکە چونکە بە ڕاستی تۆ خەتاباری.

ڕاوی دەڵێ لە پاش شەش حەوت مانگ ژنانی میسری بە تایبەتی ژنی وەزیر و ساقی و پەردەدار و ئاشپەزچی و میرئاخورِ بەو خەبەرەیان زانی و دەستیان کرد بە لۆمە کردنی زولەیخا.

﴿وَ قٰالَ نِسْوَةٌ فِی الْمَدینَةِ امْرَاَتُ الْعَزیزِ تُرٰاوِدُ فَتٰاهٰا عَنْ نَفْسِهِ قَدْ شَغَفَهٰا حُبّاً اِنّٰا لَنَرٰاهٰا في ضَلٰالٍ مُبینٍ﴾.(٦)

---

(١) و (٢) یوسف: ٢٦. (٣) یوسف: ٢٧. (٤) یوسف: ٢٨.
(٥) یوسف: ٢٩. (٦) یوسف: ٣٠.

ژنەکان لە ناو خۆیاندا گوتیان: دەڵێن: زولەیخا عاشقی غولامیکی عیبری بووە لە تاوانی وەختە شێت بێ و دەڵێن: ڕۆژێک پەلاماریشی داوە، بەڵام غولامەکە جوابی نەداتەوە.

﴿فَلَمّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ اَرْسَلَتْ اِلَيْهِنَّ وَاعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَئاً وَ آتَتْ كُلَّ واحِدَةٍ مِنْهُنَّ سِكّيناً﴾.(١)

زولەیخا کە زانی ژنانی میسری زانیویانە و غەیبەت و لۆمەی دەکەن، میوان دارییەکی بۆ کردن و زوربەی ژنەکانی دەعوەت کرد، لە کاتێکدا کە ژنەکان لە سەر کورسی ڕەنگا و ڕەنگ پاڵیان دا بۆوە و میوەیان لە پێش دانرا، هەر یەکی چەقۆیەک و ترنجێکیان بە دەستەوە گرت و خەریکی پاک کردن و قاش‌کردنی بوون، زولەیخا یوسفی حەمام لە میش کردبوو، لیباسی جوانی لە بەر کرد بوو، کوڵاوی مورەسەع بە دوڕ و یاقوت و مرواری لە سەر نابوو.

﴿وَ قالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ﴾.(٢)

بە یوسفی گوت: هەستە بچۆ بۆ ناو ئەو ژنانە و ئاویان بۆ بەرە.

﴿فَلَمّا رَاَيْنَهُ اَكْبَرْنَهُ وَ قَطَّعْنَ اَيْدِيَهُنَّ وَ قُلْنَ حاشَ لِلّٰهِ ما هٰذا بَشَراً اِنْ هٰذا اِلّا مَلَكٌ كَريمٌ﴾.(١)

کە ژنەکان چاویان بە یوسف کەوت حەپەسان و هۆشیان لای خۆیان نەما و واقیان وڕما، لە باتی پاکردنی ترنج قمکی خۆیان بڕی و پشتی دەستی خۆیان هەموو تاشی و دەست و پەنجە و کۆشیان خوێناوی بوو، کە یوسف چۆ دەرەوە وە هۆش هاتنەوە و خۆیان ئاوا دی گوتیان: «اللّٰه‌اکبر» ئەوە ئادەمیزاد نیە، فریشتەیە. ئنجا زولەیخا لە چەپڵەی دا و گوتی:

﴿قالَتْ فَذٰلِكُنَّ الَّذي لُمْتُنَّني فيهِ وَ لَقَدْ راوَدْتُهُ عَنْ نَفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ﴾.(٢)

ئەوەیە کە ئێوە لۆمەی من دەکەن لە سەر خۆشەویستی ئەو، ئەی ئێوە بە چاو پێ کەوتنێک بۆ واو بە سەر هات؟ لە کاتێکدا ئەوە چەند ساڵە لە ماڵی منداگەورە بووە و شەو

---

(١) و (٢) و (١) یوسف: ٣١. (٢) یوسف: ٣٢.

و ڕۆژ لە لامە، ئەی بۆ لۆمەم دەکەن؟ بە ڕاستی من عاشقی بووم و پەلامارم داوە و ئەو جوابم ناداتەوە، ئەوەش بزانن کە تازە خۆشەویستی من ئاشکرا بووە و خەڵک زانیویەتی.

﴿وَ لَئِنْ لَمْ يَفْعَلْ مٰا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَ لَيَكُوناً مِنَ الصّٰاغِرِينَ﴾.(١)

ئەگەر بە قسەم نەکا و جوابم نەداتەوە دەی خەمە زیندانەوە و زەلیلی دەکەم. ژنەکان گوتیان: یوسف بانگ بکەوە با ئامۆژگاری بکەین بەڵکو بە قسەت بکا و لە قسەی ئێمە دەر نەچێ. دوو بەشی بۆیەش وایان گوت کە جارێکی دی بە جەماڵی یوسف شاد بن. دووبارە یوسفیان بانگ کردە ژورەوە و ژنەکان لێکرا ڕوویان کردە یوسف و گوتیان: بۆ لە قسەی زولەیخا دەردەچی و بە قسەی ناکەی؟ دەترسین ڕۆژێک بە دڵ تووڕە ببێ و زیندانت کا.

﴿قٰالَ رَبِّ السِّجْنُ اَحَبُّ اِلَيَّ مِمّٰا يَدْعُونَنِي اِلَيْهِ وَ اِلّٰا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ اَصْبُ اِلَيْهِنَّ وَ اَكُنْ مِنَ الْجٰاهِلِينَ﴾.(٢)

یوسف لە جوابی ژنەکاندا سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و گوتی: ئەی خوای گەورە خۆت دانا و زانای داوای چیم لێ دەکەن و بە چیم دەترسێنن، زیندان بەو هەموو تاریکی و نا خۆشی‌یەوە لای من خۆشترە لەوەی داوام لێ دەکەن ئەگەر لە مەکری ئەو ژنانەم ڕزگار نەکەی دەترسم شەیتان بە سەهوم بەرێ و تووشی زەللەم بکا و بە قسەیان بکەم و بە نەزان لە قەڵەم بدرێم.

﴿فَاسْتَجٰابَ لَهُ رَبُّهُ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ اِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾.(٣)

خوای تەعالا جوابی نزاکەی دایەوە و لە مەکری ژنەکانی مەحفوز کرد.

﴿ثُمَّ بَدٰا لَهُمْ مِنْ بَعْدِ مٰا رَاَوُا الْآيٰاتِ لَيَسْجُنُنَّهُ حَتّٰى حِينٍ﴾.(٤)

ئنجا لە پاش ئەوەی کە بەو هەموو بەڵگانە کە بریتی بوون لە شاهیدی منداڵکە و دڕانی کراسەکەی لە پشتەوەڕا و دەست بڕینی ژنانی میسری لە باتی ترنج، بۆیان دەرکەوت حەزرەتی یوسف پاکە و زولەیخا خۆی دەیزانێ چی کردووە و تازە هەموو خەڵکی میسر زانیویەتی و لۆمەیان دەکەن. عەزیز و زولەیخا بڕیاریان دا یوسف بەرنە بەندیخانە. غوڵام

---

(١) یوسف: ٣٢. (٢) یوسف: ٣٣. (٣) یوسف: ٣٤.
(٤) یوسف: ٣٥.

و دەست و پێوەندیان بانگ کردن و لیباسی کۆن و دڕاویان لە بەر یوسف کرد و دەستیان کلەپچە کرد و بە بازاڕی میسریاندا گێڕا و جاڕچی جاڕی دا کە هەر کەسێک خەیانەت لەگەڵ گەورەی خۆی دا بکا ئاوای بە سەر دێ، بەڵام زوربەی خەڵک کە چاویان بە جەماڵ و ئەدەب و و شکڵی یوسف دەکەوت دەیان گوت: ئەو قسە وا نیە، یوسفیان بردە بەندیخانە و دایانە دەست کار بەدەستانی زیندان. بەندی‌یەکان کە چاویان بە حەزرەتی یوسف کەوت کردیان بە کەیف و شادی و هەڵپەڕکێ، لە خۆشی حەزرەتی یوسف ناخۆشی زیندانیان لە بیر چۆوە، بەڵام حەزرەتی یوسف لە لایەک دڵی ناڕەحەت بوو چونکە بە ڕواڵەت گرتبوویان و دەستیان کەلەپچە کردبوو دەی گوت: لەوانەیە ئەو کەسانەی ئاگایان لە حەقیقەتی بە سەرهاتی ئەو نیە بڵێن خەتابارە، بەڵام لە لایەکی ترەوە دڵخۆشی خۆی دەدایەوە و دەی گوت: بۆ کوڕە پێغەمبەرێک گرتن و کەلەپچە کردن و تاریکایی بەندیخانە زۆر باشترە لەوە کە توشی گوناح بێ. ئنجا خواوەندی گەورە حەزرەتی جوبرەئیلی نارد و فەرمووی: بە یوسف بڵێ غەم نەخوا ئەوا کردم بە پێغەمبەر و دەست بکا بە بانگ کردنی بەندی‌یەکان بۆ خواپەرستی، ئەوا عیلمی خەون لێک دانەوە و زۆر شتی غەیبی و نەهێنیم پێ بەخشی.

﴿وَ دَخَلَ مَعَهُ السِّجْنَ فَتَيٰانِ قٰالَ اَحَدُهُمٰا اِنِّي اَرٰانِي اَعْصِرُ خَمْراً وَ قٰالَ الْاٰخَرُ اِنِّي اَرٰانِي اَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزاً تَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْهُ نَبِّئْنٰا بِتَأْوِيلِهِ اِنّٰا نَرٰاكَ مِنَ الْمُحسِنِينَ﴾.(١)

وا ڕێکەوت لەگەڵ گرتنی حەزرەتی یوسف دوو کوڕی گەنجی میسری کە یەکێکیان ساقی مەلیکی میسر بوو، ئەوی تریان ئاشپەزی بوو گیران و حەواڵەی بەندیخانەیان کردن. کە تەماشایان کرد لە بەندیخانەدا کوڕێک هەیە ڕۆژ تا ئێوارە خەریکی ئامۆژگاری بەندی‌یەکانە و قسە لە شتی غەیبی دەکا و مەعنای خەونان لێک دەداتەوە. عادەتیشە بنیادەم لە کاتی تەنگ و چەڵەمەدا زۆر خەون دەبینێ بەیانی نەبوو چەند خەون بۆ حەزرەتی یوسف نەگێڕنەوە و مەعنایان بۆ لێک نەداتەوە.

---

(١) یوسف: ٣٦.

شەوێک ئەو دو پیاوە خەونیان دی و بەیانی هاتن بۆ خزمەت حەزرەتی یوسف و پەکیان گوتی: من ئەو شەۆ لە خەومدا ترێم دەگوشی و دەمکرد بە شەراب، ئەوی تریشیان گوتی: منیش لە خەومدا سەبەتێکم نان لە سەر دانا بوو و تەیر و باڵندە دەهاتن نانەکەیان دەخوارد. گوتیان: مەعنای ئەو خەونانەمان پێ بڵێ لامان وایە تۆ زۆر پیاوی باشی و هەرچی بڵێی ڕاست دەکەی و وەڕاست دەگەڕێ.

﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِ اِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِ قَبْلَ اَنْ يَأْتِيكُمَا ذٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّي اِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللّٰهِ وَ هُمْ بِالْاٰخِرَةِ كَافِرُونَ﴾.(١)

حەزرەتی یوسف بە فڕسەتی زانی و دەستی کرد بە ئامۆژگاری ئەو دوو کەسە و فەرمووی: خواوەندی گەورە نیعمەتی زۆری بە هۆی ئیمانەوە داوە بە من و شتی غەیبی و نەهێنی زۆر دەزانم، پێش ئەوەی خواردن و بۆبێ دەزانم چیە؟ ئەو زانینەشم بە هۆی ئەوەیە کە خۆم پاراستووە لەو میللەتە کە ئیمانیان بە خوا و دووا ڕۆژ نیە، دوو پیاوەکە گوتیان: بۆ ئەتۆ خەڵکی میسر نی و لە سەر ئاینی ئێمە نی؟ حەزرەتی یوسف فەرمووی:

﴿وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ اٰبَائِي اِبْرَاهِيمَ وَ اِسْحَاقَ وَ يَعْقُوبَ مَا كَانَ لَنَا اَنْ نُشْرِكَ بِاللّٰهِ مِنْ شَيْءٍ ذٰلِكَ مِنْ فَضْلِ اللّٰهِ عَلَيْنَا وَ عَلَى النَّاسِ وَ لٰكِنَّ اَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴾.(٢)

من لە سەر ئایینی باب و باپیرانمم کە حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیسحاق و حەزرەتی یەعقوبن. ئێمە خوا دەپەرستین. شەریک بۆ خوا پەیدا ناکەین، خوا ناز و نیعمەتی زۆر داوە بە ئێمە و بە خەڵک، بەڵام زۆر بە داخەوە زۆربەی خەڵک شوکرانەی خوا ناکەن دوبارە فەرمووی:

﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ اَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ اَمِ اللّٰهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾.(٣)

ئەی ڕەفیقانی من هەر لە ئێوە دەپرسم ئادەمیزاد خوایەک بپەرستێ باشترە یان چەند خوا؟ دیارە هەر خوایەک باشترە.

﴿مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ اِلَّا اَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا اَنْتُمْ وَ اٰبَاؤُكُمْ مَا اَنْزَلَ اللّٰهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ اِنِ الْحُكْمُ اِلَّا لِلّٰهِ اَمَرَ اَلَّا تَعْبُدُوا اِلَّا اِيَّاهُ ذٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾.(٤)

---

(١) یوسف: ٣٧. (٢) یوسف: ٣٨. (٣) یوسف: ٣٩.
(٤) یوسف: ٤٠.

فەرمووی: ئێوە خوا ناپەرستن، بەڵکو چەند شتێک دەپەرستن کە خۆتان و باب و باپیرتان دروستیان کردوون و ناوتان لێ ناون و خوا هیچ دەسەڵاتێکی نەداوە بەو بت و سەنەمانە، خوا ئەمری کردووە کە هەر ئەو بپەرستن و دین هەر دینی خوایە، ئینجا لە دووا ئەو هەموو پەند و ئامۆژگاری‌یە فەرمووی:

﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَمَّا أَحَدُكُمَا فَيَسْقِي رَبَّهُ خَمْراً﴾.(١)

ئەی دوو هاوڕێی بەندیخانەم تۆ کە لە خەوتدا ترێت دەگوشی و دەتکرد بە شەراب بەیانی بەر دەبی و دەچی‌یەوە سەر وەزیفەکەت دەست دەکەیەوە بە شەراب گێڕان لە مەجلیسی مەلیک ڕەیباندا. ڕووی کردە ئەوی دیشیان و فەرمووی:

﴿وَأَمَّا الْآخَرُ فَيُصْلَبُ فَتَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْ رَأْسِهِ﴾.(٢)

تۆش کە لە خەوت‌دا نانت لە سەر سەر دانا بوو تەیر و باڵندە دەهاتن دەیان خوارد، بە داخەوە لە قەنارت دەدەن و ئەوەندە بە دارەوە دەمێنی‌یەوە باڵندە دێن و مێشکی سەرت دەخۆن، کابرا کە زانی مەعنای خەونەکەی وا بۆ لێدرایەوە گوتی: من درۆم کرد هیچ خەونم نەدیوە، حەزرەتی یوسف فەرمووی:

﴿قُضِيَ الْأَمْرُ الَّذِي فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ﴾.(٣)

تازە کار لە کار ترازا و خوا قەڵەمی پێدا هێنا و درۆ بکەی یان نا هەر ئەوەیە.

﴿وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُ نَاجٍ مِنْهُمَا اذْكُرْنِي عِنْدَ رَبِّكَ﴾.(٤)

حەزرەتی یوسف ڕووی کردە ئەوەیان کە لای وا بوو بەر دەبێ و فەرمووی: لای مەلیک باسی من بکە و بڵێ کوڕێکی بێ گوناحیان گرتووە و لە زینداندایە بەڵکو ئەمر بکا و بەرم دەن. گوتی: باشە.

جا خەونەکەیان وەڕاست گەڕا و ساقی‌یەکەیان چۆوە سەرکاری خۆی و ئەوی دیشیان لە دار دا، بەڵام هەر وەکو عادەتی زوربەی خەڵک وایە ئەگەر لە ناخۆشیدا کەوتنە خۆشیانەوە خەڵکیان لە بیر دەچێتەوە.

﴿فَأَنْسَاهُ الشَّيْطَانُ ذِكْرَ رَبِّهِ فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ﴾.(٥)

---

(١) و (٢) و (٣) یوسف: ٤١. (٤) و (٥) یوسف: ٤٢.

ئەویش لە خۆشی خۆی شەیتان قسەکەی حەزرەتی یوسفی لە بیر بردەوە و تا حەوت سالآن حەزرەتی یوسف لە زیندانا مایەوە.

جا با هەر وەک حەزرەتی یەعقووبمان لە خەم و خەفەتدا بە جێ هێشت و زولەیخامان بە دڵ سووتاوی و دڵ شکاوی بە جێ هێشت حەزرەتی یوسفیش لە باوەشی گەرمی باوکیڕا و لە ماڵی عەزیزی میسر و پێش زولەیخا ڕا لە بەندیخانە بە جێ بێڵین، ئەگەر خوا یارمەتی داین سبەینێ دەچینەوە خزمەتی.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.

وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# ٣

# حەزرەتی یوسف

## باسی «حەزرەتی یوسف» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ جَمیعِ الْأَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلِینَ.

با سەرێک لە شاری میسر بدەین و بچینەوە خزمەت حەزرەتی یوسف وگوێ ڕاگرین بۆ بەشێکی دی لەو داستانە کە خوا لە قورئاندا فەرموویەتی:

﴿لَقَدْ کٰانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِی الْأَلْبٰابِ﴾.(١)

واتە لە باسی گێڕانەوەی بە سەر هاتی پێغەمبەراندا. یان حەزرەتی یوسف و برایەکانیدا پەند و ئامۆژگاری زۆر بە نرخ هەیە بۆ کەسێ خاوەن دڵ و بیر و هۆش بێ.

جا با بچینە سەر بابەتەکەمان و بڵێین کە خواوەندی گەورە ویستی یەکێک گەورە بکا، یان لە ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمەیەک ڕزگاری بکا لە پێشدا ئەسبابی بۆ ڕێک دەخا، هەر وەکو ئەگەر ئیرادە بکا تووشی ناخۆشی‌یەک بێ ڕێی لێ ون دەکا. دەڵێن: لە دووا حەوت ساڵ مانەوەی حەزرەتی یوسف لە زینداندا شەوێک پاشای میسر و فیرعەونی میسر

---

(١) یوسف: ١١١.

مەلیک ڕەییان خەونێکی زۆر عەجایبی دی، بەیانی کە هاتە بارەگا وەزیر و ووزەڕا و فاڵگرەوە و ئستێرەناس و ساحیر و زاناکانی کۆ کردەوە، هەر وەکو قورئان دەفەرمووێ:

﴿وَ قٰالَ الْمَلِكُ اِنّي اَرىٰ سَبْعَ بَقَرٰاتٍ سِمٰانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجٰافٌ وَ سَبْعَ سُنْبُلٰاتٍ خُضْرٍ وَ اُخَرَ يٰابِسٰاتٍ يٰا اَيُّهَا الْمَلَأُ اَفْتُوني في رُؤْيٰايَ اِنْ كُنْتُمْ لِلرُّؤْيٰا تَعْبُرُونَ﴾.(١)

مەلیک ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: خەڵکینە من شەو لە خەومدا حەوت گای قەڵەو لە ناو بەحرێکی وشک هاتنە دەرەوە و دووا بە دووای ئەوانیش حەوتی کزو و لەڕو و لاواز هاتن، حەوت گا قەڵەوەکەیان خواردن،کە چی هیچ زگیان گەورە نەبوو،گوتی: هەروەها لە خەوەکەمدا حەوت گووڵە گەنمی سەوز و شین هاتن و لە پاش ئەوانیش حەوت گووڵی زەرد و ووشک هاتن لە حەوتە سەوزەکەیان هاڵان و وشکیان کردن، گوتی: ئەی کۆمەڵی زانایان ئەگەر مەعنای خەونان لێک دەدەنەوە وەرن تەعبیری ئەو خەونەم بۆ لێک وەدەن، لە پاش بەینێک ڕامان و دامان زاناکان مەعنای خەونەکەیان نەزانیو گوتیان:

﴿قٰالُوا اَضْغٰاثُ اَحْلٰامٍ وَ مٰا نَحْنُ بِتَأْويلِ الْاَحْلٰامِ بِعٰالِمينَ﴾.(٢)

ئەی مەلیک ئەو خەونە خەونێکی تێکەڵە و درۆیە، ئێمە تەعبیری خەونی وا نازانین.

﴿وَ قٰالَ الَّذي نَجٰا مِنْهُمٰا وَادَّكَرَ بَعْدَ اُمَّةٍ اَنَا اُنَبِّئُكُمْ بِتَأْويلِهِ فَاَرْسِلُونِ﴾.(٣)

ساقی مەلیک کە گوێی لە خەون گێڕانەوەکەی مەلیک بوو، هەروەها کە زانی زاناکان نەیانتوانی و نەیانزانی مەعنای خەونەکە لێک وەدەن و زانی مەلیک زۆری مەتڵەبە، مەعنای خەونەکە بزانێ، لە ناکاوێک خەونەکەی خۆی و ئاشپەز و نانەوای مەلیکی وەبیر کەوتەوە کە لە زینداندا دیبویان و حەزرەتی یوسف مەعنای خەونەکەی بۆ لێک دا بوونەوە و وەڕاست گەڕا، بە پەلە چۆ بەر دەمی مەلیک و گوتی: قوربان من لە بەندیخانە لەگەڵ نانەواکەی جەنابت خەونمان دی، کوڕێک بە ناوی یوسف لەگەڵ ئێمە گیرا بوو تەعبیری خەونانی زۆر باش دەزانی، ئێمە چووینە لای خەونەکەی بۆ لێک داینەوە زۆر ڕاست دەرچوو، چۆنی گوت وا بوو، تەنانەت کە من لە بەندیخانە هاتمە دەرەوە ڕای سپاردم کە بە جەنابت بڵێم کە ئەو کوڕە بێ تاوان گیراوە، بەڵام بە داخەوە لە بیرم چۆوە عەرزت بکەم،

(١) یوسف: ٤٣. (٢) یوسف: ٤٤. (٣) یوسف: ٤٥.

ئەگەر بفەرمووی دەچم خەونەکەی بۆ دەگێرمەوە و ئەو بە ڕاستی مەعنای لێ دەداتەوە و من عەرزتان دەکەم، مەلیک گوتی: هەر ئێستا ڕامەوەستە بچۆ ئەگەر لە زیندانا ما بوو بۆی وەگیرە و جوابەکەمان زوو بۆ بێنەوە، کابرا هەستا چوو بۆ لای حەزرەتی یوسف و دووا چاک و چۆنی و نازو وگلەیی گوتی:

﴿يُوسُفُ اَيُّهَا الصِّدّيقُ اَفْتِنٰا في سَبْعِ بَقَرٰاتٍ سِمٰانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجٰافٌ وَ سَبْعِ سُنْبُلاٰتٍ خُضْرٍ وَ أُخَرَ يٰابِسٰاتٍ لَعَلّي اَرْجِعُ اِلَى النّٰاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ﴾.(١)

ئەی ئەو یوسفەی کە هەرچی فەرمووت ڕاست بوو وەڕاست گەڕا، هاتووم تەعبیری خەونی مەلیکم بۆ لێک وەدەمی کە لە خەوی‌دا حەوت گای کزو و لەڕ حەوتی قەڵەویان خواردن و حەوت گوڵەگەنمی زەرد و ووشک لە حەوتی سەوز و شین هاڵاون و لە بنیان بردون، دا بچم بۆ مەلیک و خەڵکەکەی وەگێرم، با هەم مەعنای خەونەکە بزانن هەم زانیاری و گەورەیی تۆش بزانن.

﴿قٰالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنينَ دَاَباً مِمّٰا حَصَدْتُمْ فَذَرُوهُ في سُنْبُلِهِ اِلّا قَليلاً مِمّٰا تَأْكُلُونَ﴾.(٢)

حەزرەتی یوسف فەرمووی: بچۆ پێیان بڵێ هەر وەک عادەتی ساڵان جووت وگا بکەن، کاتێک زەراعەت و خەلە و خەرمانیان پێ گەیی و درویانەوە بە ئەندازەی نانی خۆیان نەبێ گێرەی نەکەن، هەر بە گوڵەوە و بە قەڵداسووەوە هەڵی گرن و ئەمباری بکەن.

﴿ثُمَّ يَأْتي مِنْ بَعْدِ ذٰلِكَ سَبْعٌ شِدٰادٌ يَأْكُلْنَ مٰا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ اِلّا قَليلاً مِمّٰا تُحْصِنُونَ﴾.(٣)

فەرمووی: ئنجا لە دوای ئەو حەوت ساڵە حەوت ساڵ قات و قڕی و گرانی دەبێ، دەغڵ و دان دەست ناکەوێ، وەزعی ماڵی ئابوری خەڵکی دەکەوێتە خەتەرەوە، ئەوکاتە ئێوە ئەو دەغڵ و دانەی بە گوڵەوە هەڵتان گرتووە بەرە بەرە بیهێنن بەر کوتی بکەن و بیخۆن، ئەوەندە وەهێڵن کە دەی‌کەن بە تۆو.

﴿ثُمَّ يَأْتي مِنْ بَعْدِ ذٰلِكَ عٰامٌ فيهِ يُغٰاثُ النّٰاسُ وَ فيهِ يَعْصِرُونَ﴾.(٤)

---

(١) یوسف: ٤٦. (٢) یوسف: ٤٧. (٣) یوسف: ٤٨.
(٤) یوسف: ٤٩.

فەرمووی: ئنجا ساڵی دووا ئەو چواردە ساڵە ساڵێکی زۆر پڕ پیت و بەرەکەت دەبێ، باران زۆر دەبارێ، دەغڵ و دان و میوەجات زۆر دەبێ، خەڵک دەکەوێتە هەرزانی و خۆشییەوە. ساقی مەلیک هاتەوە و تەعبیری خەونەکەی بۆ مەلیک گێڕایەوە.

﴿وَ قٰالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ﴾.(١)

مەلیک مەعنای خەونەکەی زۆر بە دڵ بوو، زانی کە ئەوەی ئەو تەعبیرە بزانی زۆر عاقڵە، گوتی: بچن بۆم بانگ کەن.

﴿فَلَمّٰا جٰاءَهُ الرَّسُولُ قٰالَ ارْجِعْ اِلىٰ رَبِّكَ فَسْئَلْهُ مٰا بٰالُ النِّسْوَةِ اللّٰاتي قَطَّعْنَ اَيْدِيَهُنَّ اِنَّ رَبّي بِكَيْدِهِنَّ عَليمٌ﴾.(٢)

کاتێک پیاوی مەلیک چۆ بۆ بەندیخانە وگوتی: مەلیک مەعنای خەونەکەی زۆر بە دڵ بووە و دەیگوت: لە زیندان بێتە دەرێ و بێ بۆ لام، حەزرەتی یوسف چونکە بێ گوناح گیرا بوو، ئەو حەوت ساڵەش زۆری خەفەت خواردبوو، نەی دەویست منەتی بە سەردا بکەن و بڵێن بە پیاوەتی بەرماندا، فەرمووی: من ئاوا لە زیندان نایەمە دەرێ، بچۆوە بە مەلیک بڵێ بچن لەو ژنانە پرسیار بکەن کە زولەیخا میوانداری بۆ کردون دەستی خۆیان بڕی داخوا بۆ چی دەستی خۆیان بڕی و چ خەتایەکیان لە من چاو پێ کەوت؟ من لە زیندان نایەمە دەرێ تا بۆ مەلیک و خەڵکەکە ئاشکرا نەبێ کە من لە خۆڕا گیراوم، خوای من ئاگاداری مەکری ئەو ژنانەیە.

پیاوی مەلیک هاتەوە و ئەو قسانەی حەزرەتی یوسفی گێڕانەوە، مەلیک ئەمری کرد زولەیخا و ژنەکانی بانگ کردن و گوتی:

﴿قٰالَ مٰا خَطْبُكُنَّ اِذْ رٰاوَدْتُنَّ يُوسُفَ عَنْ نَفْسِهِ قُلْنَ حٰاشَ لِلّٰهِ مٰا عَلِمْنٰا عَلَيْهِ مِنْ سُوءٍ﴾.(٣)

بە سەرهاتی ئێوە لەگەڵ یوسف چۆن بوو؟ تەماعی لە ئێوە کرد یان ئێوە تەماعتان لە یوسف کرد؟ ژنەکان گوتیان: گەورەیی بۆ خوا ئێمە کوڕی وا بە شەرم و حەیامان نەدیوە و هیچ خەراپەیەکیشمان پێوە نەدیوە و نەمان زانیوە.

---

(١) و (٢) یوسف: ٥٠. (٣) یوسف: ٥١.

﴿قَالَتِ امْرَاَتُ الْعَزِيزِ الْآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ اَنَا رَاوَدْتُهُ عَنْ نَفْسِهِ وَ اِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ﴾.(١)

لە ناو ژنەکاندا زولەیخا خۆی بۆ ڕانەگیرا و هەستایە سەر پێ‌ی و لە کوڵی گریانی‌دا و گوتی: ئەی مەلیک بۆ لە شاهیدەکان دەپرسی ئێستا ئەوا حەق ئاشکرا بوو، یوسف هیچ خەتایەکی نەبوو، هەرچی کراوە من کردوومە، من بە گیان و دڵ عاشقی یوسف بووم و خۆم بۆ ڕانەگیرا و خۆم بۆ داگیر نەکرا بەڵام یوسف جوابی نەدامەوە و لە داخان من کارێکی وام کرد عەزیز زیندانی بکا، دانیشتوانی مەجلیسەکە لێک ڕا سەرسام بوون ودەستیان کرد بە گریان، بەڵام عەزیز زۆر خەجاڵەت بوو، زۆری پێ ناخۆش بوو، زولەیخای تەڵاق دا و زۆری نەخایاند لە داخان مرد، ئنجا ملیک کە ئەمەی دی ئەوەندەی دیش دڵی چۆ سەر حەزرەتی یوسف و ناردی‌یەوە بە دوای دا و گوتی:

﴿وَ قَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ اَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي فَلَمَّا كَلَّمَهُ قَالَ اِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ اَمِينٌ﴾.(٢)

بچن یوسف لە زیندان بێننە دەرێ و حەمام لە میشی بکەن و لیباسی جوانی لە بەر کەن و بۆم بێنن دەیکەم بە پیاوی تایبەتی خۆم.

نوێنەری مەلیک چوو کارەساتی بۆ حەزرەتی یوسف گێڕایەوە و هێنایان بۆ لای مەلیک، کە چاوی بە حەزرەتی یوسف کەوت و قسەی لەگەڵ کرد زۆری وەبەر دڵی کەوت و بە دانا و زانای هاتە پێش چاو. ڕووی کردە حەزرەتی یوسف و گوتی: ئەوا لەو ڕۆ بە دوواوە تۆم کردە پیاوی تایبەتی خۆم و لە جێگای عەزیزم دانای.

ئنجا مەلیک بە تەواوی خەونەکانی بۆ گێڕاْنەوە و فەرمووی:

﴿قَالَ اجْعَلْنِي عَلَىٰ خَزَائِنِ الْاَرْضِ اِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾.(٣)

ئەی مەلیک من بکە بە وەزیری مالی‌یە و داریی زۆر باش ئاگاداری زەڕاعەت و دەغڵ و دان دەکەم و لەو ساڵانەدا ناهێڵم بستە زەوێیک بە یار بێ و ناهێڵم کەس زوڵم لە کەس بکا و کەس لە برسان بمرێ. مەلیک حەزرەتی یوسفی کردە وەزیری مالی‌یە. «بَیْنَ

---

(١) یوسف: ٥١. (٢) یوسف: ٥٤. (٣) یوسف: ٥٥.

الْمَغْرِبِ وَ الْعِشاءِ يَفعلُ الله مٰا يَشاءُ». تا دوێنێ لە زینداندا بوو، ئیمڕۆ بوو بە عەزیزی میسر و وەزیری مالی‌یە. دوێنێ لە سەر حەسیر بوو ئەو ڕۆ چۆتە سەر سەریر.

ئنجا حەوت ساڵ لە سەریەک شەو و ڕۆژ هەدادانی نەبوو، بە سەر تەواوی جوتیارەکانی میسردا دەگەڕا، زوربەی کێڵگەکانی پێ کێڵان، ساڵ لە دووا ساڵ دەغڵ و دان و پیت و بەرەکەت زیاتر دەبوو، چەند خانوو هۆڵی گەورەی دروست کرد و پڕی کردن لە گەنم و جۆ بەکاو و دانەوە، دووا ئەو حەوت ساڵە بە قودرەتی خوا لە ناکاوێک برسی‌یەتی وگرانی و قات و قڕی ڕووی کردە سەر دنیا، کەس تێری نەدەخوارد، بە تایبەتی لە میسر و شام و فەلەستیندا زۆر گرانی و قاتی بوو. حەزرەتی یوسف دەستی کرد بە ئەمبار شکاندن و گەنم و جۆ فرۆشتن. تا پارەیان بە دەستەوە بوو بە پارە، ئنجا بە خشڵ و ئاڵتون، کە ئەویشیان بڕا بە بزن و مەڕ و حوشتر وگا و مانگا و وەڵاغە بەرزە وکەر و هێستر، لە پاشان بە ماڵ و مڵک.

ئنجا کە هیچیان بە دەستەوە نەما خۆیان ڕەهنی گەنم و جۆ دەکرد و دەبوونە عەبد و بەندەی حەزرەتی یوسف. ڕۆژێک حەزرەتی یوسف بە مەلیک ڕەییاتی گوت: دەڵێی چی سەبارەت بە و ماڵ و مڵک و خەڵکە؟ مەلیک گوتی: ئارەزووی خۆتە، چۆنت پێ چاکە وا بکە، حەزرەتی یوسف هەموو عالەمەکەی کۆ کردەوە و گوتی: ئەوا لە ڕێی خوادا ئازادم کردن و ماڵ و مڵک و پوڵ و پارە و داراییەکەم بە خۆتان بەخشیەوە. بەو کارە عەزیزی میسر واتە حەزرەتی یوسف ئەوەندەی دیش لای خەڵک عەزیزتر بوو، ناو بانگی پیاوەتی بە دنیادا بڵاو بۆوە، خەبەری دەغڵ و دانی میسر و پیاوەتی وەزیری مالی‌یەی میسر گەیشتە فەلەستین. ڕۆژێک حەزرەتی یەعقوب کە لە تاوی حەزرەتی یوسف کوێر ببوو، ئەوەندە گریا بوو شەو و ڕۆژ بە خەیاڵی ئەووەوە دەژیا. کوڕەکانی بانگ کرد وگوتی: هێندێک پارە بەرن و بچن بۆ میسر، دەڵێن لەوێ دەغڵ و دان دەست دەکەوێ و وەزیری مالی‌یەکەیان زۆر کوڕێکی عادڵە و فێڵ لە کەس ناکا. بونیامین کە کوڕە چووکەی بوو بۆ خزمەتی باوکیان بە جێیان هێشت و هەر دە براکە تەدارەکی سەفەریان گرت و سواری حوشتران بوون بەرەو وولاتی میسر کەوتنە ڕێ. کە گەیشتنە شاری میسر ئێشکچی و قەرەووڵان کە تەماشای سەر و شکڵیان کردن ڕەنگ و ڕو و لیباس و زمانیان

نەوعێک بوو، گرتنیان و بردنیان بۆ بارەگای حەزرەتی یوسف و دەرکەوان چۆ خزمەتی عەرزی کرد قوربان دە کەس هاتوون زۆر وەک یەک دەچن، دیارە غەریبن، زمانیان جۆرێکە، هاتوون بۆ خزمەت جەنابت دەفەرمووی چی و ئەمرت بە چی‌یە؟ فەرمووی: با بێنە ژوورەوە.

﴿وَ جٰاءَ اِخْوَةُ یُوسُفَ فَدَخَلُوا عَلَیْهِ فَعَرَفَهُمْ وَ هُمْ لَهُ مُنْکِرُونَ﴾.(١)

چوونە ژورەوە و سەلامیان کرد، حەزرەتی یوسف جوابی دانەوە بە خێر هاتنی کردن. کە تەماشای ڕەنگ و رووخسار و گفتو وگۆ و لیباسی کردن ناسینیەوە، بەڵام لە بەر ئەوەی زۆر لە مێژ بوو ئەوان ئەمیان نەدیبوو، گەورە ببوو، بەرگ و لیباسی گۆڕا بوو، لە کۆشکی وەزارەت‌دا بوو،نەیان‌ناسی‌یەوە،حەزرەتی یوسفیش خۆی لێ ئاشکرا نەکردن،فەرمووی: چونکە ئێوە غەریبن دوو سێ ڕۆژ میوانی منن. ئەمری کرد بردیاننە هۆدەی تایبەتی.

ڕۆژێک بانگی کردن بۆ کۆشکی وەزارەت و فەرمووی: خۆتان دەزانن من زۆرم حورمەت لێ گرتوون، حەقم هەیە پرسیارێکتان لێ بکەم، گوتیان: فەرموو، فەرمووی: ڕاستیم پێ بڵێن ئێوە کێن و چ کارەن؟ من لە ئێوە کەوتوومە شکەوە چونکە ئێوە بەو شکڵ و هەیکەل و لیباسەوە وەک جاسووسی پاشایەک دەچن، ناردبنی بۆ جاسووسی، گوتیان: ئەی عەزیزی میسر ئێمە دووازدە برا بووین، کوڕی حەزرەتی یەعقوب پێغەمبەرین، برا چووکەکەمان ناوی بونیامینە و لە خزمەت باوکماندا بۆ خزمەت کردنی بە جێمان هێشتووە، برایەکیشمان ناوی یوسف بوو لێمان ون بووە، ئێمەش دە براین ناو بانگی پیاوەتی جەنابتمان بیستووە هاتووین بۆ خزمەت تۆ بۆ گەنم کڕین و جاسوس نین، حەزرەتی یوسف فەرمووی: باشە چۆنتان باوەڕ پێ بکەم و کووا بەڵگە و شاهید لە سەر قسەکانتان؟ گوتیان: ئەی عەزیزی میسر خۆت دەزانی ئێمە غەریبین و کەس نامان ناسێ تا شاهیدی‌مان بۆ بدا، تۆ داوای شتێکی وامان لێ بکە بکرێ.

﴿وَ لَمّٰا جَهَّزَهُمْ بِجَهٰازِهِمْ قٰالَ ائْتُونِي بِاَخٍ لَکُمْ مِنْ اَبِیکُمْ اَلٰا تَرَوْنَ اَنِّي اُوفِی الْکَیْلَ وَ اَنَا خَیْرُ الْمُنْزِلِینَ﴾.(٢)

---

(١) یوسف: ٥٨. (٢) یوسف: ٥٩.

کاتێک بارە گەنمیان بۆ داگرتن فەرمووی: باشە کە چوونەوە ئەو بـرا بـاوکی یەی کـە دەڵێن بۆ خزمەتی باوکمان بە جێمان هێشتووە بیهێنن تا باوەڕتان پێ بکەم، نابینن چەندتان گەنم زیاد بۆ تێ دەکەم و چۆنم میوانداری بۆ کردن.

﴿فَإِنْ لَمْ تَأْتُونِي بِهِ فَلا كَيْلَ لَكُمْ عِنْدِي وَ لا تَقْرَبُونِ﴾.(١)

ئەگەر براکەتان نەهێنن ئەو سەفەرە گەنمتان نادەمێ و ناهێڵم بەو و وڵاتەدا بێنەوە.

﴿قالُوا سَنُراوِدُ عَنْهُ اَباهُ وَ اِنّا لَفاعِلُونَ﴾.(٢)

گوتیان: هەرچەند لامان وایە باوکمان دڵی نایە بینێری و ئیزنی نادا، بەڵام ئـێمـە زۆر کۆشش دەکەین بەڵکو دڵی نەرم بێ.

﴿وَ قالَ لِفِتْيانِهِ اجْعَلُوا بِضاعَتَهُمْ في رِحالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾.(٣)

لە کاتی بار داگرتندا بە پیاوەکانی گوت: هەر کەسە پارەکەی خۆی بۆ بـخەنەوە نـاو بارەکەی، با کە چوونەوە و پارەکەیان دۆزیەوە و چاکەی منیان بۆ ئاشکرا بوو تەماع بیان گرێ و زوو بگەڕێنەوە.

﴿فَلَمّا رَجَعُوا اِلىٰ اَبِيهِمْ قالُوا يا اَبانا مُنِعَ مِنَّا الْكَيْلُ فَاَرْسِلْ مَعَنا اَخانا نَكْتَلْ وَ اِنّا لَهُ لَحافِظُونَ﴾.(٤)

کاتێک بە خۆشی و شادی گەڕانەوە و چوونەوە خزمەت باوکیان، چاکـە و پـیاوەتی عەزیزی میسریان بۆ گێڕایەوە، گوتیان: بەڵام عەزیزی میسر وەعدەی لێ ستاندوین کە ئەو سەفەرە بونیامینیش لەگەڵ خۆمان بەرین چونکە لێمان کەوت بۆ شکەوە و گوتمان ئێمە کوڕی حەزرەتی یەعقوبین و برایەکی چوکیشمان هەیە، گوتی: ئەگەر براکەتان هێنا دەزانم ڕاست دەکەن دەنا نەدەغڵتان پێ دەفرۆشم نەدێڵم بێنە ووڵاتی میسر.

﴿قالَ هَلْ آمَنُكُمْ عَلَيْهِ اِلاّ كَما اَمِنْتُكُمْ عَلىٰ اَخيهِ مِنْ قَبْلُ فَاللّٰهُ خَيْرٌ حافِظاً وَ هُوَ اَرْحَمُ الرّاحِمِينَ﴾.(٥)

حەزرەتی یەعقوب فەرمووی: ئایا پێتان باشە بە ئەمینتان بـزانـم و تـەسلیمتان بکـەم هەروکو یوسف شتی وا ناکەم خوا ئاگاداری هەموو کار و کردەویەکـە و ڕەحـمی زۆرە

---

(١) یوسف: ٦٠. (٢) یوسف: ٦١. (٣) یوسف: ٦٢.
(٤) یوسف: ٦٣. (٥) یوسف: ٦٤.

ئومێد دەکەم ئاگاداری یوسفیشی کردبێ.

﴿وَ لَمّٰا فَتَحُوا مَتٰاعَهُمْ وَجَدُوا بِضٰاعَتَهُمْ رُدَّتْ اِلَيْهِمْ قٰالُوا يٰا اَبٰانٰا مٰا نَبْغي هٰذِهِ بِضٰاعَتُنٰا رُدَّتْ اِلَيْنٰا وَ نَميرُ اَهْلَنٰا وَ نَحْفَظُ اَخٰانٰا وَ نَزْدٰادُ كَيْلَ بَعيرٍ ذٰلِكَ كَيْلٌ يَسيرٌ﴾.(١)

کاتێک چوون بارەکانیان هەڵیچڕین و تەماشایان کرد هەموو پارەکانیان لە ناو بارە گەنمەکاندایە، لە خۆشیان هاواریان کرد و گوتیان: ئەی باوکە ئێمە کە دەمان گوت عەزیز پیاوەتی زۆر لەگەڵ کردووین درۆمان نەدەکرد، تەماشای پارەی گەنمەکەی بۆ خستووینەوە ناو بارەکان، ئەگەر بونیامینیش لەگەڵ بنێری ئەو کەرەتە زۆرتر دێنین ئاگاداری بونیامینیش دەکەین و باری وشترەکەی ئەویش زیاد دێنین.

﴿قٰالَ لَنْ اُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتّٰى تُؤْتُونِ مَوْثِقاً مِنَ اللّٰهِ لَتَأْتُنَّني بِهِ اِلّٰا اَنْ يُحٰاطَ بِكُمْ فَلَمّٰا آتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قٰالَ اللّٰهُ عَلىٰ مٰا نَقُولُ وَكيلٌ﴾.(٢)

ئنجا چونکە قەزا و قەدەر کاری گرنگ و بەسەرهاتی سەیریان بە دەستەوە بوو، حەزرەتی یەعقوب دڵی نەرم بوو، فەرمووی: ئەگەر سوێندم بۆ بخۆن بە بێ خەیانەت دەی هێننەوە و هیچی لێ ناکەن مەگەر خوانە خواستە دوژمن دەورەتان بگرێ و لە بەینتان بەرێ ئەوا دەی نێرم.

ئەوانیش سوێندیان بۆ خوارد و حەزرەتی یەعقوب فەرمووی: ئەی کوڕینە ئامۆژگاریتان دەکەم بە یەک دەروازەدا مەچنە ناو شاری میسر با بە چاوەوە نەبن.

جا با لێرەدا حەزرەتی یەعقوب بە کوێری و جەرگ بڕاوی و بە ئومێدی گەڕانەوەی کوڕەکانی بە جێ بێڵین و کوڕەکان بە ڕێ بکەین و بزانین کە عەزیزی میسریش هەر چاوەڕوانی براکانی دەکا و تا سبەینێ هەموو لایەک بە خوا بسپێرین و ئەگەر خوا یارمەتی داین بەیانی دەچنەوە خزمەتیان.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(١) یوسف: ٦٥. (٢) یوسف: ٦٦.

٤

# حەزرەتی یوسف

## باسی «حەزرەتی یوسف» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.

لە بەشی ڕابوردودا گوتمان کوڕەکان خوا حافیزیان لە باوکیان کرد و بەرە و میسر کەوتنە ڕێ.

﴿وَ لَمّٰا دَخَلُوا مِنْ حَيْثُ اَمَرَهُمْ اَبُوهُمْ﴾.(١)

کاتێک گەینە شاری میسر بە قسەی باوکیان کرد و بوونە چوار دەستە و بە هەر چوار دەروازەی شاردا چوونە ناو شار. حەزرەتی یوسف غوڵام و دەست و پێوەندی لە سەر هەر چوار ڕێیەکە دانا بوو، بۆ ئەوەی کە فەلەستینیەکان ـواتە براکانی ـهاتنەوە بیان بەن بۆ خزمەتی، پیاوەکانی کۆیان کردنەوە و بردیانن بۆ بارەگای عەزیز و عەرزیان کرد قوربان فەلەستینیەکان هاتوونەوە و یازدە کەسن ئەمرت بە چی‌یە؟ فەرمووی: با بێنە ژوورەوە.

﴿وَ لَمّٰا دَخَلُوا عَلىٰ يُوسُفَ آوىٰ اِلَيْهِ اَخٰاهُ قٰالَ اِنّي اَنَا اَخُوكَ فَلٰا تَبْتَئِسْ بِمٰا كٰانُوا يَعْمَلُونَ﴾.(٢)

---

(١) یوسف: ٦٨. (٢) یوسف: ٦٩.

کاتێک چوونە ژوورەوە سەلامیان کرد. حەزرەتی یوسف زۆر پێ خۆشحاڵ بوو، بە تایبەتی بە چاو پێ کەوتنی بونیامین ئەو پارەی کە خرا بۆوە ناو بارەکانیان لەگەڵ خۆیان بردبویانەوە، چونکە بە حەرامیان دەزانی. هەروەها مێزەرێک کە حەزرەتی یەعقوب لە حەزرەتی ئیبراهیم ڕا بە میرات بۆی مابۆوە بە دیاری بۆ عەزیزی میسری ناردبوو لە پێش عەزیزیان دانا، حەزرەتی یوسف پارەکەی دانەوە و فەرمووی: بۆ خۆتان خەرجی کەن، بەڵام کە چاوی بە مێزەرەکە کەوت لە بەر خۆیەوە دەستی کرد بەگریان و زۆری پێ خۆش بوو. ئنجا کاتی نان خواردن هات، نانیان دانا و فەرمووی: دوو دوو لە سەر یەک سینی نان بخۆن، هەموویان دوو دوو چوونە سەر سینییەک. بونیامین مایەوە، عەزیز فەرمووی: من و ئەو برا بچوکەشتان پێکەوە نان دەخۆین بونیامینی برد و چۆ هۆدەی تایبەتی خۆی و دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ بونیامین و فەرمووی: باوکت ناوی چیە و چۆنە؟ بونیامین گریا و گوتی: قوربان باوکم پێغەمبەرە و ناوی یەعقوبە، بەڵام لەوەتی یوسفی برام وون بووە لە تاوانی کوێر بووە و چۆتە ناو ژوورێکی تاریکەوە و ژیانی لە خۆی حەرام کردوە. حەزرەتی یوسف خۆی پێ داگیر نەکرا و لە هاڕەی گریانی دا و هەستا بونیامینی لە باوەش گرت و گوتی: مژدە بێ من یوسفی براتم، بونیامین لە خۆشیان بێ هۆش بوو، کە وە هوش هاتەوە حەزرەتی یوسف فەرمووی: غەم مەخۆ شوکر بۆ خوا، خوا سەدقات پاداشتی داوینەوە، لای براکان دەنگ مەکە بەڵکو بە هەر فێڵێک بێ لای خۆم بت هێڵمەوە.

﴿فَلَمَّا جَهَّزَهُمْ بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ السِّقَايَةَ فِي رَحْلِ اَخيهِ ثُمَّ اَذَّنَ مُؤَذِّنٌ اَيَّتُهَا الْعِيرُ اِنَّكُمْ لَسَارِقُونَ﴾.(١)

لە پاش سێ ڕۆژ میوانداری ئەمری کرد بەو ئاڵتونەی کە ئاوی پێ دەخواردەوە و کردبووی بە عەیارە بۆگەنم و جۆ پێ فرۆشتن بارەگەنمیان بۆ داگرن و بە ڕێیان بکەنەوە. بە نەهێنی بە پیاوەکەی گوت: بە دزیەوە کاسەکە بخاتە ناو بارەکەی بونیامینەوە، چی فەرموو،کرا و خوا حافیزیان کرد و کەوتنە ڕێ، چەند کیلۆمیتر لە شار دوور کەوتبوونەوە، وەدوایان کەوتن و بانگیان کردن ئەی کاروان چینە، مەڕۆن ئێوە دزیتان کردووە.

﴿قَالُوا وَ اَقْبَلُوا عَلَيْهِمْ مَاذَا تَفْقِدونَ﴾.(٢)

(١) یوسف: ٧٠.　(٢) یوسف: ٧١.

کە گوێیان لە بانگەوازەکە بوو ئاوڕیان دایەوە و گوتیان: چیتان لێ وون بووە؟

﴿قَالُوا نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ وَ لِمَن جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَ أَنَا بِهِ زَعِيمٌ﴾.(١)

پیاوەکانی عەزیز گوتیان: عەیارەکەی مەلیکمان وون بووە، هەر کەسێک بیداتەوە بارێکی گەنم بۆ دادەگرین. بەردەستەکەی عەزیز گوتی: من کەفیل و زامنی بارە گەنمەکە.

﴿قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُمْ مَا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي الْأَرْضِ وَ مَا كُنَّا سَارِقِينَ﴾.(٢)

گوتیان سوێند بە خوا ئێوە دەزانن ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین خەراپە بکەین و دز نین.

﴿قَالُوا فَمَا جَزَاؤُهُ إِنْ كُنْتُمْ كَاذِبِينَ﴾.(٣)

پیاوەکانی عەزیز گوتیان: ئەگەر بارەکان گەڕاین و لە ناو باری یەکێکتان دا بوو جەزای چیە؟

﴿قَالُوا جَزَاؤُهُ مَنْ وُجِدَ فِي رَحْلِهِ فَهُوَ جَزَاؤُهُ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾.(٤)

گوتیان: لە شەرعی ئێمەدا جەزای ئەوکەسەکە دزی دەکا ئەوەیە ببێتە عەبد و بەندەی خاوەن شتەکە، گوتیان: باشە.

﴿فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَاءِ أَخِيهِ ثُمَّ اسْتَخْرَجَهَا مِنْ وِعَاءِ أَخِيهِ﴾.(٥)

بەردەست و کاربەدەستەکەی حەزرەتی یوسف دەستی کرد بە بار پشکنین لە باری برا گەورەکەیانڕا دەستی کرد بە گەڕان تاگەییە سەر باری بونیامین کە پشکنیان لە ناو بارەکەی ئەو دا بوو، دەریان هێنا. براکانی کە وایان دی، زۆر خەجاڵەت بوون، لە ناو خۆیاندا تەگبیریان کرد و گوتیان: وە چاکە بگەڕێنەوە بۆ لای عەزیز و داوای لێ بکەین لە جیاتی بونیامین یەکێک لە ئێمە بگێڕێتەوە، دەنا باوکمان باوەڕمان پێ ناکا و دەڵێ ئەویشتان وەک یوسف بە فێڵ لە ناو برد، هەموویان گەڕانەوە و عەرزی عەزیزیان کرد قوربان زۆرت پیاوەتی و چاکە لەگەڵ کردوین، ئەو پیاوەتیەشمان لەگەڵ بکە، لە باتی بونیامین یەکێ لە ئێمە بگێڕەوە، حەزرەتی یوسف فەرمووی: ئاخر بە شەرعی خۆتان دروست نیە یەکێکی‌تر بگیرێ و بکرێ بە بەندەی خاوەن شتەکە، فەرمووی: تو خوا ئێوە لای خۆی خۆتان بە کوڕە پێغەمبەر دەزانن هیچ شەرم ناکەن دزی دەکەن؟

---

(١) یوسف: ٧٢. (٢) یوسف: ٧٣. (٣) یوسف: ٧٤.
(٤) یوسف: ٧٥. (٥) یوسف: ٧٦.

﴿قٰالُوا اِنْ يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ اَخٌ لَهُ مِنْ قَبْلُ فَاَسَرَّهٰا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِ وَ لَمْ يُبْدِهٰا لَهُمْ قٰالَ اَنْتُمْ شَرٌّ مَكٰاناً وَاللّٰهُ اَعْلَمُ بِمٰا تَصِفُونَ﴾.(١)

گوتیان: قوربان ئەگەر بونیامین دزیش بکا هیچ عەجایب نیە چونکە برایەکی دیشی هەبوو هەروا دز بوو، ئەو لە دایکی ئێمە نیە، حەزرەتی یوسف بە قسەکەیان زۆر تێک چوو، زۆری پێ ناخۆش بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: تەماشا چەند خەراپن، ئەو هەموو خەراپەیان لەگەڵ کردم کە چی بە دزیشم دادەنێن، لە بەر خۆیەوە فەرمووی: خۆتان دزن کە منتان لە باوکم دزی، خوا دەزانێ کە ئێوە ڕاست ناکەن، بەڵام با وابێ.

﴿قٰالُوا يٰا اَيُّهَا الْعَزِيزُ اِنَّ لَهُ اَباً شَيْخاً كَبِيراً فَخُذْ اَحَدَنٰا مَكٰانَهُ اِنّٰا نَرٰاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾.(٢)

دووبارە گوتیان: ئەی عەزیز بونیامین باوکێکی زۆر پیری هەیە و زۆری بونیامین خۆش دەوێ، ئەگەر بچینەوە و بونیامینمان پێ نەبێ ئەوەندەی دیش پەکی دەکەوێ، داوا دەکەین لە باتی ئەو یەکێک لە ئێمە بگێڕیەوە.

﴿قٰالَ مَعٰاذَ اللّٰهِ اَنْ نَأْخُذَ اِلّٰا مَنْ وَجَدْنٰا مَتٰاعَنٰا عِنْدَهُ اِنّٰا اِذاً لَظٰالِمُونَ﴾.(٣)

حەزرەتی یوسف فەرمووی: پەنا بە خوا چۆن ئەو کەسە دەگرم کە بێ گوناح بێ؟ هەر ئەوە دەکەمە بەندە کە کاسەکەی لە ناو بارەکەدا بووە، ئەگەر بە قسەتان بکەم لە ڕیزی زاڵمان لە قەڵەم دەدرێم، هەر چەند پاڕانەوە فائیدەی نەبوو.

﴿فَلَمّٰا اسْتَيْئَسُوا مِنْهُ خَلَصُوا نَجِيّاً قٰالَ كَبِيرُهُمْ اَلَمْ تَعْلَمُوا اَنَّ اَبٰاكُمْ قَدْ اَخَذَ عَلَيْكُمْ مَوْثِقاً مِنَ اللّٰهِ وَ مِنْ قَبْلُ مٰا فَرَّطْتُمْ فِي يُوسُفَ فَلَنْ اَبْرَحَ الْاَرْضَ حَتّٰى يَأْذَنَ لِي اَبِي اَوْ يَحْكُمَ اللّٰهُ لِي وَ هُوَ خَيْرُ الْحٰاكِمِينَ﴾.(٤)

کاتێک نائومێد بوون لەوە کە عەزیز جوابیان بداتەوە، چوونە گۆشەیەک دەستیان کرد بە تەگبیر کردن، براگەورەکەیان هەڵیدایە و گوتی: ئێوە نازانن و لە بیرتان نەماوە کە باوکتان سوێندی دان و خوای کردە شاهید کە ئاگاداری بونیامین بکەن و بە سەلامەتی بیبەنەوە، ئێوە دەزانن چتان بە یوسف کرد و چۆنتان لە بەین برد؟ باوکم ئێستاش برینی دڵی سارێژ

---

(١) یوسف: ٧٧. (٢) یوسف: ٧٨. (٣) یوسف: ٧٩.
(٤) یوسف: ٨٠.

نەبووە و فرمێسکی چاوانی وشک نەبوونەوە، برینێکی کەی دەر جەرگی دەکەن و جگەر گۆشەیێکی دی لێ دوور دەخەنەوە. من لەو شارە ناچمە دەرێ تا باوکم نەڵێ وەرەوە، یان خوا کارێکی وا نەکا بگەڕێمەوە، خوا لە هەموو دادگەرێک دادگەرترە.

﴿اِرْجِعُوا اِلىٰ اَبِيكُمْ فَقُولُوا يَا اَبَانَا اِنَّ ابْنَكَ سَرَقَ وَ مَا شَهِدْنَا اِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَ مَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَافِظِينَ﴾.(١)

گوتی: ئێوە بچنەوە لای باوکم و پێی بڵێن کوڕەکەت دزی کردبوو بێ ئاگاداری ئێمە، بە چاوی خۆمان دیمان کە کاسەکەیان لە ناو بارەگەنمەکەی دەر هێنا، ئەگەر وامان بزانیایە لەگەڵ خۆمان نەدەبرد. ئابڕوی مەش بەرێ، بە قسە و تەگبیری براگەورەکەیان هەر نۆ براکە گەڕانەوە بەرە و فەلەستین، لەو ماوەشدا حەزرەتی یەعقوب زۆر دڵ تەنگ بوو، هەموو ڕۆژێک پیاوێکی دەنارد سەر ڕێی کاروانی میسر بۆ ئەوەی کە هاتنەوە مژدەی بداتێ، ڕۆژێک کابرا بە غار دان هاتەوە خەبەری دایە و گوتی: قوربان هاتنەوە بەڵام هەر نۆ کوڕی تۆ لەگەڵ کاروانەکەدایە.

حەزرەتی یەعقوب زۆر ناڕەحەت بوو، کاتێک گەینەوە ماڵ و کارەساتیان بۆ باوکیان گێڕایەوە گوتیان: ئەگەر باوەڕیشمان پێ ناکەی.

﴿وَسْئَلِ الْقَرْيَةَ الَّتِي كُنَّا فِيهَا وَالْعِيرَ الَّتِي اَقْبَلْنَا فِيهَا وَ اِنَّا لَصَادِقُونَ﴾.(٢)

بۆ درۆ و ڕاستی ئێمە پیاوێک بنێرە بۆ میسر پرسیار بکا دا خوا ڕاست دەکەین یان درۆ؟ لەو کاروانیانەش پرسە کە لەگەڵمان بوون.

﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ اَنْفُسُكُمْ اَمْراً فَصَبْرٌ جَمِيلٌ عَسَى اللّٰهُ اَنْ يَأْتِيَنِي بِهِمْ جَمِيعاً اِنَّهُ هُوَ العَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.(٣)

حەزرەتی یەعقوب بەو خەبەرە برینی کۆن و نوێی تیکەڵ بوو، جارێکی دیشی جەرگ بڕا، ڕووی کردە کوڕەکان و بە تووڕەییەوە فەرمووی: ئەو قسەش هەر خۆتان سازتان کردووە، هەروە[illegible] درۆتان ساز کرد و گوتتان: گورگ خواردی، دەنا ئەگەر ئێوە پیلان و بۆ ساز نەکردبی[illegible]یز چووزانێ بونیامین دزیویەتی؟ بەڵام من سەبر

(١) یوسف: ٨١. (٢) یوسف: ٨٢. (٣) یوسف: ٨٣.

نەبێ هیچ چارەم نیە، ئومێد دەکەم خوا ڕۆژێک بێ بەو سێ کوڕەم شاد کاتەوە، خوا خۆی ئاگای لە حاڵی منیش و ئەوانیشە.

﴿وَ تَوَلّٰی عَنْهُمْ وَ قٰالَ یٰا اَسَفٰا علیٰ یُوسُفَ وَ ابْیَضَّتْ عَیْنٰاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِیمٌ﴾.(١)

بە بەسەرهاتی بونیامین حەزرەتی یوسفیشی بیر کەوتەوە، ڕووی لە کوڕەکان وەرگێڕا وگوتی: ئەی داخی گرانم بۆ یوسف، هەستا چۆوە «بیت الاحزان»ەکەیەوە و ئەوەندە گریا و مەحزوون بوو سۆمای چاوانی داهات و چاوی سپی بوون و لە دڵدا زۆر لە کوڕەکانی توڕە و قەڵس بوو، بەڵام ئاشکرای نەکرد، ڕۆژێک یەکێک لە کوڕەکان چۆ خزمەتی تەماشای کرد ئەوەندە گریاوە زەرد و زەعیف بووە و ڕەنگی ڕووانی نەماوە و چاوی ئەوەندەی دیش کوێر بوون، چۆوە بە براکانی ڕاگەیاند و چوونە خزمەتی.

﴿قٰالُوا تَاللّٰهِ تَفْتَؤُا تَذْكُرُ یُوسُفَ حَتّٰیٰ تَكُونَ حَرَضاً اَوْ تَكُونَ مِنَ الْهٰالِكِینَ﴾(٢)

دەستیان کرد بە گریان و گوتیان: ئەی باوکە لای خۆی تۆ پێغەمبەری و وەحیت بۆ دێ لای خوا، بەسە، بەس یادی یوسف بکەوە، قەسەم بە خوا ئەوەندەت یادی یوسف کردووە و دەی کەی تا خۆت نەخۆش دەکەی یان خۆت بە هیلاک دەدەی.

﴿قٰالَ اِنَّمٰا اَشْكُوا بَثّی وَ حُزْنی اِلَی اللّٰهِ وَ اَعْلَمُ مِنَ اللّٰهِ مٰا لٰا تَعْلَمُونَ﴾.(٣)

لە جوابیاندا فەرمووی: خۆ من دەردی دڵی خۆم لای ئێوە ناکەم، دەزانم لۆمەی ئێوە هەر دەردەکەم زیاد دەکا، من شکایەتی دەردی خۆم و بەیانی ناڕەحەتیم لای خوا دەکەم، ئەوەی من لە خواوە دەیزانم ئێوە نایزانن.

ڕاوی دەڵێ حەزرەتی یەعقوب لە خەودا لە حەزرەتی جوبرەئیلی پرسی داخوا یوسف ماوە یا نەماوە؟ حەزرەتی جوبرەئیل فەرمووی: تا خەونەکەی نەیەتە دی و پێک شاد نەبنەوە و براکانی کوڕنوشی بۆ نەبەن نامرێ، بۆیە حەزرەتی یەعقوب بە کوڕەکانی گوت:

﴿یٰا بَنِیَّ اذْهَبُوا فَتَحَسَّسُوا مِنْ یُوسُفَ وَ اَخیهِ وَ لٰا تَایْاَسُوا مِنْ رَوْحِ اللّٰهِ اِنَّهُ لٰا یَایْاَسُ مِنْ رَوْحِ اللّٰهِ اِلّٰا الْقَوْمُ الْكٰافِرُونَ﴾.(٤)

---

(١) یوسف: ٨٤. (٢) یوسف: ٨٥. (٣) یوسف: ٨٦.
(٤) یوسف: ٨٧.

ئەو قسانە هیچ نین، بچن لە یوسف و بونیامین بگەڕێن بەڵکو بەو زوانە خەبەریان بزانن، لە کەرەمی خوا نائومێد مەبن، ئێوە موسوڵمانن، هەر کافر لە رەحمی خوا نائومێدە. کوڕەکان بە قسەی باوکیان کرد و هەریەکە بنبارێکی شت لە حوشترەکەی هەڵبەست و لێی سوار بوو، بۆ جاری سێیەم بەرەو میسر کەوتنە رێ.

﴿فَلَمّٰا دَخَلُوا عَلَيْهِ قٰالُوا يٰا اَيُّهَا الْعَزِيزُ مَسَّنٰا وَ اَهْلَنَا الضُّرُّ وَ جِئْنٰا بِبِضٰاعَةٍ مُزْجٰاةٍ فَاَوْفِ لَنَا الْكَيْلَ وَ تَصَدَّقْ عَلَيْنٰا اِنَّ اللّٰهَ يَجْزِى الْمُتَصَدِّقِينَ﴾.(۱)

چوونە میسر و براگەورەکەیان دیەوە و چوونە خزمەت عەزیز و عەرزیان کرد قوربان، برسی‌یەتی تینی بۆ خۆمان و ماڵ و منداڵمان هێناوە، ئیستاش بە هاو و ماڵێکی زۆر کەممان پێیە، کەمی ئێمە و کەرەمی تۆ.

وەک جارەکانی پێشوو بارە گەنممان بۆ داگرە، پیاوەتیشمان لەگەڵ بکە بونیامین‌مان بدەوە، باوکی وەختە دڵی بتۆقێ لە تاوانی، خوا پاداشتی پیاو چاکان و خێرۆمەندان بە فیڕۆ نادا، کە ئەوەندە پاڕانەوە و زانی باوکی زۆر ناڕەحەتە بەزەیی هاتەوە و بونیامینی بانگ کرد و بە گریانەوە ڕووی تێ کردن و فەرمووی:

﴿قٰالَ هَلْ عَلِمْتُمْ مٰا فَعَلْتُمْ بِيُوسُفَ وَ اَخِيهِ اِذْ اَنْتُمْ جٰاهِلُونَ﴾.(۲)

ئایا دەزانن لە ڕووی نەزانینەوە چتان بە سەر یوسف و بونیامینی برای‌دا هێنا و چتان لە یوسف کرد و دڵی بونیامینتان چۆن بە دووری یوسف ئاگر تێ بەر دا؟ کە ئەو قسەیان لە عەزیز بیست وەک لە بانێک بەر دەبن سەرسام بوون و واقیان وڕ ما و بە پەشۆکاوییەوە گوتیان:

﴿قٰالُوا اَاِنَّكَ لَاَنْتَ يُوسُفُ وَ هٰذٰا اَخِي قَدْ مَنَّ اللّٰهُ عَلَيْنٰا اِنَّهُ مَنْ يَتَّقِ وَ يَصْبِرْ فَاِنَّ اللّٰهَ لٰا يُضِيعُ اَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾.(۳)

بۆ تۆ یوسفی؟ فەرمووی: یوسفم و ئەوەش بونیامینی برامە! خوا ڕەحمی پێ کردین لە بەڵای ئێوە نەجاتی داین و بە هیلاک نەچووین و گەورە و دەوڵەمەندی کردین. کەسێک خۆی لە خەراپە بپارێزی و سابیر بێ خوا ڕەنجی بە زایع نادا، براکانی لە بەر خەجاڵەتی

---

(۱) یوسف: ۸۸. (۲) یوسف: ۸۹. (۳) یوسف: ۹۰.

وەک مێژۆکێ لەرزین و سەریان بەر دایەوە و دەستیان کرد بەگریان و گوتیان:

﴿قَالُوا تَااللّٰهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللّٰهُ عَلَيْنَا وَ اِنْ كُنَّا لَخَاطِئِينَ﴾.(١)

قەسەم بە خوا خوا تۆی هەڵبژارد لە ناو ئێمەدا و بەرزی کردیەوە، ئێمە خەتابارین و زوڵممان لە ئێوە کرد، دەبێ لێمان ببوری.

﴿قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللّٰهُ لَكُمْ وَ هُوَ اَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾.(٢)

فەرمووی: تازە لۆمەتان ناکەم، خوا بتان بەخشێ، ئەو لە هەموو کەس ڕەحمی زۆرترە و بە ڕەحمترە. ئنجا حەزرەتی یوسف و براکانی پێک شاد بوونەوە و ئەمری کرد بردیانن بۆ حەمام و لیباسی تازەیان لە بەر کردن و دەعوەتێکی شاهانەی ساز کرد و پیاو ماقووڵ و گەورەکانی میسری بانگ هێشتن کرد و خەڵک لە بەسەرهاتی حەزرەتی یوسف حاڵی بوون و ئەوەندەی دیشیان لاگەورەتر و خۆشەویستر بووە.

﴿اِذْهَبُوا بِقَمِيصِي هٰذَا فَاَلْقُوهُ عَلٰى وَجْهِ اَبِي يَأْتِ بَصِيراً وَأْتُونِي بِاَهْلِكُمْ اَجْمَعِينَ﴾.(٣)

لە پاشان حەزرەتی یوسف فەرمووی: هیچ ڕا مەوەستن بڕۆنەوە ئەوکراسەی من بەرن بە سەر دەم و چاوی باوکمی دا بێنن چاوی چاک دەبنەوە، باوکم و هەمو ماڵ و منداڵ و کەس و کار و مەڕ و ماڵاتتان بێنن بۆ ئێرە، بە ئەمری حەزرەتی یوسف بە خۆشی و شادی لێ ی سوار بوون و بەرە و فەلەستین کەوتنە ڕێ.

جا با لێرەدا حەزرەتی یوسف و هەموو لایەک بە خوا سپێرین و خوا حافیزیان لێ بکەین ئەگەر خوا یارمەتی داین و ماین سبەینێ دەچینەوە خزمەتیان و هێندێکی دی لە باسی بە سەرهات و ژیانیان بۆ پەند وەرگرتن دەخوێنینەوە.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلٰى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَ عَلٰى جَمِيعِ الْاَنْبِيَاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكَاتُهُ.

---

(١) یوسف: ٩١. (٢) یوسف: ٩٢. (٣) یوسف: ٩٣.

٥

# حەزرەتی یوسف

## باسی «حەزرەتی یوسف» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.

﴿وَ لَمّٰا فَصَلَتِ الْعِيرُ قٰالَ اَبُوهُمْ اِنّي لَاَجِدُ ريحَ يُوسُفَ لَوْ لٰا اَنْ تُفَنِّدُونِ﴾.(١)

دوێنێ گوتمان: حەزرەتی یوسف بە براکانی گوت: هەستن بڕۆنەوە خزمەت باوکم و ئو کراسە بەرن بە سەر چاوانیدا بێنن چاوی چاک دەبنەوە، کوڕەکان سوار بوون و بەرەو فەلەستین بە خۆشی و شادی کەوتنە ڕێ، بۆ ئەوەی هەر چی زوتر خەبەری سەلامەتی حەزرەتی یوسف و گەیشتنی بە مەقامی وەزارەت و سەلامەتی بونیامین و مژدەی چاو چاک بوونەوە، بدەن بە باوکیان، لەم لاشەوە کە قافڵەکەی کاروانی کوڕەکان لە شاری میسر دەرکەوت حەزرەتی یەعقوب لە «بیت الاحزان»ە کەیدا بە غەمباری دانیشتبوو هاتە دەرێ و لەناو کوڕەزا و کچەزاکان و بووکەکانیدا دانیشت و لە پاشان هەستا دو رکات نوێژی کرد و دەستی کرد بە گریان، تا هێز و توانای لە بەردا بوو گریا، لە پاشان لە نکاوێک نەعرەتەیێکی

---

(١) یوسف: ٩٤.

لێدا و فەرمووی: قەسەم بە خوا من بۆنی کراسی یوسفم لە بن لووتی دێ و بۆنی دەکەم ئەگەر بە بێ عەقڵم نەزانن.

﴿قالُوا تَاللّٰهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلاٰلِكَ الْقَدِيمِ﴾.(١)

گوتیان: سوێند بە خوا تۆ هەر لە سەر گومڕاهی کۆنێ خۆتی، بەس خۆت بکوژە، تازە یوسفی چی و خەیاڵی یوسف لە سەرت دەرکە.

﴿فَلَمّٰا أَنْ جٰاءَ الْبَشِيرُ أَلْقٰاهُ عَلىٰ وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيراً قٰالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنّي أَعْلَمُ مِنَ اللّٰهِ مٰا لٰا تَعْلَمُونَ﴾.(٢)

زۆری نەخایاندا یەهوزای کوڕی بە غار دان گەیشتە جێ و مژدەی حەزرەتی یوسفی و پایە و مەقامیدا بە باوکی و حەزرەتی یەعقوب لە خۆشیان گەشکەی گرت و هەستا یەهوزای لە باوەشی گرت و فەرمووی: چ خەبەرە؟ حاڵیم کە، یەهوزا تەواوی کارەسات و بە سەرهاتی بۆ گێڕایەوە و کراسەکەیان بە سەر چاواندا هێنا بە ئەمری خوا چاوی وەک زەمانی گەنجی ڕووناک بوونەوە.

﴿قٰالُوا يٰا أَبٰانَا اسْتَغْفِرْ لَنٰا ذُنُوبَنٰا إِنّٰا كُنّٰا خٰاطِئِينَ﴾.(٣)

ئنجا کە کوڕەکان هەموویان گەینە جێ چوون دەستی باوکیان ماچ کرد و عەرزیان کرد داوای لێ بوردن دەکەین بە ڕاستی ئێمە خەتابارین.

﴿قٰالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبّي إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾.(٤)

حەزرەتی یەعقوب فەرمووی: با بچینە میسر و بزانم یوسف گەردنی ئازاد کردون جا ئەو کاتە لە خوای گەورە دەپاڕیمەوە عەفوتان بکا.

ئنجا ڕووی کردە کوڕەکان و فەرمووی: خۆتان و ماڵ و منداڵتان ئامادە بکەن، ماڵیان تێک نا و سواری حوشتران بوون و بە کەیف و ئاهەنگ بەرە و میسر کەوتنە ڕێ، ڕۆیشتن تا گەینە نزیک شاری میسر لەو لاشەوە مەلیک ڕەییان و حەزرەتی یوسف بە خۆیان و بە هەموو وەزیر و ئەمیر و زوربەی سەرباز و خەڵکی شارەوە چەند کیلۆمیتر هاتبوون بە

(١) یوسف: ٩٥. (٢) یوسف: ٩٦. (٣) یوسف: ٩٧.
(٤) یوسف: ٩٨.

پیلیانەوە، تووتەکە و باڵەبان دەشت و سەحرای پڕ کردبوو، کە لە دوورەوە چاویان بە یەکتر کەوت هەر دووک لایان دا بەزین، حەزرەتی یەعقوب و حەزرەتی یوسف کە ماوەی هەشتا ساڵ بوو لیک دوور کەوتبوونەوە، پەلاماری یەکتریان دا و یەکتریان دەباوشێ گرت و پێک شاد بوونەوە. یا خوا هەموو باوک و فرزەند و کەس و کارێک ئاوا پێک شاد وەبن، هەر یەکتریان ماچ دەکرد و دەگریان تەواوی وەزیر و ووزەرا و خەڵکەکە لە کابۆڕیاندا، دەتگوت: ڕۆژی حەشرە، ئنجا بەرە و شار کەوتنە ڕێ.

﴿فَلَمّٰا دَخَلُوا عَلىٰ يُوسُفَ آوىٰ اِلَيْهِ اَبَوَيْهِ وَ قٰالَ ادْخُلُوا مِصْرَ اِنْ شٰاءَ اللّٰهُ آمِنِينَ﴾.(١)

کاتێک گەینە «دار الحکومة» حەزرەتی یوسف باوک و دایکی لە سەر جەواهێر بەند دانان و لە خۆی نزیک کردنەوە و ڕووی کردە براکانی و گوتی: سوپاس بۆ خوا بە سەلامەتی و ئەمینی هاتینە شاری میسر بە ئومێدی خوا تازە ناخۆشی نابینین.

﴿وَ رَفَعَ اَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَ خَرُّوا لَهُ سُجَّداً وَ قٰالَ يٰا اَبَتِ هٰذٰا تَأْوِيلُ رُؤْيٰايَ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَعَلَهٰا رَبِّي حَقّاً وَ قَدْ اَحْسَنَ بِي اِذْ اَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَ جٰاءَ بِكُمْ مِنَ الْبَدْوِ مِنْ بَعْدِ اَنْ نَزَغَ الشَّيْطٰانُ بَيْنِي وَ بَيْنَ اِخْوَتِي اِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمٰا يَشٰاءُ اِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.(٢)

لە کاتێکدا کە باوک و دایکی لە سەر کورسی دانیشتبوون و براکانی بە دەستووری ئەو کاتە کوڕنوشیان بۆ حەزرەتی یوسف برد، حەزرەتی یوسف خەونەکەی زەمانی منداڵی وە بیر کەوتەوە، فەرمووی: ئەی باوکە، ئەو سوجدە بردنەی براکانم مەعنای خەونەکەمە خوا هێنایە دی، شوکر و سوپاس بۆ خوا کە ئەو هەموو چاکەی لەگەڵ من و ئێوەدا دووا ئەو هەموو بە سەرهاتە منی لە زیندان هێنایە دەرێ و ئەو پایە و مەقامەی داومێ و ئێوەی لە سەحرای فەلەستینرا هێنایە ئێرە، دوا ئەوەی کە شەیتان لە بەینی من و براکانمدا کردی، خوا خۆی دانا و زانا و حەکیمە. هەرچی ئارەزو و بکا دەیکا.

ئنجا فەرمووی:

---

(١) یوسف: ٩٩. (٢) یوسف: ١٠٠.

﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَ عَلَّمْتَنِي مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمٰوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنْتَ وَلِيِّ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِماً وَ أَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾.[١]

ئەی خوای گەورە تۆ ماڵ و موڵک و ڕوتبە و مەقامت دامێ و فێری عیلمی خەونانت کردم، ئەی ئەو کەسەی ئەرز و ئاسمانت دروست کردووە تۆ وەلی نیعمەتی منی لە دنیا و قیامەتدا، خوایە بە موسوڵمانیم بمرێنی و لەگەڵ پیاوە چاکاندا حەشرم بکەی، سوجدەی شوکری برد و لە خزمەت باوکیدا ڕای دەبوارد. ڕۆژێک باوکی دەڵێ باشە ئەوا من هەواڵی تۆم نەدەزانی ئەی تۆ بۆ هیچ نامەت بۆ من نەدەنارد و ئەحواڵت نەدەپرسیم؟ حەزرەتی یوسف فەرمووی: دا ئەو سندوقەم بۆ بێنن، کە بۆیان هێنا و سەریان هەڵپچڕی پڕ بوو لە نامە، فەرمووی: هەر کە نامەم دەنووسی و دەمویست بۆت بنێرم حەزرەتی جوبرەئیل دەهات و دەی فەرموو: سەبر بگرە خوا دەفەرموێ: وەختی لێک ئاشکرا بوون و مولاقات نەهاتووە.

﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ﴾.[٢]

ئنجا حەزرەتی یەعقوب بیست و چوار ساڵ بە خۆشی و شادی لە میسر مایەوە، تا کاتی تەواو بوو، نەخۆش کەوت، لە نەخۆشی‌یەکەیدا وەسیەتی کرد بۆ حەزرەتی یوسف، فەرمووی: هەر کاتێک مردم کفنم بکە و تەرمەکەم بەرەوە بۆ لای باوک و باپیرانم لە فەلەستین. کە وەفاتی کرد دووا شتن و کفن کردنی خستیانە ناو سندوقێکی بەردی مەڕمەڕ و حەزرەتی یوسف لەگەڵ پیاوە گەورەکانی میسر بردیان بۆ فەلەستین، بە قودرەتی خواکە گەینە فەلەستین ئەو ڕۆژە عەیسی برا گەورەی کە لە سکیک ببوون وەفاتی کرد بوو، پێکەوە تەسلیم بە خاکیان کردن، لە تەمەنێ «سەد و چل و حەوت ساڵیدا». حەزرەتی یوسف و میسریەکان گەڕانەوە بۆ میسر.

جا با تۆزێک لە باسی زولەیخا بدوێن و بزانین دڵێک کە بە وەسڵی دولبەری خۆی نەگا لە هەموو خۆشی و ناخۆشی‌یەکدا هەر وەکێکە و ئازادە، تازە غەمێکی دی داوێنی ناگرێ و خۆشی‌یەکی دی ڕووی تێ ناکا ئەگەر دنیا ببێتە دەریای خەم و خەفەت و شەپۆلی غەم

(١) یوسف: ١٠١. (٢) الرعد: ٣٨.

وەک کێو بەرز وەبن ئەوا داوێنی تەڕ نابێ و دەست لە بیری خۆی هەڵناگرێ، ئەگەر زەمانە پڕ بێ لە خۆشی و شادی ئەو ڕووی لێ وەر دەگێڕێ و بە قەد هەودا موویەک لە ئارەزوی غەمی دڵدارەکەی کەم نابێتەوە، لە پاش مردنی عەزیز زولەیخا لە تاو حەزرەتی یوسف دنیای لە پێش چاو وەک کولانە مریشک تەنگ و تاریک ببوو، ئەو زولەیخایەی کە لە ڕۆژانی بوونی لەگەڵ عەزیزدا پوڵ و پارە و سەروەت و سامان و خەزنە و جەواهێرات و زێڕ و ئەسبابی جوانی و ڕابوواردن یار و یاوەری بوو، سێبەری عەزیز چەتری سەری بوو، باڵای وەک عەرعەر بوو، ڕووی وەک مانگی شەوی چواردە دەدەرەوشا، فەخری بە سەر زەوی‌دا دەکرد لەکاتی ڕۆیشتندا، کاتێک عەزیز مرد ئەو دوکان و بازاڕەی لێ تێک چوو، خۆشەویستی حەزرەتی یوسف زۆری بۆ هێنا، خەیاڵی حەزرەتی یوسف نەبێ هاودەمی نەبوو، دڵی هێلانەی خۆشەویستی ئەو بوو، چێ‌ی هیچی دی تێدا نەدەبۆوە، سەبر و ئارامی لێ بڕا، خەو و خواردنی نەما، بە چاو فرمێسکی خوێنی دەباراند و دەگریا و دەیگوت: خۆزگە بە ئاوات و ئارەزووی خۆم دەگەیشتم دەیگوت: ئاخ نەمردووم ڕۆژی لە باتی جارێک سەد جارم دەدی، بەڵام لە خۆم لێ قەوماوی ئێستا لە هەموو لایەک بێ بەشم، دووکەڵی هەناسەی بەری ڕوناکی مانگ و ڕۆژی گرتبوو، وەکوو هەور سێبەری لە سەر کردبوو، جاری وا بوو دەی ناڵاند وکەڕەتی واش بوو بە نینۆک سەر و ڕووی خۆی دەڕنیەوە، ئەو جوانیەی نەما، زەردو و لاواز بوو، کەزیە ڕەشەکانی وەک شیری سپیان لێ هات، ئەوەندە گریا چاوی کوێر بوون، ئەو بەژن و باڵا جوانەی وەک خەدەنگی وەک ماڵی کەوان دوولا هاتبۆوە، خەیاڵی شەو و ڕۆژی هەر یادی حەزرەتی یوسف بوو، تا پارە مابوو هەر کەسێک ناوی حەزرەتی یوسفی لە لا ببردایە چنگێکی زێڕ و زیوو دەدایە، تا هیچی بە دەستەوە نەما، خەڵک کە وایان زانی باسی حەزرەتی یوسفیان لە لا نەدەکرد، زولەیخا ئاخری هاتە سەر ڕێگای حەزرەتی یوسف و لە قامیش هۆدە خانوێکی دروست کردو و شەو و ڕۆژ کار و پیشەی هەر گریان و ناڵان بوو لەو «بیت الاحزانه»دا ئێوارەیەک ڕووی کردە ئەو بتە کە دەی پەرست و گوتی: قیبلەی من، ئەوە عومرێکە دەتپەرستم، ڕوناکی چاوانم نەما، بە چاوی خۆت ئابڕو چوونی منت دی، تاکەی ئاوا بژیم و تاکەی لە جەماڵی

یوسف دوور بم، تا بەیانی ئەو شەوە گریا و قوڕی وەسەری دەکرد، کە ڕۆژ هەڵات و دەنگی سمی ئەسپی حەزرەتی یوسفی بیست، چۆ سەر ڕێگای و دەستی کرد بە گریان و ناڵە، بۆ ئەوەی حەزرەتی یوسف بە حاڵی بزانێ، بەڵام غوڵام و خزمەتکەران دەریان کرد و نەیانهێشت دەنگی بگاتە حەزرەتی یوسف، بە دڵ شکاوی گەڕایەوە و چوو بتەکەی هێنایە پێشەوە و ورد و هاڕی کرد و ڕووی کردە ئاسمان و گوتی: ئەی خوای گەورە تۆبە، تازە تۆ نەبێ کەس ناپەرستم، دڵم سوتاوە جەرگم بڕاوە بینای چاوم نەماوە، داوا دەکەم تۆبەم قبووڵ کەی و دوعام گیرا بکەی و بە جەماڵی یوسف و و بینایی چاوان شادم بکەیتەوە، ئێوارە کە حەزرەتی یوسف گەڕایەوە دووبارە چووە سەر ڕێگای و دەستی کردوە بە گریان و بە دەنگی بەرز گوتی: پاکی و خاوێنێ و گەورەیی بۆ ئەو خوایەی پاشا دەکا بە بەندە و بەندە دەکا بە پاشا، ئەو قسە لە دڵی حەزرەتی یوسفدا کاریگەر بوو، فەرمووی: ئەو پیرێژنەم بۆ بەرنە ماڵەوە تا خۆم دێمەوە، پیرێژنیان پێش خۆ دا و بردیان، عەرزی حەزرەتی یوسفیان کرد قوربان پیرێژنمان هێناوە، فەرمووی: چی دەوێ بیدەنێ، عەرزیان کرد قوربان داوای دیداری جەنابت دەکا، فەرمووی: با بێتە ژوورەوە، کە چۆ ژورەوە ئەوەندە پێ کەنی حەزرەتی یوسف سەرسام ما، فەرمووی: تۆ کێی و ناوت چی‌یە؟ پیرێژن گوتی: گەورەیی بۆ خوا من ئەوکەسەم کە تۆم دی تەواوی گەنج و گەوهەر و دڵ و گیان و سەروەت و ماڵ و جوانی خۆم وەقفی تۆ کرد، بەڵام بە داخەوە تۆ کە پایە و مەقامت چاو پێ کەوت منت لە بیر چۆوە، حەزرەتی یوسف کە زانی زولەیخایە وای بە سەر هاتووە، دەستی کرد بە گریان و فەرمووی: ئەی زولەیخا بۆ وات بە سەر هاتووە؟ کوا جەماڵ و جوانیەکەت؟ گوتی: لە دووری تۆ هەمووم لە دەست چوو، فەرمووی: ئەی بۆ وا پشتت چەمیوەتەوە؟ گوتی: لە بەر باری دووری تۆدا، فەرمووی: ئەی بۆ کوێر بووی؟ گوتی: زۆر گریام بۆ تۆ تا کوێر بووم، فەرمووی: ماڵ و سەروەتەکەت چی لێ هات؟ گوتی: هەر کەسێک ناوی تۆی لا ببردمایە چنگێکم ئاڵتون دەدایە تا تەواو بوو، فەرمووی: باشە ئێستا بۆ چی هاتووی و چی داوا دەکەی؟ گوتی: تا سوێندم بۆ نەخۆی کە بە قسەم بکەی دەنگ ناکەم و هیچ ناڵێم! فەرمووی: سوێند بە خوای حەزرەتی ئیبراهیم هەرچی داوا

بکەی و لە دەستم بێ بە قسەت دەکەم، زولەیخا گوتی: دەم هەوێ دووعام بۆ بکەی چاوم چاک وەبن و چۆنت بە جوانی دیوم ئاوام لێ بێتەوە! حەزرەتی یوسف ڕووی کردە ئاسمان و لە بەر خوا پاڕایەوە و فەرمووی: ئەی خوای گەورە خۆت دەزانی زولەیخا داوای چیم لێ دەکا. ڕاوی دەڵێ بە قودرەتی خوا ئێستا دووعاکەی تەواو نەکردبوو مووە سپیەکانی ڕەش بوونەوە، چاوی هەڵێنا و پشتی ڕاست بۆوە، لە دووا چل ساڵ بۆوە بە کچی هەژدە ساڵ، حەزرەتی یوسف کە ئەوەی دی سوجدەی شوکری برد و ڕوی کردە زولەیخا و فەرمووی: چیدی داوا دەکەی بلێ! گوتی: دەمەوێ بە وەسڵت شاد بم و مارەم کەی! حەزرەتی یوسف سەری بەردایەوە و جوابی نەدایەوە؛ لەو کاتەدا حەزرەتی جوبرەئیل هات و فەرمووی: خوا سەلامت لێ دەکا و دەفەرمووێ: بەحری بەخشایشی ئێمە بۆ زولەیخا هاتۆتە جۆش، ئێمە لە عەرش لە تۆمان مارە کردووە، تۆش دڵی مەشکێنە و مارەی کە. حەزرەتی یوسف کە ئەو نیدایەی بیست تەواوی خەڵکی شاری میسری بە مەلیک و وەزیر و فەقیر و دەوڵەمەند بانگ هێشتن کرد و بە شەرعی باب و باپیرانی زولەیخای مارە کرد، لە مانگڕا تا ماسی و لە شارا تاگەدا پیرۆزباییان لێ دەکرد، زولەیخا لە خۆشیان گەشکەی گرتبو و هەر ئەوەتا نەدەمرد، دەیگوت: دەبێ ئەوەی بە چاو دەی بینم ڕاست بێ؟ یان خەونە؟ شەوێ کە حەزرەتی یوسف پەردەی لادا و چۆ ژوورەوە زولەیخا لە خوشیان بێ هۆش بوو، لە پاشان بە بۆنی حەزرەتی یوسف وەهۆش هاتەوە و پێک شاد بوون، خواوەندی گەورە دوو کوڕ و کچێکی دانێ، کوڕەکان ناویان ئیفرائیم و میشا بوو، کچەکەش ڕەحمە بوو کە بوو بە ژنی حەزرەتی ئەیوب ماوەی چل ساڵ پێکەوە ڕایان بوارد.

شەوێک حەزرەتی یوسف لە خەوی‌دا بە خزمەت باوک و دایکی گەیشت فەرموویان زوو وەرە بۆ لامان زۆرت ئارەزوو دەکەین؟ بەیانی کە لە خەو هەستا خەونەکەی بۆ زولەیخا گێڕایەوە، زولەیخا موچڕکێکی لە بەری پێ‌ی ڕاهات لە تۆقی سەری چۆ دەرێ، دەستی کرد بە گریان و گوتی: ئەی خوای گەورە دووبارە تووشی غەم و خەفەت و دووریم دەکەیەوە؟ خوایە ئەگەر لەگەڵ یوسف نامرم با من لە پێش ئەودا بمرم. وەک شێتانی لێ هات، ڕۆژی دوایی حەزرەتی یوسف لیباسی وەزیری لە بەر کرد و سوواری ئەسپی

کوێت بوو، کە پێی چەپی نایە ئاوەزەنگی‌یەوە حەزرەتی جوبرەئیل گەیشتە لای فەرمووی: پەلە مەکە مۆڵەت نادرێ پێیەکەی کەت بخەیە ئاوەزەنگی‌یەوە، حەزرەتی یوسف چونکە بۆ خۆی دووعای مردنی کردبوو زۆری پێ خۆش بوو، لە خۆشیان دنیای لە بیر چۆوەوە، ڕوی کردە ئەوانەی لە گەڵی بوون فەرمووی: وەسیەت بێ لە زمان منەوە خوا حافیزی لە زولەیخا بکەن و گەردنی ئازاد بێ، ئەوەی گوت و حەزرەتی جوبرەئیل سێوێکی بە دەستەوە بوو دای بە حەزرەتی یوسف بۆنی پێوە کرد و لە عومری «سەد و بیستساڵیدا» وەفاتی کرد، شین و گابۆڕی خەڵکی شاری مبسر دەگەییە ئاسمانی حەوتەمین، زولەیخا کە خەبەری حەزرەتی یوسفی بیست سێ شەو و ڕۆژان بێ هۆش کەوت، کە وەهۆش هاتەوە گوتی: کوا یوسف دووبارە بێ هۆش بۆوە، کە هاتەوە سەر خۆ وەک شێتانی لێ هات هەموو سەر و پرچی خۆی ڕنیەوە و ئاخری لە تاوانی عومری درێژی‌دا بە حازریان و مرد، خەڵکی شاری میسر لە سەر جەنازەی حەزرەتی یوسف لێیان بوو بە شەڕ، هەر یەکە دەیگوت: لە گەڕەکی خۆمان دەینێژین، ئاخری قسەیان هاتە سر ئەوە خستیانە ناو سندوقیکەوە و بردیان لە ناو ئاوی نیلدا تەسلیمیان کرد بۆ ئەوەی بەرەکەتی بۆ هەموو خەڵکەکە بێ، تا زەمانی حەزرەتی مووسا دەری هێنایەوە بردی لە فەلەستین لای باوک و باپیرانی ناژتی، خوا لەوان و لە ئێمەش خۆش بێ.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِياءِ وَالْمُرْسَلينَ.
وَالسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكاتُهُ.

٦

# حەزرەتی یوسف

## چەند پەندیک لە باسی «حەزرەتی یوسف» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

﴿لَقَدْ كٰانَ فى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِى الْأَلْبابِ﴾.(١)

خواوەندی گەورە لە ئاخری سورەی «یوسف»دا فەرموویەتی:

بە ڕاستی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەراندا بە تایبەتی لە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی یەعقوب و حەزرەتی یوسف و براکانیدا پەند و عیبرەت وەرگرتن و ئامۆژگاری زۆر هەیە بۆ ئەو کەسانەی خاوەن بیر و عەقڵ و هۆشن.

دوبارە هەر لە بەرگرنگی و پڕ پەند و ئامۆژگاری‌یە کە خوای تەعالا لە ئەوەڵی هەمان سورەتدا فەرموویەتی:

---

(١) یوسف: ١١١.

﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ اَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمٰا اَوْحَيْنٰا اِلَيْكَ هٰذَا الْقُرْآنَ وَ اِنْ كُنْتَ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الْغٰافِلِينَ﴾.(١)

واتە ئێمە دەگێڕینەوە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر جوانترین چیرۆک و بەسەرهات بە هۆی نازڵ کردنی ئەو سورەتەوە کە سورەی حەزرەتی یوسفە هەرچەند تۆ لێرەوە پێش و تا ئێستاش ئەو چیرۆکەت نەبیستووە بۆ ئەوەی بۆ تۆ ببێتە موعجیزە.

﴿ذٰلِكَ مِنْ اَنْبٰاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ اِلَيْكَ وَ مٰا كُنْتَ لَدَيْهِمْ اِذْ اَجْمَعُوا اَمْرَهُمْ وَ هُمْ يَمْكُرُونَ﴾.(٢)

چونکە ئەو بەسەرهاتە بە سەرهاتێکی نەزاندراوە تا ئێستا، نە تۆ نە خەڵکی زەمانی تۆ، نەیانبیستووە، ئێمە بە وەحی تۆ ئاگادار دەکەین بیزانی، دەنا خۆ تۆ لەگەڵ براکانی یوسف نەبووی تا بزانی چۆنیان فێڵ لە حەزرەتی یەعقوبی باوکیان و یوسفی برایان کرد تا بۆ خەڵکی وەگێڕی.

جا گوێ گرینە، ئەوە چەند ڕۆژە ئێمە لە مەجلیسی حەزرەتی یەعقوب و حەزرەتی یوسف داین و بەسەرهات و کارەساتەکەمان بە تەواوی بیست. ئەگەر بە ڕاستی گوێمان دابنێ و لێیان حاڵی بوبین دەبێ هەزاران پەند و عیبرەت و ئامۆژگاریمان لێ وەرگرتبن، چونکە بە ڕاستی نەک هەر ئایەتەی، بەڵکە هەر جوملەی دەرسێکە بۆ ئینسانی ژیر لە ژیاندا و دەتوانێ بیکاتە سەرمەشقی ژیان و هەزاران خو و ڕەوشت و ئەخلاقی بەرزی لێ وەرگرێ. یەکەم پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری لە چیرۆکی حەزرەتی یوسفدا لە ئیمان و سەبر گرتنی حەزرەتی یەعقوبی باوکیدا خۆی دەنوێنێ. ئیمان بە خوا تەئسیری زۆرە لە نەفسی بنیادەمدا کەسیک ئیمانی بە خوا بوو لە بەرامبەر بەڵا و موسیبەتدا خۆڕاگر دەبێ، تەماشا حەزرەتی یەعقوب کەن کە هەواڵی پێ گەیشت و گوتیان گورگ خواردی لە هەموو کەسیشی خۆشتر دەویست بە هۆی ئیمان بە خواوە چۆنی سەبر گرت و چی جوابدایەوە؟ فەرمووی:

﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللّٰهُ الْمُسْتَعٰانُ عَلىٰ مٰا تَصِفُونَ﴾.(٣)

---

(١) یوسف: ٢. (٢) یوسف: ١٠٢. (٣) یوسف: ١٨.

سەبر گرتنی بێ لە خۆدان لە هەموو شتێک باشترە و یارمەتی هەر لە خوا داوا دەکەم بۆ ئاشکرا کردنی ئەوەی ئێوە دەی‌ڵێن.

جا چونکە حەزرەتی یەعقوب ئیمانی بە خوا بوو سەبری گرت و خوای گەورە ئاخری سەبرەکەی وەخێر گێڕا و بە دیداری حەزرەتی یوسف شاد بۆوە، هەر کەسێک بە ڕاستی ئیمانی بە خوا بێ و لە کاتی بەڵا و موسیبەتدا کوفرانی نیعمەت نەکا و سابیر بێ خوا دڵ شکاوی ناکا و ئومێد دەکەم بە دیداری ئازیز و خۆشەویستانی شاد بێتەوە، بەڵام زۆر بە داخەوە زوربەی خەڵکی ئێستا لە کاتی ناز و نیعمەتا شوکرانە ناکەن تا لە کاتی بەڵا و موسیبەتدا سابیر بن، بۆیە ڕۆژ لە دوار ڕۆژ حاڵمان ناخۆشتر و خەراپتر دەبێ، یان وەرن پەند و ئامۆژگاری لەو جوابەی وەرگرن کە کوڕەکانی لە میسر گەڕانەوە و داوای بونیامینیان کرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەستی بە پۆلو و سوتابوو، ئەو خەیانەتە گەورەی لێ دیبون سەبارەت بە حەزرەتی یوسف، لە دووا ئەوەی کە ڕازی بوو بنیامین بچێ لەگەڵیان گوتی:

﴿فَاللّٰهُ خَيْرٌ حٰافِظاً وَ هُوَ اَرْحَمُ الرّٰاحِمِينَ﴾.(١)

خوا باشترین ئاگادارە و ڕەحمی لە هەموو بە ڕەحمێک زۆرترە، یان پەند لەو فەرمایشتەی وەر گرن لە کاتێکدا غەمبار بوو، دەگریا ماڵ و خێزانی لۆمەیان دەکرد فەرمووی:

﴿اِنَّمٰا اَشْكُوا بَثّي وَ حُزْني اِلَى اللّٰهِ﴾.(٢)

بۆ لۆمەم دەکەن خۆ من دەردی دڵی خۆم و بەیانی غەمباری خۆم لای خوایەک دەکەم کە توانای بە سەر لا بردنی ناڕەحەتیەکەمدا هەیە، خۆ پەنام بۆ کەسێک نەبردووە کە هیچی بە دەست نیە.

﴿وَ لٰا تَايْاَسُوا مِنْ رَوْحِ اللّٰهِ اِنَّهُ لٰا يَايْاَسُ مِنْ رَوْحِ اللّٰهِ اِلَّا الْقَوْمُ الْكٰافِرُونَ﴾.(٣)

جا وەرن با ئێمەش ئەگەر خوا نەخواستە تووشی تەنگ و چەڵمەیەک بووین بە ئیمانەوە و پڕ بە دڵ پەنا بۆ خوا بەرین و یارمەتی لەو داوا بکەین. دووبارە با سەرنج بدەینەوە ئامۆژگاریەکەی کە بە کوڕەکانی دەفەرموو: بڕۆن پرسیارێک لە حاڵی بنیامین و یوسف بکەن.

(١) یوسف: ٦٤. (٢) یوسف: ٨٦. (٣) یوسف: ٨٧.

لە ڕەحمی خوا نائومێد مەبن، کافران نەبێ لە ڕەحمی خوا نائومێد نابن، بەڵام ناشوکری نەبێ ئێمە هەرکە تووشی ناخۆشیەک بوین دنیامان لێ ی تاریک دەبێ و نائومێد دەبین، ئەگەر پەند و عیبرەت لەو بەسەرهاتە وەرگرین نابێ وابین.

پەند و ئامۆژگارییێکی دی لە سورەی «یوسف»دا ئەوەیە کە نابێ ژن لەگەڵ پیاوی نامەحرەم هەستێ و دانیشێ، چونکە بە زۆری گوروفتاری زولەیخا بە هۆی ئەوەوە بوو کە زوربەی کات دوویە دوو لەگەڵ حەزرەتی یوسف لە ماڵەوە بوون. هەر لە بەر ئەوەشە دینی پاکی ئیسلام دەڵێ نابێ ئافرەت بە تەنیا لەگەڵ پیاوی نامەحرەمدا بێ.

دەرسێکی دی لە سورەی «یوسف»دا بو پەند لێ وەرگرتن پاک داوێنی حەزرەتی یوسفە، لە کاتێکدا حەزرەتی یوسف ئەووەڵی گەنجی و لاوی بوو، بەندە و عەبدی زولەیخا بوو، شەو و ڕۆژ پێکەوە بوون، زولەیخا عاشقی بوو، بۆ خۆی داوای لە حەزرەتی یوسف کرد، بەڵام چونکە پاک داوێن بوو، وەفادار بوو، خەیانەتی بە گەورەی خۆی نەکرد کە عەزیز بوو، لە جوابی زولیخادا فەرمووی:

«مَعَاذَ اللّٰهِ اِنَّهُ اَحْسَنَ مَثْوٰایَ.»

پەنا بە خوا من خەیانەت لەگەڵ عەزیزدا ناکەم، ئەو پیاوەتی لەگەڵ منداکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە زولەیخا زۆر جوان بوو جوابی نەدایەوە.

نەک وەک زوربەی خەڵکی ئێستا کە دە هیچ نافکرن. هەروەها تەماشا بەرزی و گەورەیی حەزرەتی یوسف بکەن کە زولەیخا و ژنە میسریەکان ترساندیان و گوتیان: ئەگەر بە قسەی زولەیخا نەکەی دەتخاتە بەندیخانەوە فەرمووی:

﴿رَبِّ السِّجْنُ اَحَبُّ اِلَیَّ مِمَّا یَدْعُونَنِي اِلَیْهِ﴾.(1)

ئەی خوای گەورە زیندان لای من خۆشترە لەوەی داوام لێ دەکەن. ئامۆژگارییێکی دیکە لە سەبری حەزرەتی یوسفدا خۆمان نیشان دەدا. تەماشا ژیانی ئەو زاتە بەرزە بکەن، هەر لە منداڵی ڕا لە باوک و دایک دوور خرایە ناو بیرەوە، براکانی چییان بە سەر هێنا، کاروانیان لە بیریان هێنایە دەری کرا بە عەبد و بەندە و فرۆشا، برا بۆ وەڵاتی غەریبی،

---

(١) یوسف: ٣٣.

تووشی داوی عیشقی زولەیخا بوو، خرایە بەندیخانەوە حەوت ساڵان لەوێدا مایەوە، بەڵام هەر سابیر بوو، ئیمانی بە قەزا و قەدەر بوو، دەیزانی هەرچی لە ناو چاوانی نوسرابێ هەر دێتە جێ، بۆیە خوای گەورە پاداشتی دایەوە، ڕوتبە و مەقامی دین و دنیای دەس کەوت و بە دیداری ئازیزانی شاد بۆوە.

جا گوێ گرینە دەبێ ئینسان وەک حەزرەتی یوسف لە ماوەی ژیانیدا سەبر بکا بە هاوڕێی شەو و ڕۆژی، چونکە ئینسان کە لە دایک دەبێ بەڵا و موسیبەت و تەنگ و چەڵەمە و خۆشی و ناخۆشی و ساغی و سەلامەتی و فەقیری و دەوڵەمەندی، لە ڕۆژی لە دایک بوونی ڕا، تا ڕۆژی مردنی هەمووی دیاری کراوە. جا ئەگەر ئینسان سابیر و خۆ ڕاگر نەبێ قەت بە ئاوات ناگا و زوو لە بەین دەچێ. ئامۆژگاریەکەی دی لە باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی یوسفدا دەست کەوتنی پاداشت و سەوابی چاکە و ئیحسانە لە دنیا و قیامەتدا، حەزرەتی یوسف چونکە خەراپەی بۆ کەس نەبوو چاکە نەبێ، بە هۆی پیاوەتی و چاکە و ئیحسانەوە خواوەندی گەورە ناز و نیعمەت و عیلم و حیکمەت و مڵک و دەوڵەتی دایە، بە پایەی وەزارەت گەیشت لە دنیادا و لە قیامەتیشدا هەر خوا خۆی دەزانی پاداشتی چاکە و پیاوەتی چەندە و چی یە؟ هە کەسێ عیبرەت و ئامۆژگاری لە باسی ژیان و بە سەرهاتی حەزرەتی یوسف وەرگرێ و چاکە و پیاوەتی هەبێ و داوێن پاک بێ خەڵک خۆشی دەوێ و ڕووی تێدەکەن و ڕێزی لێ دەگرن لە دنیادا و

﴿وَ لَاَجْرُ الْاَخِرَةِ خَيْرٌ﴾.(١)

پاداشتی دووا ڕۆژیش لە ئی دنیا زۆرترە و چاکترە.

هەروەها لە بەسەرهاتی حەزرەتی یوسفدا ئەو پەندەمان دەست دەکەوێ کە ئینسان دەبێ هەوڵ بدا بۆ ئەوەی ناوی بە خەراپە نەڕوا و شەرەف و کەرامەتی نەشکێ، هەروەک حەزرەتی یوسف کە مەلیک ڕەییان بانگی کرد و گوتی: با لە بەندیخانە بێتە دەرێ، فەرمووی: بە مەلیک بڵێ ێ تا ڕونی نەکەنەوە و نەزانن کە من بێ تاوان گیراوم، بۆ ئەوەی خەڵک نەڵێ مەلیک فووی کرد دەنا تاوانبار بوو، دووبارە لە باسی

---

(١) یوسف: ٥٧.

بەسەرهاتی حەزرەتی یوسفدا پەند و ئامۆژگارێکی دی وەر دەگرین و دەرسێکی دی فێر دەبین، ئەویش ئەوەیە کە ئینسان عەفو و چاوپۆشی و بەخشینی هەبێ، دەربارەی ئەوانەی خەراپەی لەگەڵ دەکەن، حەزرەتی یوسف لە کاتێکدا وەزیری مالیـە بـوو، دەسـەڵاتـی وەڵاتی میسری بە دەستەوە بوو، کەس بەرگری نەبوو، براکانی لە فەلەستین ڕا هاتن بۆ لای بۆ گەنم کڕین، نەیاندەزانی کە گەنم فرۆشەکە برایانە، بەڵام ئەو ئـەوانـی دەنـاسێ دەی توانی بە ئارەزووی خۆی تۆڵەیان لێ بکاتەوە و کوڵی دڵیان پـێ بـڕێژێ، بـەڵام لە بـاتی خەراپە و تۆڵە پاداشتی بە چاکە دانەوە و بارە گەنمی بە زیادەوە بۆ داگرتن و پارەکەشی بۆ خستنەوە ناو بارەکانیان. تەنانت هەر خۆشی لێ ئاشکرا نەکردن مەبادا خەجاڵەت بن و شەرم بیان گرێ.

هەروەها ئامۆژگاری‌یەکی‌تر لە سورەی «یوسف»دا ئەوەیە کە دەبێ ئینسان بە چاوێک تەماشا منداڵەکانی بکا و فەرق و جیاوازی نەخا لە بەینیاندا، چونکە منداڵ بە سروشت تورەیە، حەسوودە، چاونەزێرە، بەخیلە، پێویستی بە لاواندنەوە هـەیە، ئـەگـەر یـەکـیان وەلاوێنی و خۆ دەوانی دی نەگەیەنی لێ‌ی دەبنە دوژمن، حەزرەتی یەعقوب حەزرەتی یوسفی زۆر خۆش دەویست بۆیە براکانی حەسوودیان پێ برد و خستیانە بیرەوە.

دووبارە دەرسێکی دی لە باسی حەزرەتی یوسفدا ئەوەیە کە تا بتوانین چاک نیە دوو ژن و سێ ژن و چوار ژن بە سەر یەکەوە بێنین چونکە بە لای هێندێک لە زانایانەوە سەر چاوەی دوژمنایەتی براکانی حەزرەتی یوسف لە دایکەکانیڕا بوو، حـەزرەتی یـەعقوب وەکو لە پێشەوە بۆم باس کردن چوار ژنی هەبو و ڕاحیلی دایکی حـەزرەتی یـوسف و بونیامینی لە هەموان خۆشتر دەویست، جا بەو بـۆنـەوە هـەوێکـانی زۆریـان نـا خـۆش دەویست، ئەو ناخۆشەویستی‌یە سیرایەتی کردە سەر ئەولادەکانیشیان. دەبینین ئێستاش ئەو کەسانەی لە ژنێک زیاتریان هەیە تووشی دووبەرەکی و ناخۆشی و دوژمنایەتی دەبن و ژیان بە خۆیان و مێرد و مناڵەکانیان تاڵ دەکەن، بۆیە خـواوەنـدی گـەورە لە قـورئاندا فەرموویەتی:

﴿فَاِنْ خِفْتُمْ اَلَّا تَعْدِلُوا فَوٰاحِدَةً﴾.(١)

واتە ئەگەر لەوە ترسان کە نەتوانن دادگەر بن لەگەڵ ژناندا هەر ژنێک بێنن و مەی کەن بە جووتە.

موسوڵمانینە تا ماون لە دنیا هەر خوا پەرستی بکەن و لە سەر ناز و نیعمەت شوکرانەی خوا بکەن و لە کاتی بەڵا و موسیبەتدا سابیر و خۆڕاگر بن.

﴿اِنَّهُ مَنْ يَتَّقِ وَ يَصْبِرْ فَاِنَّ اللّٰهَ لٰا يُضِيعُ اَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾.(٢)

واتە کەسێک پەرهیزگار بێ و خۆڕاگر بێ خوا ڕەنجی بە زایع نادا.

ئەوە بوون پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری لە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی یوسفدا ئومێد دەکەم سودتان لێ وەرگرتبن. لە خواوەندی گەورە دەپاڕێمەوە عیبادەت و چاکەی هەموو لایەکمان قبووڵ بکا و لە گوناحانمان خۆش بێ و لە بەڵا و موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزێ.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(١) النساء: ٣. (٢) یوسف: ٩٠.

# حەزرەتی شوعەیب

## باسی «حەزرەتی شوعەیب» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلِینَ وَ عَلیٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِینَ.

با لەو مەجلیسەدا بچینە خزمەت شوعەیبی پێغەمبەر و گوێ بگرین بۆ باسێ بەسەرهاتی ئەو زاتە موبارکە بەڵکو خواوەندی گەورە لە ژێر سێبەری ئاڵای ئەو پێغەمبەرانەدا حەشرمان بکا، حەزرەتی شوعەیب نەوەی حەزرەتی ئیبراهیمی «خلیل‌الله»یە، لە چوار سورەتی قورئاندا بە دە جێگا باسی کراوە و ناوی براوە. دەڵێن پێغەمبەری خۆشمان درودی خوای لە سەر بێ لە حەدیسێکدا بە خەتیبی ئەنبیای ناو بردوە. چونکە زۆرگۆیا و لە سەر خۆ و هێدی ئامۆژگاری گەلەکەی دەکرد و ماندو نەدەبوو.

﴿وَ اِلیٰ مَدْیَنَ اَخٰاهُمْ شُعَیْباً قٰالَ یٰا قَوْمِ اعبُدُوا اللّٰهَ مٰا لَکُمْ مِنْ اِلٰهٍ غَیْرُهُ﴾.[1]

خوای تەعالا حەزرەتی شوعەیبی کردە پێغەمبەر و ڕەوانەی کرد بۆ سەر خەڵکی شاری مەدیەن کە پێ دەڵێن ئەرزی مەعان لە ئەطرافی شام بە لای حیجازەوەیە. خەڵکی

(١) الأعراف: ٨٥.

ئەو ناوچە زۆر دەوڵەمەند بوون بە هۆی کەسابەت و موعامەلات و بازرگانیەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ناز و نیعمەتەشدا بتپەرست بوون و خوایان نەدەپەرست و خو و ڕەوشتیان باش نەبوو، بە تایبەتی لە کڕین و فرۆشتندا زۆر حەرام خۆر و فێڵ باز بوون، کە شتیان بە خەڵک دەفرۆشت سوکیان بۆ کێشانە و پێوانە دەکردن، کە لە خەڵکیشیان دەکڕی و وەردەگرت بە گرانەوەیان دەکێشا و وەزن دەکرد. خوای گەورە حەزرەتی شوعەیب کە هەر لە خۆیان بوو کردی بە پێغەمبەر و ناردی بۆ ئامۆژگاری کردنیان، هەر وەکو لە سورەی «الأعراف»دا دەفەرمووێ: ئێمە حەزرەتی شوعەیبی برای خۆیانمان بۆ ناردن و گوتی: ئەی گەلی من خوا نەبێ کەس خواتان نیە هەر ئەو بپەرستن.

﴿قَدْ جاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ﴾.(١)

من پێغەمبەری خوام ئامۆژگاریتان دەکەم بە قسەم بکەن، دەلیل و بەڵگە و موعجیزەم زۆرن لە سەر پێغەمبەرایەتی خۆم.

یەکێک لەو موعجیزانە ئەو عەسایە بوو کە بە میرات لە باب و باپیرانیڕا دەستی کەوتبوو، لە دواییدا دای بە حەزرەتی موسا.

﴿فَاَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزانَ وَ لا تَبْخَسُوا النّاسَ اَشْياءَهُمْ﴾.(٢)

دووبارە فەرمووی: ڕەجاتان لێ دەکەم لەو ڕۆ بە دواوە تەرازو و میزانتان تەواو بێ. حەقی خەڵک بە ناتەواوی مەدەنەوە و دادگەر بن.

﴿وَ لا تُفْسِدُوا فِي الْاَرْضِ بَعْدَ اِصْلاحِها﴾.(٣)

مەردی خوا بن بەد ئەخلاقی و فەساد لە سەر زەوی بڵاو مەکەنەوە لە دوا ئەوەی کە خوا پێغەمبەری بۆ ناردن.

﴿ذٰلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ اِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾.(٤)

فەرمووی: ئەوەی من پێتان دەڵێم ئەگەر بە قسەم بکەن زۆر باشترە ئەگەر ئیمانتان بە خوا و پێغەمبەر و بەوەی پێتان دەڵێم هەبێ. هەروەها لە سەر ئامۆژگاریان دەڕۆیشت و دەیفەرموو:

---

(١) و (٢) و (٣) و (٤) الأعراف: ٨٥.

﴿وَ لٰا تَقْعُدُوا بِكُلِّ صِراٰطٍ تُوعِدُونَ وَ تَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللّٰهِ مَنْ آمَنَ بِهِ وَ تَبْغُونَهاٰ عِوَجاً﴾.(١)

زۆر عەیبە بەسە، چیدی ڕێ بە خەڵک مەگرن و مەیان ترسێنن کە دەیان هەوێ بێن بۆ لای من و موسوڵمان بن. ئێوە بۆ دەتان هەوێ ڕێگەی خوا ناسین لە خەڵک بگرن و لە ڕێ لایان دەدەن؟

﴿وَاذْكُرُوا اِذْ كُنْتُمْ قَلِيلاً فَكَثَّرَكُمْ﴾.(٢)

ئێوە یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە کۆمەڵێکی کەم بوون خوا زۆری کردن فەقیر بوون دەوڵەمەندی کردن، بێ دەسەڵات بوون ئێستا خاوەن دەسەڵاتن.

﴿وَ انْظُرُوا كَيْفَ كٰانَ عٰاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ﴾.(٣)

تەماشا ئەو گەلانە بکەن کە لە خوا پەرستن و ڕێگای حەق لایان دا خوا چی بە سەر هێنان؟ بۆ پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری و دەرس لە بەسەرهاتی ئەوان وەر ناگرن و دەست لەو بێ دینی و کارە خەراپانە هەڵ ناگرن، ناترسن ئێوەش واتان بە سەر بێ؟

﴿وَ اِنْ كٰانَ طٰائِفَةٌ مِنْكُمْ آمَنُوا بِالَّذِي اُرْسِلْتُ بِهِ وَ طٰائِفَةٌ لَمْ يُؤْمِنُوا فَاصْبِرُوا حَتّٰى يَحْكُمَ اللّٰهُ بَيْنَنٰا وَ هُوَ خَيْرُ الْحٰاكِمِينَ﴾.(٤)

فەرمووی: دیارە تازە بوونە دوو دەستە، دەستێکتان ئیمانی بە خوا و پێغەمبەر و ئامۆژگاریەکانم هێناوە و موسوڵمان بوون، دەستێکیشتان کافر و بێ دین و بێ باوەڕن، خۆ ڕاگرن تا خوا کە لە هەموو دادگەرێک دادگەرترە فەرق بخا لە بەینی ئێمە و ئێوەدا و تووشی سزا و عەزابتان دەکا.

﴿قٰالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا مِنْ قَوْمِهِ لَنُخْرِجَنَّكَ يٰا شُعَيْبُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَكَ مِنْ قَرْيَتِنٰا اَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنٰا﴾.(٥)

لە جوابی ئەو هەموو ئامۆژگاری‌یە و مەوعیزەدا پیاو ماقوڵەکانیان تووڕە بوون و گوتیان: ئەو قسانە چن؟ ئەگەر دەست لەو قسانە هەڵ نەگری خۆت و موسوڵمانەکانت دەردەکەین، یان دەبێ بڕۆن یان بێنەوە سەر دینی ئێمە.

---

(١) و (٢) و (٣) الأعراف: ٨٦. (٤) الأعراف: ٨٧. (٥) الأعراف: ٨٨.

﴿قٰالَ اَوَلَوْ كُنّٰا كٰارِهِينَ﴾.(١)

حەزرەتی شوعەیب وەسەر خۆی نەهینا و لە سەر خۆ فەرمووی: جا چۆن ئێمە دێنەوە سەرشتێک کە زۆرمان ناخۆش دەوێ یان چۆن بە زۆر دەمان بەنەوە سەر دینی خۆتان؟ قەت قبولێ ناکەین.

﴿قَدِ افْتَرَيْنٰا عَلَى اللّٰهِ كَذِباً اِنْ عُدْنٰا في مِلَّتِكُمْ بَعْدَ اِذْ نَجّٰانَا اللّٰهُ مِنْهٰا﴾.(٢)

فەرمووی: ئەگەر بگەڕێینەوە سەر دینی ئێوە مەعنای وایە درۆمان بە دەم خواوە کردوە. دووا ئەوەی کە خوا لە گومڕاهی نەجاتی داوین تازە بە ئارەزووی خۆمان ناگەڕێینەوە.

﴿وَ مٰا يَكُونُ لَنٰا اَنْ نَعُودَ فيهٰا اِلّا اَنْ يَشٰاءَ اللّٰهُ رَبُّنٰا﴾.(٣)

شایان نیە تازە بگەڕێینەوە مەگەر خوا ئارەزو بکا، کە ئەوەش قەت نابێ و ئارەزووی مەحاڵە.

﴿وَسِعَ رَبُّنٰا كُلَّ شَيْءٍ عِلْماً عَلَى اللّٰهِ تَوَكَّلْنٰا﴾.(٤)

خوای ئێمە ئاگادارە بە سەر هەموو شتێکدا و ئێمە پشتمان بە خوا بەستووە و لە شەڕی ئێوە دەمانپارێزێ.

ئنجا حەزرەتی شوعەیب کە زانی تازە موسوڵمان نابن و دەست لەو کردەوە خەراپانە هەڵ ناگرن، ڕۆژێک لە پاش دوو ڕکات نوێژ سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی:

﴿رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنٰا وَ بَيْنَ قَوْمِنٰا بِالْحَقِّ وَ اَنْتَ خَيْرُ الْفٰاتِحِينَ﴾.(٥)

ئەی خوای گەورە دووعام گیرا بکە و حوکم بکە لە بەینی ئێمە و ئەواندا و دادگەری خۆت بنوێنە، خۆ خۆت لە هەموو دادگەرێک دادگەرتری و دەزانی تازە ئیمان ناهێنن.

﴿وَ قٰالَ الْمَلَأُ الَّذينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ لَئِنِ اتَّبَعْتُمْ شُعَيْباً اِنَّكُمْ اِذاً لَخٰاسِرُونَ﴾.(٦)

لە دووا دوعاکەی حەزرەتی شوعەیب کۆمەڵێک لە کافرەکان بە گاڵتەوە ڕوویان کردە موسوڵمانەکان و گوتیان: ئەگەر وە دووا قسەی شوعەیب بکەون زەرەر دەکەن، دین و یاسا و قانوونی ئێمە باشترە. لەو کاتەدا بە ئەمری خوا حەزرەتی جوبرەئیل هات و فەرمووی:

---

(١) الأعراف: ٨٨. (٢) و (٣) و (٤) و (٥) الأعراف: ٨٩.
(٦) الأعراف: ٩٠.

خوای تەعالا دووعاکەی گیرا کردی، خۆت و ماڵ و خێزان و موسوڵمانەکان لە شار بڕۆنە دەرەوە لە بەری بەیانیدا غەزەبی خوا دەگاتە سەریان.

﴿وَ لَمَّا جٰاءَ اَمْرُنٰا نَجَّيْنٰا شُعَيْباً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنّٰا وَ اَخَذَتِ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَاَصْبَحُوا فِي دِيٰارِهِمْ جٰاثِمِينَ﴾.(١)

خوای گەورە لە سورەی «هود»دا دەفەرموێ: کاتێک غەزەبی خوا گەیبە سەریان، خوا حەزرەتی شوعەیب و موسوڵمانەکانی نەجاتدا بە ڕەحمەتی خۆی، ئێستا بە تەواوی کیلۆمەترێک زیاتر لە شار دوور نەکەوتبوونەوە کە حەزرەتی جوبرەئیل نەعرەتەیێکی لێ دا و قیژاندی بە سەر شاری مەدیەن دا و شارەکە کەوتە زەلزەلە و هەموو خەڵکی شار مردن.

﴿كَاَنْ لَمْ يَغْنَوْا فِيهٰا﴾.(٢)

دەتگوت قەت کەسی تێدا نەبووە قەت ئاوەدان نەبووە. حەزرەتی شوعەیب کە وای چاو پێ کەوت فەرمووی: ئەوەی لە دەستم هات لە پەند و ئامۆژگاریان کۆتاهیم نەکرد، بەڵام ئەوان هەر لە سەر کوفری خۆیان مانەوە تا وایان لێ هات جا چۆن پەرۆشم بن؟

ئنجا لە دووا ئەوەی کە خواوەندی گەورە خەڵکی شاری مەدیەنی بە هیلاک دا و حەزرەتی شوعەیب بە خۆی و موسوڵمانەکان رزگار بوون، خوای تەعالا حەزرەتی شوعەیبی نارد بۆ سەر ئەسحابی ئەیکەت کە بریتی‌یە لە هەرێمێکی خاوەن باغ و باغات و دار و درەخت و ئاو و کانیاو و جۆ و جۆبار و سەوزە و شیناورد لە نزیک شاری مەدیەنەوە هەروەکو خوای گەورە لە سورەی «الشعراء»دا بە درێژی بۆمان باس دەکا و دەفەرموێ:

﴿كَذَّبَ اَصْحٰابُ الْأَيْكَةِ الْمُرْسَلِينَ﴾.(٣)

درۆیان کرد پێغەمبەری خوایان وە درۆ خستەوە خەڵکی ناوچەی ئەیکەت.

﴿اِذْ قٰالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ اَلٰا تَتَّقُونَ﴾.(٤)

لەوکاتەدا کە شوعەیبی پێغەمبەر چۆ ناویان وگوتی: بۆ لە خوا ناترسن و خوا ناپەرستن؟

﴿اِنّي لَكُمْ رَسُولٌ اَمِينٌ﴾.(٥)

من پێغەمبەرێکی ئەمینم ڕەوانە کراوم بۆ سەر ئێوە و خەیانەتتان پێ ناکەم.

---

(١) هود: ٩٤. (٢) هود: ٩٥. (٣) الشعراء: ١٧٦.
(٤) الشعراء: ١٧٧. (٥) الشعراء: ١٧٨.

﴿فَاتَّقُوا اللّٰهَ وَ اَطِيعُونِ﴾.(١)

ڕو بکەنە خوا و لە غەزەبی خوا بترسن و بە قسەم بکەن.

﴿وَ مٰا اَسْئَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ اَجْرٍ اِنْ اَجْرِيَ اِلاّٰ عَلَىٰ رَبِّ الْعٰالَمِينَ﴾.(٢)

لە سەر ئەو ئامۆژگاری کردنەش داوای هیچتان لێ ناکەم پاداشتی من خوا دەمداتەوە و لە خوام دەوێ.

﴿اَوْفُوا الْكَيْلَ وَ لاٰ تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ﴾.(٣)

نمونەی ئامۆژگاریەکانی ئەوانەن، دەی‌فەرموو: شت بە تەواوی بۆ خەڵک کێشانە و پێوانە بکەن بە ناتەواویان مەدەنێ.

﴿وَزِنُوا بِالْقِسْطٰاسِ الْمُسْتَقِيمِ﴾.(٤)

بە تەرازووی حەق و ڕاست شت هەڵکێشن.

﴿وَ لاٰ تَبْخَسُوا النّٰاسَ اَشْيٰاءَهُمْ وَ لاٰ تَعْثَوْا فِي الْاَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾.(٥)

دەی فەرموو: ئامۆژگاریتان دەکەم حەقی خەڵک ناقیس مەکەن و دەست لە پیاوکوشتن و تاڵان و دزی و فەسادی هەڵگرن.

﴿وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الْاَوَّلِينَ﴾.(٦)

لەو خوایە بترسن کە ئێوە و خەڵکی پێش وەی دروست کردووە.

﴿قٰالُوا اِنَّمٰا اَنْتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ﴾.(٧)

بەڵام ئەو هەموو خۆماندوو کردنە و ئامۆژگاری‌یە هیچ سوودی نەبوو، کافرەکان لە جوابدا گوتیان: وا دیارە تۆ خەڵکی شاری مەدیەنی و لەوانەی سیحریان لێ کراوە و عەقڵیان تێک چووە بۆیە تۆ ئەو قسانە دەکەی.

﴿وَ مٰا اَنْتَ اِلّٰا بَشَرٌ مِثْلُنٰا وَ اِن نَظُنُّكَ لَمِنَ الْكٰاذِبِينَ﴾.(٨)

دەنا تۆش مرۆڤێکی وەکو ئێمەی چۆن دەبیە پێغەمبەر؟ چێت لە ئێمە زیاترە؟ لامان وایە درۆ دەکەی پێغەمبەر نی.

(١) الشعراء: ١٧٩. (٢) الشعراء: ١٨٠. (٣) الشعراء: ١٨١.
(٤) الشعراء: ١٨٢. (٥) الشعراء: ١٨٣. (٦) الشعراء: ١٨٤.
(٧) الشعراء: ١٨٥. (٨) الشعراء: ١٨٦.

﴿فَاَسْقِطْ عَلَيْنا كِسَفاً مِنَ السَّماءِ اِنْ كُنْتَ مِنَ الْصادِقِينَ﴾.(١)

گوتیان: دە ئەگەر ڕاست دەکەی پێغەمبەری خوای بە خوا بڵێ با پارچەیەکمان لە ئاسمان بە سەردا بەر وەدا و عەزابێکمان بۆ نازڵ بکا و لە بەینمان بەرێ!

﴿قالَ رَبِّي اَعْلَمُ بِما تَعْمَلُونَ﴾.(٢)

فەرمووی: خوا ئاگادارە دەزانێ کردەوەتان چیە و داوای چی دەکەن و شایانی چ غەزەبێکن لە کاتی دیاری کراودا غەزەبتان لێ دەگرێ.

﴿فَكَذَّبُوهُ فَاَخَذَهُمْ عَذابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ اِنَّهُ كانَ عَذابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾.(٣)

هەر حەزرەتی شوعەیب ئامۆژگاری کردن و ئەوان بە درۆیان خستەوە، تا خوای تەعالا غەزەبی لێ گرتن عەزابی بۆ ڕەوانە کردن، حەوت شەو و حەوت ڕۆژان گەرمای بە سەردا باراندن، تا ئاوی سەرچاوە و جۆگە و جۆبارەکانیان وەکوڵ هات و لە گەرمان ئارامیان نەما و ئەوەندەیان ئارەق کرد ئاوی لەشیشیان هاتە وشک بوون، دووا حەوت شەو و ڕۆژ هەورێکی ڕەش هاتە سەر ناوچەکەیان و لەنگەری گرت، خەڵکەکە دڵیان خۆش بوو ئاهێکیان هاتەوە بەر و بە ورد و درشتەوە ڕایان کرد بۆ بەر سێبەری هەورەکە. بەڵام بە پێچەوانە ئاوات و ئارەزووی ئەوان، هەورەکە هەوری غەزب بوو، ئاگری بە سەردا باراندن و بە تەواوی سوتان وکڵوکۆیان دامرد. پەنا بە خوا لە غەزەب و عەزابی خوا.

ئەوە بوو باسی حەزرەتی شوعەیب کە خەزوری حەزرەتی مووسا بووە، بەڵام زۆر بە داخەوە بۆمان ڕوون نەبۆوە دا خوا تەمەنی چەند بووە و چۆنی وەفات کردوە، دەڵێن گۆڕی موبارەکی لە ئاوایێکە لە دەور و بەری شاری سەفەد و سێ ڕۆژە ڕێ لە «بيت المقدس» دوورە.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِياءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكاتُهُ.

(١) الشعراء: ١٨٧. (٢) الشعراء: ١٨٨. (٣) الشعراء: ١٨٩.

# حەزرەتی ئەییوب

## باسی «حەزرەتی ئەییوب» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

سەر قافڵەی خۆ ڕاگران و شای سابیران و دەردەداران حەزرەتی ئەییوبی پێغەمبەرە درودی خوای لە سەر بێ.

با بزانین ئەو پێغەمبەرە نازدارە تووشی چ بەڵا و موسیبەتێک بوو؟ لەگەڵ ئەوەشدا چەند سابیر و خۆ ڕاگر بوو، بۆ ئەوەی ئەگەر خوا نەخواستە تووشی تەنگ و چەڵەمەیەک بوین و بەڵا و موسیبەتێکمان بە سەرهات یادی حەزرەتی ئەییوب بکەینەوە و چاو لەو بکەین تا خوای گەورە وەک حەزرەتی ئەییوب لە نەخۆشی ڕزگارمان بکا. حەزرەتی ئەییوب یەکێکە لەو پێغەمبەرانە کە خوای تەعالا لە قورئانی پیرۆزدا چوار جار ناوی بردووە، حەزرەتی ئەییوب لە ئەولادی عەیسی کوڕی حەزرەتی ئیسحاقی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمی «خلیل‌الله»یە، لە وولاتی شام لە دایک بووە، خواوەندی گەورە ماڵ و

سەروەت و سامان و دارایێکی زۆری دابویە، لە هەموو خەڵکی وڵاتی شام دەوڵەمەندتر بوو. دەڵێن ڕەحمەی کچی حەزرەتی یوسفی هێنا و چەند کوڕ و کچیان بوو، هەر بە گەنجی خوای تەعالا زوهد و تەقوا و عیبادەتی خستە دڵەوە، چاکە و پیاوەتی لەگەڵ فەقیر و غەریب و بێوەژن و هەتیو و هەژاران زۆر دەکرد، دەستی داماوانی دەگرتەوە، بێ میوان نانی نەدەخوارد، هەتیو نەبوو کراسی بۆ نەکا، شەو و ڕۆژ حەمد و سەنای خوای دەکرد، زۆر شوکرانەی ناز و نیعمەتی خوای دەکرد، خواکردی بە نەبی و لە هەموو خو و ڕەوشتێکدا لە خەڵک باشتر بوو، وای ناو بانگ کرد مەلائیکەی ئاسمان ئاواتیان بەو دەخواست و باسیان دەکرد.

ڕۆژێک لە ڕۆژان کۆمەڵێک مەلائیکە لە ناو خۆیاندا دەیان گوت: ئەو ڕۆ لە سەر پشتی زەوی کەس نییە لە حەزرەتی ئەیوب چاکتر بێ، بە تایبەتی ڕووی هەموو دەوڵەمەندێکی سپی کردۆتەوە، چونکە کەم کەس ئەگەر سەروەت و سامانیان بوو دەوڵەمەند بوون خوایان لە بیر دەمێنێ، لەم لاشەوە شەیتان کە تەماشای حاڵی حەزرەتی ئەیوبی کرد زۆر ناڕەحەت بوو، زۆری پێ ناخۆش بوو، ئینسانێکی وا هەبێ لە ئەولادی حەزرەتی ئادەم بەو جۆرە خواپەرست بێ، کوڕ و سەروەت و ماڵ و دارایی لە پیاوەتی چاکە و خواپەرستی ئەو کەم نەکەنەوە و هەمیشە ڕوو خۆش بێ لەگەڵ خەڵک و ئامۆژگاریشیان بکا. شەیتان هات هەر چەند کردی و کراندی نەی توانی بە خەتەرە و وەسوەسە هیچی لەگەڵ بکا و بۆی بە سەهو نەچوو، کە بە وەسوەسە هیچی بۆ دەگەڵ نەکرا، هات ماڵ و سەروەت و سامانی لە پێش چاوان شیرین دەکرد، فائیدەی نەبوو، زەفەری پێ نەبرد، شەیتان عەرزی بارەگای ئەقدەسی کرد و گوتی: ئەی خوای گەورە تاعەت و عیبادەت و پیاوەتی و چاکە کردنی حەزرەتی ئەیوب بە هۆی ماڵ و سەروەتی زۆری دنیاوەیە، ئەگەر سەروەت و دارایی نەمێنێ ئەو خواپەرستی و پیاوەتییەی نامێنێ، خوای تەعالا فەرمووی: ئەی شەیتان من عەبد و بەندەی خۆم باشتر دەناسم، ئەگەر هیچ ماڵ و سەروەت و کوڕیشی نەمێنێ دەست لە خواپەرستی هەڵ ناگرێ، بڕۆ ئەوا ئیزنم دای چی بە سەر دێنی بیکە و چۆنی بە تاقی دەکەیەوە بیکە، شەیتان شەیاتینی لە خۆی کۆکردنەوە و چوون لە تەوێڵە و ئاغەڵ و مۆڵەمەڕدا هەموو ئەسپ و حوشتر و بزن و مەڕەکەیان سووتاند، ئاگریان بە خەلە و

خەرمانەکەشەوە نا و سووتاندیان، شەیتان خۆی بردە سەر شکڵی پیاوێکی پیر و چوو سەلامی لە حەزرەتی ئەییوب کرد و گوتی: تۆ دەزانی هەموو سەروەت و سامانەکەت سووتا؟ حەزرەتی ئەییوب لە جوابدا فەرمووی: خوا دابووی خواش بردویەتیەوە چ قەیدی هەیە، ڕۆژێکی دی شەیتان خۆی بردە سەر ڕەنگی مامۆستای کوڕەکانی حەزرەتی ئەییوب و بانگ هێشتی کردن و خانووەکەی بە سەردا ڕوخاندن و خۆی نەبێ هیچیان دەر نەچوون، دەربەڕی و چو بۆ لای حەزرەتی ئەییوب وگوتی: هاوار بە ماڵم ئەو ڕۆ کوڕەکانم دەعوەت کردن، من بۆ ئیشێکی تایبەتی چومە دەرێ تا چوومەوە خانووەکەیان بە سەردا ڕووخا بوو یەکیان دەرنەچوو. حەزرەتی ئەییوب هەرچەند لە تاوی کوڕەکانی دڵی وەک مەنجەڵ دەکوڵی، بەڵام وە سەر خۆی نەهێنا و فەرمووی: ئەمانەتی خوا بوون خوا بردنیەوە و شەهیدن، ئەگەر تۆش باش بویتایە دەرنەدەچووی.

ڕاوی دەڵێ شەیتان بە ڕووڕەشی و خەسارەتمەندی گەڕایەوە و عەرزی بارەگای ئەقدەسی کرد و گوتی: ئەی خوای گەورە بە نەمانی ماڵ و ئەولاد هیچم بۆ لەگەڵ نەکرا، چونکە بەدەنی ساغە دەربەست نیە، ئومێدی بە کەرەمی تۆ زۆرە، دەڵێ خوا خاوەن دەسەڵاتە، دەتوانی ماڵ و سەروەت و کوڕی باشتر و زیاترم بداتێ، ئەگەر ڕوخسەتم بدەی تووشی نەخۆشی بکەم هۆشی خوا پەرستی نامێنێ.

جا بۆ ئەوەی حەزرەتی ئەییوب ببێتە جێگای سەرنج ڕاکێشانی خەڵک و دەرس و پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری لێ وەرگرن و تەواوی نەخۆش و بریندار و دەردەدار بە یادی سەبری ئەییوبەوە سەبر بگرن و چاوەڕوانی شیفای دەردەکەیان بن و ببێتە مامۆستای خۆڕاگران و سابیران و پشت بە پشت خەڵک بۆ یەکتری وەگێڕن، خوای تەعالا فەرمووی: ئەی شەیتان بڕۆ ئەوا ئیزنم دای و نەخۆشیم دایە دەس تۆ، بەڵام بە لای دڵ و زمان و روح و عەقڵیەوە نەچی! ئەوانە جێی ئەسراری ئیمانن.

ڕاوی دەڵێ بە ئەمری خوا ڕۆژێک حەزرەتی ئەییوب لە میحرابدا لە سوجدەدا بوو، شەیتان هات بە هەناسەی پیسی خۆی فوییێکی لە حەزرەتی ئەییوب کرد و تووشی نەخۆشی گولی و سەودایی بوو، زۆری پێ نەچوو کرمەڕێژ بوو، کەس نەدەچوو بە لای‌دا ڕەحمەی ژنی نەبێ، خەڵک لە ناو خۆیاندا دەستیان کرد بە باس کردنی و قسە پێ گوتنی.

یەکێک دەیگوت: ئەوە خوا خۆشی دەوێ بۆیە تووشی ئەو نەخۆشیە بووە. یەکێ تر دەیگوت: ئەو هەموو خواپەرستی‌یە فریای نەکەوت. هێندیکیان دەیانگوت: دەبێ گوناحێکی زۆر گەورەی کردبێ دەنا خوا ئاوای ماڵ وێران و دەردەدار نەدەکرد. ئاخری چوون بە ڕەحمەی خێزانیان گوت: دەبێ دوری خەیتەوە، زۆر دەترسین ماڵ و منداڵمان لێ‌ی بگرنەوە. ڕەحمەی خێزانی زۆر بە وەفا بوو، بەو حاڵەش هەر خزمەتی دەکرد. لە کۆڵی کرد و بردیە کەلاوە کۆنێک دای‌نا، بەو حاڵەش شەیتان لە کۆڵی نەدەبۆوە وەسوەسەی دەدا. هەر وەکو خوارەندی گەورە لە سورەی «ص»دا بۆمان باس دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَاذْكُرْ عَبْدَنَا اَيُّوبَ اِذْ نَادٰى رَبَّهُ اَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَ عَذَابٍ﴾.(١)

ئەی پێغەمبەر لە کاتی تەنگانە و ناڕەحەتیدا یادی عەبد و بەندەی ئێمە ئەیوب بکەوە، وەختێک کرمەڕێژ بو بو شەیتان دەستی لێ هەڵ نەگرت، وەسوەسە و خەیاڵ و خەتەرەی دەخستە دڵەوە، بەڵام ئەو هەر هاواری خوای دەکرد و دەیگوت: ئەی خوای گەورە! ئاگادارم بە، شەیتان ناڕەحەتم دەکا و عەزابم دەدا، هەزار ئافەرین بۆ ڕەحمەی خێزانی و هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی کە بە ڕۆژ کاری دەکرد و دەهاتەوە دەرخواردی حەزرەتی ئەیوبی دەدا و شەو تا بەیانی بە دیاریەوە دەبوو، شەیتان وەخت بوو لە داخی ئەو ژن و مێردە بمرێ.

ڕۆژێک هەموو شەیاتینی کۆکردنەوە و گوتی: من سەرم لە حاڵی ئەو ژن و مێردە سوڕ ماوە، ماڵ و سەروەت و ئەولادم لە بەین بردن، ئەیوبم تووشی ئەو دەردە کرد، کە چی دەست لە شوکری خوا و سەبر و شوکر هەڵناگری. گوتیان: ئەی باوکە گەورەی ئێمە تۆ ئادەمت بە چ فێڵێک لە بەهەشت دەرکرد بەو فێڵەش ئەیوب بە سەهوو بەرە، گوتی: ڕاست دەکەن ئادەمم بە هۆی حەواوە بە سەهو برد، با بچم بۆ لای ڕەحمەی خێزانی و بزانم بە هۆی ئەوەوە لە خشتەی نابەم، هەستا خۆی بردە سەر شکڵی پیاوێکی پیر و سەلامی لە ڕەحمە کرد و گوتی: کوا مێردەکەت؟ ئەویش بە گریانەوە گوتی: ئەوەتا حاڵی ئاوایە کە دەیبینی، نەوەیە بمرێ و نەوەیە چاک وەبێ، شەیتان ئەوەندەی باسی زەمانی گەنجی و لاوی و ساغ و سەلامەتی حەزرەتی ئەیوبی بۆ کردو ماڵ وسەروەت وکوڕەکانی

(١) ص: ٤١.

خستەوە بیر، تا دەستی کرد بە گریان و هەستا چوو بە لای حەزرەتی ئەیوبەوە گوتی: ئەرێ پێم ناڵێیت تا کەی خوا عەزابت دەدا؟! نە ماڵت ما، نەئەولاد، نە دۆست دێ بە لاتەوە، نە کەس و کار و خزم و ڕەفیق، نە گەنجیت ما، نە گەورەیی، حەزرەتی ئەیوب فەزمووی: دیارە شەیتان بە سەهووی بردوی ئەو قسانە دەکەی، گوتی: باشە ئەی بۆ دووعا ناکەی خوا چاکت کاتەوە؟ فەرمووی: زۆرم بە سەلامەتی ڕابواردووە بەڵام ئەوە حەوت ساڵە نەخۆشم حەیا دەکەم لە خوا داوای چاک بوونەوە بکەم. فەرمووی: وادیارە تۆ ئیمانت زەعیف بووە بە قەزا و قەدەر خوا، تووڕە بوو سوێندی خوارد و گوتی: ئەگەر خوا ڕەحمی کرد و چاک بوومەوە، شەرت بێ سەد دارت لێ دەم، فەرمووی: ئەوا لە سەر خۆشم حەرام کرد تازە بە دەستی تۆ نان ناخۆم و داوای هیچت لێ ناکەم، برۆ لە پێش چاوانم تا بزانین خوای گەورە چ دەکا: دایکە «ڕەحمە» ڕەحمەتی خوای لێ بێ بە دڵی پڕ گریانەوە بەرەو ئاوایی ڕۆیشت حەزرەتی ئەیوب کە خۆی بە تەنهایی دی و کەس نەما خزمەتی بکا و دەردەکەشی ساعەت بە ساعەت گرانتر دەبوو، گریا و بەزەیی بە خۆیدا هاتەوە هاواری خوای کرد و گوتی: ئەی خوای گەورە:

﴿اَنّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَ اَنْتَ اَرْحَمُ الرّٰاحِمينَ﴾.(١)

ئازار بە دڵم گەییوە تۆش لە هەموو کەست زیاتر بەزەیت بە بەندەگاندا دێتەوە کەیفی خۆتە.

﴿فَاسْتَجَبْنٰا لَهُ فَكَشَفْنٰا مٰا بِهِ مِنْ ضُرٍّ﴾.(٢)

خوا دەفەرموێ: فەوری دووعاکەمان گیرا کرد و بەڵاکەمان لە سەر لا برد و بە هۆی حەزرەتی جوبرەئیلەوە پێمان گوت:

﴿اُرْكُضْ بِرِجْلِكَ هٰذٰا مُغْتَسَلٌ بٰارِدٌ وَ شَرٰابٌ﴾.(٣)

پێ بدە بە زەوی‌دا، کە قاچی لە ئەرز دا ئاوێکی جوان و ساف و سارد و شیرین هەڵ قوڵی، حەزرەتی جوبرەئیل فە[illegible]ی: خوا دەفەرموێ: لەو ئاوە خۆی بشوا، خۆی شت، بە ئەمری خوا بەدەنی وە[illegible]اک بۆوە و فەرمووی: بی‌خۆوە! خواردیشیەوە برینی دەرونیشی سارێژ بوو، سوجدەی شو[illegible]ی برد و هەستا بەرەو ئاوایی کەوتە ڕێ، ڕۆیشت

(١) الأنبیاء: ٨٣. (٢) الأنبیاء: ٨٤. (٣) ص: ٤٢.

تا گەیيە سەر پردێک تووشی ئافرەتێک بوو دەگریا و هاواری دەکرد فەرمووی: ئەی زەعیفە چیت لێ قەوماوە؟ ڕەحمە خان هات بە لایەوە گوتی: بە قوربانت بم، مێردەکەم بە نەخۆشی لە فلان کەلاوەدا کەوتبوو، تا هاتمەوە لەوێ نەما بوو، جا نازانم گورگ خواردوویەتی؟ چی لێ بە سەر هاتووە وەختە لە تاوانی شێت بم، فەرمووی: باشە مێردەکەت چ نەخۆشی‌یەکی بوو؟ ناوی چیە؟ گوتی: بە سەدەقەت بم لێت بە دوور بێ نەخۆشی‌یەکەی زۆر خەراپ بوو بۆ گێڕانەوە نابێ، ناویشی ئەییوب بوو پێغەمبەری خوا بوو، فەرمووی: باشە بە ساغی وەک کێ دەچوو؟ خاتو ڕەحمە تەماشای کابرای کرد و گوتی: واللە وەک تۆ دەچووە تۆ دەڵێی هەوی. ئنجا حەزرەتی ئەییوب خۆی ئاشکرا کرد و بە یەکتر شاد بوونەوە و شوکرانەی خوایان کرد و چوونەوە خانوە کۆنەکەیان. لەو کاتەدا بە ئەمری خوا حەزرەتی جوبرەئیل هات وەک قورئان دەفەرمووێ:

﴿وَ وَهَبْنٰا لَهُ اَهْلَهُ وَ مِثْلَهُمْ مَعَهُمْ رَحْمَةً مِنّٰا وَ ذِكْرىٰ لِأُولِى الْأَلْبٰابِ﴾.(١)

خێزانەکەمان بۆ گەنج کردەوە و کوڕەکانمان بۆ زیندو کردنەوە و ئەوەندەی دیشمان ماڵ و سەروەت و سامان دایە بە ڕەحمەتی خۆمان، بۆ ئەوەی ببێتە هۆی یاد کردنەوە و هەتا دنیا هەیە بە داستان بگێڕنەوە و ئەوانەی خاوەن عەقڵ و بیر و هۆشن پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری لێ وەرگرن.

حەزرەتی ئەییوب ویستی بۆ ئەوەی سوێندی لێ نەکەوێ سەد دارەکە لە ڕەحمەخان بدا، خواوەندی گەورە حەزرەتی جوبرەئیلی نارد و فەرمووی: بە ئەییوب بڵێ:

﴿وَ خُذْ بِيَدِكَ ضِغْثاً فَاضْرِبْ بِهِ وَ لاٰ تَحْنَثْ﴾.(٢)

وەرە سەد شوڵک و تووڵەداری باریک پێکەوە ببەستە و لە خێزانەکەتیان ڕاکێشە تا سوێندەکەت لێ نەکەوێ و ئەزیەتیش بە ڕحمەخانی ژنت نەگا چوونکە زۆر بە عەهد و وەفا بو و لەگەڵت با دڵی نەشکێ.

﴿اِنّٰا وَجَدْنٰاهُ صٰابِراً نِعْمَ الْعَبْدُ اِنَّهُ اَوّٰابٌ﴾.(٣)

خوا دەفەرمووێ: ئێمە حەزرەتی ئەییوبمان بە تاقی کردەوە باشترین بەندە بوو کە خۆی ڕاگرت بۆ بەڵا وموسیبەت و تەنگ و چەڵەمە و هەر باشتری زکری خوا دەکرد و

(١) ص: ٤٣. (٢) ص: ٤٤. (٣) ص: ٤٤.

ناشوکر نەبوو زیاتر لە خوا دەترسا و لە بەر خوا دەپارایەوە.

گوێگرینە لە باسی ژیانی و بەسەرهاتی پێشەوای سابیران و خۆڕاگران و دەردەداران حەزرەتی ئەییوب پێغەمبەردا ئەو ئامۆژگاریەمان دەست دەکەون .

یەکەم دبێ ئینسانی موسوڵمان چاو لە حەزرەتی ئەییوب بکا، هەر وەک لە کاتی سەروەت و خۆشی و سەلامەتیدا دەبێ شوکرانەی نیعمەتی بکا. لە وەختی تەنگ و چەڵەمە و فەقیری و نەخۆشی و بەڵا و موسیبەتیشدا خۆڕاگر و سابیر بێ. دووەم ئینسان نابێ وا بزانێ بەڵا و موسیبەت و فەقیری نیشانەی خەراپی ئینسانە، خۆ حەزرەتی ئەییوب پێغەمبەری خوا بوو، خەراپ نەبوو، ئەی بۆ تووشی ئەو دەردە گەورە و گرانە بوو؟ سێیەم دەبێ بزانین کە بەڵا بۆ تاقی کردنەوەی ئادەمیزادە. چوارەم زانیمان کە سەبر و خۆ ڕاگرتن خوڵق و خو و ڕەوشتی پێغەمبەرانە. پینجەم دەبێ ئینسان لە کاتی بەڵادا پەنا بۆ خوا بەرێ ولە بەر خوا وەپاڕێ.

شەشەم لە ئایەتەکەدا کە خوا فەرمووی: لەو ئاوە خۆت بشۆ و بیخۆوە ئەوەمان دەست دەکەوێ کە دەواو دەرمان بە ئەمری خوا دەبنە هۆی چاک بوونەوە لە نەخۆشی، هەر وەک بە زاهیری ئاوەکە بۆ حەزرەتی ئەییوب بوو بە شیفا. حەوتەم دەبێ پیاو بە وەفا بێ و بێ وەفا نەبێ، بە تایبەتی لەگەڵ ژن کە شەو و ڕۆژ لەگەڵتایە، ئەگەر هەڵەیەکیشی کرد دەبێ لێ ی ببووری، چونکە خوا فەرمووی: لە باتی سەد دار سەد تووڵی باریک بە سەر یەکەوە و بە یەک کەڕەت لە ڕەحمەخان بدە، ئنجا حەزرەتی ئەییوب لە تەمەنی نەوەدو سێ ساڵیدا وەفاتی کرد و گۆڕی موبارەک و پیرۆزی بە ڕیوایەتێک لە وولاتی شامە.

ئەوە بوو باسی ژیان و بەسەرهاتی سەردەستەی سابیران و پێشەوای خۆ ڕاگران حەزرەتی ئەییوب. ئومێد دەکەم پەند لە ژیانی وەرگرن و لە سەر بەڵا و موسیبەت سابیر و خۆڕاگر بن تا خوا پاداشتان بداتەوە بە ئاوات بگەن.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلينَ.

وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

١

# حەزرەتی مووسا

## باسی «حەزرەتی مووسا» سەلامی خودای لە سەر بێ

بسم الله الرحمن الرحيم

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

با بۆ باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی مووسای پێغەمبەر گوێ ڕاگرین و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین. حەزرەتی مووسا کوڕی عیمرانی کوڕی فاهیتی کوڕی لاوی کوڕی حەزرەتی یەعقووبی کوڕی حەزرەتی ئیسحاقی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم «خلیل‌الله»یە. دایکیشی ناوی یوکان یان یوحانذی کچی لاوی‌یە، لە زۆر سورەتی قورئاندا باسی بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە کراوە، بۆ وێنە لە سورەی «القصص»دا فەرموویەتی:

﴿نَتْلُوا عَلَيْكَ مِنْ نَبَإِ مُوسىٰ وَ فِرْعَوْنَ بِالْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾.(١)

دەخوێنینەوە بە هۆی حەزرەتی جوبرەئیلەوە بە سەر تۆدا ئەی پێغەمبەر باسی

(١) القصص: ٣.

حەزرەتی مووسا و فیرعەون بە ڕاستی و بێ موبالەغە، بۆ ئەوەی ئەوانەی موسوڵمانن پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن.

﴿اِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِی الْاَرْضِ وَ جَعَلَ اَهْلَهٰا شِیَعاً یَسْتَضْعِفُ طٰائِفَةً مِنْهُمْ﴾.(١)

دەفەرمووێ: بە ڕاستی فیرعەون خۆی بە زاڵ زانی و تەکەبووری کرد و جیاوازی خستە ناو خەڵکەوە و بە چاوی سووک تەماشای بەنی ئیسرائیلیەکانی دەکرد و زۆری ناڕەحەت دەکردن.

﴿یُذَبِّحُ اَبْنٰاءَهُمْ وَ یَسْتَحْیِ نِسٰاءَهُمْ اِنَّهُ کٰانَ مِنَ الْمُفْسِدِینَ﴾.(٢)

کوڕەکانی سەر دەبڕین وکچەکانی دەهێشتەوە. بە ڕاستی فیرعەون یەکێک بوو لە پیاو خەراپان. ڕاوی دەڵێ فیرعەونی میسر ناوی وەلیدی کوڕی مەسعەب بوو، زۆر کافر و بێ دین بوو، داوای خوایەتی دەکرد، جوانترین ئافرەتی ئەو سەردەمەی کە ئاسیەی کچی مزاحیم بوو بە تۆبزی لە باوکی ستاند، بەڵام چونکە خوا ئیرادەی لە سەر نەبوو کاتێک بە لایەوە دەچوو پیاوەتی نەدەما و لە پیاو دەکەوت، تا وای لێ هات هەر بە تەماشا کردنێ ڕازی بوو فیرعەون شەوێک خەوی دی لە خەوەکەیدا ئاگرێک لە «بیت المقدس»وە هات و قیبتیەکانی بە خاوەوە سووتاند، بەڵام خۆی دە بەنی ئیسرائیلیەکان نەدەگەیاند، کە لە خەوەکەی ڕاست بۆوە زۆر ترسا. بۆ بەیانیش بە ئاشکرا گوێی لە دەنگێک بوو دەی گوت: ئەی خاکت بە سەر. زۆری نەماوە سەر و ماڵی خۆت و هەموو قیبتیەکان بە هۆی پێغەمبەرێکی بنی ئیسرائیلیەوە لە بەین بچێ، ئەوەندەی دیش لە دەنگەکە ترسا بۆ بەیانی هەموو کاهینی و ساحیر و موعەبیر و مونەجیم و ئەستێرەناسی بانگ کردن و خەونەکەی بۆ گێڕانەوە، گوتیان: ئەی فیرعەون ئەو خەونە مەعنای وایە لە تائیفەی بەنی ئیسرائیلیان کوڕێک لە دایک دەبێ داوای پێغەمبەری دەکا و لە سەر دەستی وی بە هیلاک دەچی. ئنجا هات بە قسەی زاناکان هەر ژنێک لە بەنیئیسرائیلیەکان کە منداڵی دەبوو، کوڕ بوایە سەریان دەبڕی و ئەگەر کچ بوایە لاقەیان نەدەکرد، ڕۆژێک پیاو ماقووڵی قیبتیەکان چوونە لای فیرعەون گوتیان: ئەی پاشا تۆ کوڕەکانیان دەکوژی و پیرەکانیشیان بەرە بەرە دەمرن تا دوو

---

(١) و (٢) القصص: ۴.

سێ ساڵی دی کەسیان نامێنێ خزمەتی خۆمانی پێ بکەین، فیرعەون گوتی: باشە هەر ساڵە نا ساڵێک کوڕەکانیان سەر دەبڕین. ئەو ساڵە دایکی حەزرەتی مووسا حەزرەتی هارونی بوو، ڕاوی دەڵێ: فیرعەون دووازدە هەزار کوڕی بنی ئیسرائیلی کوشت لەو ساڵانەدا، مەلائیکەی ئەرز و ئاسمان دەستیان کرد بە گریان و لە بەر خوا دەپاڕانەوە ئەو زوڵمە قبووڵ نەکا. خوا فەرمووی: ئەی مەلائیکە سەبرتان بێ.

﴿لِكُلِّ اَجَلٍ كِتابٌ﴾.(١)

هەموو شتێک وەختی خۆی هەیە وکاتی دیاری کراوە، نەک زوڵمی فیرعەون زوڵمی هیچ زاڵمێک تا سەر نابێ. فەرمووی: مزگێنی بێ بەو زوانە مووسا پێغەمبەر لە دایک دەبێ و زوڵمی فیرعەون لەبەین دەبا. ئنجا خواوەندی گەورە ئیرادەی کرد تەخت و بەختی فیرعەون لە بەین بەرێ، شەوێک خستیە دڵی دایکی حەزرەتی مووساوە کە هەستێ و بچێ بۆ لای عیمرانی مێردی لە کۆشکی فیرعەوندا، لەوکاتەدا عیمران حەرەسی تایبەتی فیرعەون بوو. لە فەرشی فیرعەون وێک کەوتن و نوتفەی حەزرەتی مووسا لەو شەوەدا لە ڕەحەمی دایکیدا قەراری گرت و لە پاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ لە دایک بوو، نوری پێغەمبەری لە ناو چاواندا دەدرەوشایەوە، دایکی لە پیاوەکانی فیرعەون دەترسا وەی دۆزن و سەری ببڕن، خوای تەعالا فەرمووی:

﴿وَ اَوْحَيْنا اِلىٰ اُمِّ مُوسىٰ اَنْ اَرْضِعيهِ﴾.(٢)

وەحیمان کرد بۆ لای دایکی حەزرەتی مووسا کە نەترسێ و شیری بداتێ، تا چلەی چوو دایکی شیری دایە، لەو ماوەشدا باوکی مرد و دایکی ئەوەندەی دیش خۆفی ڕێ نیشت، خوا فەرمووی:

﴿فَاِذا خِفْتِ عَلَيْهِ فَاَلْقيهِ فِي الْيَمِّ وَ لا تَخافي وَ لا تَحْزَني اِنّا رادُّوهُ اِلَيْكِ وَ جاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلينَ﴾.(٣)

ئەی دایکی مووسا هەرکاتێ زانیت پیاوەکانی فیرعەون ماڵان دەپشکنن و لەوەی ترسای کوڕەکەت بدۆزنەوە، سندوقێک دروست بکە وکوڕەکە بخەرە ناوی و فڕێی دە

(١) الرعد: ٣٨. (٢) و (٣) القصص: ٧.

ناو بەحری نیلەوە و مەترسە و پەرۆشت نەبێ، بەو زوانە دەی نێرینەوە لای خۆت و دەشیکەین بە پێغەمبەر.

دایکی هەستا تابووتێکی دروست کرد و بە قورقوشم قەڵشتەکانی پڕکردەوە و لەگەڵ کەلسومی کچیدا بردیان خستیانە ناو بەحری نیلەوە، بەکەلسومی گوت: من دەڕۆمەوە بۆماڵەوە، بەڵام تۆ دوور و نزیک وەدوای کەوە بزانە ئاوەکە بۆ کوێی دەبا، دایکی بە دڵی بریانەوە بە چاوی پڕ لە گریانەوە بەرە و ماڵ گەڕایەوە و کەلسومیش بە گوێ بەحرەکەدا وەدوای کەوت. لە نیلەوە جۆگە ئاوێک هەڵگیرا بوو بۆ ناو کۆشکی فیرعەون، قەزای ڕەببانی ئاوەکە ڕووی بە تابووتەکە کردە جۆگەکە و بە جۆگەکەدا بردی تا چۆ ناو حەوزی حەوشی قەسرەکەوە.

﴿فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوّاً وَ حَزَناً﴾.(١)

ماڵ و خێزانی فیرعەون کە چاویان بە سندوقەکە کەوت پەلاماریان دا و هێنایانە دەرو و سەریان هەڵپچری، تەماشایان کرد کوڕێکی ساوای ئەوەندە جوانی تێدایە بۆ ئەوەی دەبێ نە بکەی نە بخۆی هەر تەماشای سایەی گەردنی بکەی، ئاسیە خان ڕەحمی پەڕیە سەر و پڕ بە دڵ خۆشیویست، نەیاندەزانی دەبێتە دوژمنیان و هۆی غەمباریان، بەڵام کە بردیان بۆ لای فیرعەون و کارەساتەکەیان بۆ گێڕایەوە و چاوی پێ کەوت مووچورکێکی لە بەری پێ ڕاهات لە تۆقی سەری دەرچوو. زۆری لێ ترسا، گوتی: بەرن بیکوژن ئەوە دەبێتە دوژمنی من.

﴿وَ قٰالَتِ امْرَاَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لي وَ لَكَ لا تَقْتُلُوهُ عَسىٰ اَنْ يَنْفَعَنٰا اَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَداً وَ هُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾.(٢)

ئاسیەخانی ژنی گوتی: نابێ بیکوژن، ڕوناکی چاوی من و تۆیە گەورە بێ خزمەتمان دەکا، هەر کاتێکیش بیکوژی دەسەڵاتت هەیە، فیرەعەون بە قسەی کرد و نەیکوشت، نەیاندەزانی کێیە و دەبێتە چی.

﴿وَ اَصْبَحَ فُؤٰادُ اُمِّ مُوسىٰ فٰارِغاً اِنْ كٰادَتْ لَتُبْدي بِهِ لَوْ لا اَنْ رَبَطْنٰا عَلىٰ قَلْبِهٰا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنينَ﴾.(٣)

---

(١) القصص: ٨. (٢) القصص: ٩. (٣) القصص: ١٠.

دایکیشی کە زانی سندوقەکە چۆتە کۆشکی فیرعەونەوە لە تـاوانـی قـەراری نـەما و ئارامی لێ هەڵگیرا و هۆشی نەما، ئەگـەر لە بـەر وەعـدەکـەی خـوا نـەبوایـە خـۆی بـۆ ڕانەدەگیرا.

﴿وَ قٰالَتْ لِأُخْتِهِ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِ عَنْ جُنُبٍ وَ هُمْ لٰا يَشْعُرُونَ﴾.(١)

ئنجا دایکی حەزرەتی مووسا بە کەلسومی خوشکی حەزرەتی مووسای گوت: بچۆ بزانە چ لە کوڕەکە دەکەن و چیان لێ کردووە؟ کەلسوم چوو لە دورەوەڕا، تەماشای کرد ئەوە مووسای برای لە سەر کۆشی ئاسیەی ژنی فـیرعەونە و نـەیانناسی کـە ئـەو کـچە خوشکی ئەو منداڵەیە.

﴿وَ حَرَّمْنٰا عَلَيْهِ الْمَرٰاضِعَ مِنْ قَبْلُ﴾.(٢)

خوای تەعالا لە قورئاندا دەفەرمووێ: لە پێش چوونی خوشکەکەیدا شیری هەموو ژنێکمان لێ حەرام کرد و مەمکی کەسی نەدەمژی و شیری هیچ ئافرەتێکـی نـەخوارد، زۆریان پێ ناخۆش بوو.

﴿فَقٰالَتْ هَلْ اَدُلُّكُمْ علىٰ اهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَ هُمْ لَهُ نٰاصِحُونَ﴾.(٣)

کەلسووم چۆ پێشەوە و گوتی: ماڵێکتان نیشان بدەم کە ئەو منداڵەتان بۆ بەخێو بکەن و لە شیر پێ دانی و گەورە کردنیدا درێغی نەکەن، گوتیان: زۆرمان پێ خۆشە بچۆ ژنی ئەو ماڵەمان بۆ بانگ کە، کەلسووم بە پەلە چۆوە بۆ ماڵ و کارەساتی بـۆ دایکـی گـێڕایـەوە و چوون بۆ ماڵی فیرعەون. کە چوونە ژورەوە ئاسیەی ژنی فیرعەون زانی کە ئـەو ئـافرەتە خێزانی عیمرانی مامیەتی، زۆری پێ خۆش بوو دەنگی نەکـرد. مـنداڵەکـەی دایـە، کـە بردی‌یە سەر باوەش و مەمکی دەزاری نا بە پێکەنینەوە گورج مەمکەکەی مژی و زۆر بە ئارەزووەوە قومی لێ دەدا.

فیرعەون زۆری لا سەیر بوو، گوتی: دیارە شیرت زۆر تێدایە منداڵت لە بەرە، ئەویش لە جوابدا گوتی: جا پیاوەکانی تۆ منداڵی کەسیان هێشتۆتەوە نەی کوژن؟ فیرعەون گوتی: ئەی باشە زیاد لە هەموو ژنی میسر بۆ مەمکی تۆی گرت؟ گوتی: ئاخر من ژنێکی پاک و

---

(١) القصص: ١١. (٢) و (٣) القصص: ١٢.

خاوێن و بۆن خۆشم و شیرەکەم زۆر بە تام و شیرینە، تا ئێستا هیچ منداڵیک نەبووە مەمکی بدەمێ و نەی‌مژێ، فیرعەون دەنگی نەکرد.

﴿فَرَدَدْنٰاهُ اِلَىٰ اُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهٰا وَ لٰا تَحْزَنَ وَ لِتَعْلَمَ اَنَّ وَعْدَ اللّٰهِ حَقٌّ وَ لٰكِنَّ اَكْثَرَهُمْ لٰا يَعْلَمُونَ﴾.(١)

خوا دەفەرمووێ: دامانەوە بە دایکی تا چاوی پێ رووناک وەبێ و لە دوری خەفەت نەخوا و لە باوەشی گەرمی خۆیدا و بە شیری خۆی بەخێوی بکا و بزانێ وەعدەی خوا ڕاستە. بەڵام زۆر بە داخەوە زوربەی خەڵک وا نازانن. ئنجا لە پاش دوو ساڵ دایکی کوڕەکەی بردەوە بۆ ماڵی فیرعەون و وەکو کوڕی ماڵی لێ هات.

دەڵێن: حەزرەتی مووسا لە عومری سێ ساڵیدا بوو ڕۆژێک فیرعەون بانگی کرد و لە سەر باوەشی خۆی دانا یاری لەگەڵ دەکرد، مووسا بە دەستێک ڕیشی فیرعەونی گرت و بە دەستەکەی دیشی وەرگەڕایە سەر وگوێلاکی. فیرعەون زۆری لێ توڕە بوو، ئەمری کرد کە بیکوژن، ئاسیە خانی ژنی گورج پەلاماری دایە و دەباوەشێ‌ی گرت و گوتی: ئاخر تۆ نازانی منداڵان ئەگەر یاریان دەگەڵ بکەی ئەو جۆرە حەرەکاتە و دەست بزێویەیان هەر هەیە و بێ ئەدەب دەبن؟ فیرعەون گوتی: ئاسیە لێم گەڕێ ئاخری دەبینی ئەو هەتیوە دەبێتە دوژمنی من، ئاسیە خان گوتی: بەسە زمانە عەقلی نیە و فامی نەکردۆتەوە، دەبا بۆ درۆ و ڕاستی تاقی بکەمەوە، تەشتێکی ئاڵتونی هێنا و پڕی کرد لە پشکۆ و خورما و بانگی مووسای کرد و گوتی: کۆڕم وەرە لەو دووانە کامەیان هەڵدەگری هەڵگرە، حەزرەتی مووسا دەستی درێژکرد بۆ لای خورماکان، ڕاوی دەڵێ لەوکاتەدا حەزرەتی جوبرەئیل بە فەرمانی ڕەبی جەلیل لە غەیبەوە هات و دەستی حەزرەتی مووسای گرت و بردی‌یە سەر پشکۆیەکان و پشکۆیێکی پێ هەڵگرت و خستیە ناو دەمیەوە و زمانی سووتاند و بە گریانەوە فڕێ‌ی دایەوە. ئاسیە خان گوتی: ئەم گوت نافامێ، ئەگەر عەقلی بووایە خورماکەی هەڵ نەدەگرت؟ فیرعەون دەنگی نەکرد، جا دەڵێن زمان پسکی حەزرەتی مووسا لەو پشکۆیەڕا بووە.

---

(١) القصص: ١٣.

﴿وَ لَمّا بَلَغَ اَشُدَّهُ وَاسْتَوىٰ آتَيْناهُ حُكْماً وَ عِلْماً﴾.(١)

ئنجا خواوەندی گەورە دەفەرمووێ: کاتێک مووسا تەمەنی گەیيە سی چل ساڵ و بە جیسم و عەقڵ تەواو بوو کردمان بە پێغەمبەر و دەسەڵات و زانیاریمان دایە، لەو تەمەنەدا زۆر بە کەمی لە کۆشکی فیرعەون دەهاتە دەرەوە.

﴿وَ دَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِنْ اَهْلِها فَوَجَدَ فِيها رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلانِ هٰذا مِنْ شِيعَتِهِ وَ هٰذا مِنْ عَدُوِّهِ﴾.(٢)

ڕۆژێک بێ ئەوەی کەس ئاگای لێ بێ چوو بۆ ناوشار. تووشی دووکەس بوو شەڕیان دەکرد، یەکیان بەنی ئیسرائیلی بوو، ئەوی دیان قیبتی.

﴿فَاسْتَغاثَهُ الَّذي مِنْ شيعَتِهِ عَلَى الَّذي مِنْ عَدُوِّهِ فَوَكَزَهُ مُوسىٰ فَقَضىٰ عَلَيْهِ﴾.(٣)

کابرای بەنی ئیسرائیلی هاواری کرد و گوتی: یا مووسا فریام کەوە حەزرەتی مووسا چونکە دەیزانی قیبتیەکان زوڵم لە بەنی ئیسرائیلیەکان دەکەن چوو مشتێکی لە کابرای قیبتی دا و کوشتی، بەڵام لە پاشان زۆر پەشیمان بۆوە.

﴿قالَ هٰذا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطانِ اِنَّهُ عَدُوٌّ مُضِلٌّ مُبِينٌ﴾.(٤)

گوتی: ئەوە کاری شەیتان بوو پێی کردم بە ڕاستی شەیتان دوژمنە و بە ئاشکرا خەڵک لە ڕێگای ڕاست لادەدا.

﴿قالَ رَبِّ اِنّي ظَلَمْتُ نَفْسي فَاغْفِرْلي فَغَفَرَ لَهُ اِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحيمُ﴾.(٥)

فەرمووی: ئەی خوای گەورە من زوڵمم لە نەفسی خۆم کرد عەفووم کە، خوا عەفووی کرد. چونکە بە ڕاستی هەر خوایە کە بەخشندە و بە ڕەحمە.

﴿فَاَصْبَحَ فِی الْمَدِينَةِ خائِفاً يَتَرَقَّبُ فَاِذَا الَّذی اسْتَنصَرَهُ بِالْاَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُ قالَ لَهُ مُوسىٰ اِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُبِينٌ﴾.(٦)

بۆ بەیانی هاتەوە ناو شار زۆریش لەوە دەترسا کە بزانن ئەو کابرای کوشتوە. دوبارە تووشی کابرای بەنی ئیسرائیل بۆوە لەگەڵ قیبتێکی دی دەستیان دە ئێخەی یەکتر نابوو

---

(١) القصص: ١٤. (٢) و (٣) و (٤) القصص: ١٥. (٥) القصص: ١٦.
(٦) القصص: ١٨.

کابراکە چاوی بە حەزرەتی مووسا کەوت گوتی: ئەی مووسا فریام کەوە ئەو قیبتی‌یە دەڵێ تۆ دوێنێ ئامۆزاکەمت کوشتووە، حەزرەتی مووسا لە کابرای بەنی‌ئیسرائیلی تورە بوو گوتی: دیارە تۆ زۆر شەڕانی! چوو بە لایانەوە لێکیان بکاتەوە، کابرای ئیسرائیلی وای زانی لە سەری ناکاتەوە و دەی کوژێ لە ترسان گوتی:

﴿اَتُرِيدُ اَنْ تَقْتُلَنِي كَمَا قَتَلْتَ نَفْساً بِالْاَمْسِ﴾.(١)

دەت هەوێ منیش وەک کابرای دوێنێ بکوژی؟ حەزرەتی مووسا قسەی کابرای زۆر لە دڵی گران بوو، بەڵام هیچ قسەی نەکرد و لێکی کردنەوە. کابرای قیبتی چوو بە فیرعەون و بە خەڵکەکەی گوت: کە مووسا کوڕە مامەکەی کوشتووە، فیرعەون گوتی: بچن بی‌کوژنەوە.

﴿وَ جَاءَ رَجُلٌ مِنْ اَقْصَا الْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَا مُوسَىٰ اِنَّ الْمَلَاَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ اِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ﴾.(٢)

لەم لاشەوە حەزرەتی مووسا چوو بۆوە ماڵی دایکی چونکە لە قسەی کابرا زۆر ترسا، دەیگوت فیرعەون زۆر کافرە بەڵام ئەگەر خزمی خۆشی خەراپە بکا بە سەریەوە ناچێ. لەو کاتەدا یەکێک لە خزمانی فیرعەون کە زۆر دۆستی حەزرەتی مووسا بوو لەو پەڕی شارڕا بە دزیەوە هات بۆ لای حەزرەتی مووسا و گوتی: فیرعەون زانیویەتی تۆ دوێنێ کابرات کوشتووە. ئەمری کردووە لە تۆڵەیدا بت کوژنەوە ئێستا لێت دەگەڕێن سەری خۆت هەڵگرە و میسر بە جێ بێڵە، بە ڕاستی من ئامۆژگاریت دەکەم و درۆ ناکەم.

﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفاً يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾.(٣)

حەزرەتی مووسا بە قسەی کابرا باوەڕی کرد و خواحافیزی لە دایکی کرد و بە دزیەوە و بە ترس و لەرزەوە لە شار وەدەرکەوت و بەرەو مەدیەن کەوتە ڕێ کە هەشت ڕۆژە ڕێ لە میسر دور بوو، کەوت بۆ بەینی شام و حیجازەوە لای خەلیجی عەقەبە و لە ڕێگادا هەر دوعای دەکردن و لە بەر خوا دەپارایەوە و دەیگوت: ئەی خوای گەورە لە بەڵای ئەو قەومە زاڵمەم ڕزگار بکە، لە پاش حەوت ڕۆژ لەگەڵ ماندو بونێکێ زۆر و برسی‌یەتی و تینوایەتی

(١) القصص: ١٩. (٢) القصص: ٢٠. (٣) القصص: ٢١.

زۆردا نە هاورێی لەگەڵ بوو، نە خواردەمەنی، نە پێڵاوی لە پێدا بوو نە شارەزای رێگا بوو، گەیشتە وولاتی مەدیەن بەڵام نووری ئیمان و پشت بەستن بە خوا جێگای ئەو هەموو شتانەی پڕ کردبۆوە.

﴿وَ لَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَاءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسىٰ رَبِّي اَنْ يَهْدِيَنِي سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾.[1]

کاتێک گەییە وولاتی مەدیەن و لە دورەوە شاری مەدیەنی وە چاو کرد فەرمووی: ئومێدم وایە خوا هیدایەتم بدا و لە ناخۆشی رزگار بم، تۆزێک سێبووری هات و دڵی خۆش بوو، جا با لێرەدا حەزرەتی مووسا و هەموو لایەک بە خوا بسپێرین و ئەگەر عومر وەفای کرد و ماین لە مەجلیسی بەیانیدا دەچینەوە خزمەتی و لە هێندێکی دی لە ژیانی ئەو پێغەمبەرە ئاگادار دەبین و پەند و ئامۆژگاری لێ وەر دەگرین.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيَاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكَاتُهُ.

---

(١) القصص: ٢٢.

٢

# حەزرەتی مووسا

## باسی «حەزرەتی مووسا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

با بچینەوە سەر باسی حەزرەتی مووسا و بزانین قەزا و قەدەر چی بە سەر دێنێ و لەو کۆچەدا تووشی چ سەر هاتێک دەبێ؟

﴿وَ لَمّٰا وَرَدَ مٰاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِنَ النّٰاسِ يَسْقُونَ وَ وَجَدَ مِنْ دُونِهِمُ امْرَأَتَيْنِ تَذُودٰانِ﴾.[1]

لە کاتێکدا لە شاری مەدیەن نزیک بوو ڕوانی خەڵکێکی زۆر کۆمەڵەیان کردووە و مەڕ و ماڵاتێکی زۆریان لە دەورەیە، لایدا بۆ لایان، سەرنجیدا هەموویان شوانی مێگەل بوون، لە دەوری بیراوێک کۆ بونەوە بە نۆرە مەڕ و ماڵاتەکەیان ئاو دەدەن، بەڵام هەرچی بە تاقەتتر بوایە زوتر نۆرەی دەپچڕی، حەزرەتی مووساش ماندو و مردو بوو، زۆری تینو و

(١) القصص: ٢٣.

بوو، چوو ئاوی خواردەوە لە بەر سێبەرێک پاڵی لێ دایەوە و بە دیاریانەوە دانیشت، بەڵام کە ڕوانی دوو ئافرەت مەڕ و بزنێکی زۆریان پێیە و دوور لە بیر و خەڵکەکە وەستاون و ناهێڵن مێگەلەکەیان تو خونی ئاوەکە بێ، حەزرەتی مووسا زۆری لا سەیر بوو، هەستا چوو بۆ لایان و گوتی:

﴿قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ الرِّعَاءُ وَ اَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾.(١)

ئەوە بۆ ناهێڵن حەیوانەکەتان بچنە سەر بیرەکە و ئاو وەخۆن؟گوتیان: واللە ئێمەش هەر بۆ مەڕ ئاو دان هاتووین، بەڵام نامان هەوێ تێکەڵ بەو پیاوانە ببین، با ئەوان لێ وەبن جا ئێمەش ئاویان دەدەین، باوکیشمان زۆر پیرە، ناتوانێ خۆی بێ ئاویان بدا، بۆیە ئێمە بە ناچاری هاتووین. بە ڕیوایەتێکیش دەڵێن شوانەکان کە لێ دەبوونەوە بەردێکی گەورەیان لە سەر زاری بیرەکە دادەنا بەشەش حەوت کەس نەبوایە ئەو بەردە لا نەدەچوو، بەردەکەیان لە سەر بیرەکە دانا و ڕۆیشتن. حەزرەتی مووسا زۆری بەزەیی بە ئافرەتەکاندا هاتەوە.

﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰ اِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ اِنِّي لِمَا اَنْزَلْتَ اِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾.(٢)

کە شوانەکان ڕۆیشتن حەزرەتی مووسا چوو بەردەکەی لا برد و ئاوی بۆ هەڵ کێشان تا مێگەلەکەیان ئاوی خواردەوە و ئافرەتەکان گەڕانەوە بۆ ماڵ و حەزرەتی مووساش چۆ بەر سێبەری دارێک و ڕووی کردە ئاسمان و گوتی: ئەی خوای گەورە زۆرم برسییە چاوەڕوانی خێر و کەرەمی تۆم. ئافرەتەکان کە چوونەوە کارەساتیان بۆ باوکیان گێڕایەوە و خوای گەورە دووعای حەزرەتی مووسای گیرا کرد و دڵی حەزرەتی شوعەیبی بۆ نەرم کرد، بە کچێکی گوت: بچۆ ئەو پیاوە بانگ بکە بۆ ماڵی خۆمان.

﴿فَجَاءَتْهُ اِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ اِنَّ اَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ اَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾ (٣)

یەکێک لە کچەکان زۆر بە حەیا و شەرمەوە هات بۆ لای حەزرەتی مووسا و گوتی: باوکم دەڵێ بێ بۆ ماڵی ئێمە تا پاداشتی ئەو چاکەی بدەمەوە کە لەگەڵی کردووین. هەستا لەگەڵ ئافرەتەکەدا چوو بۆ ماڵی حەزرەتی شوعەیب.

---

(١) القصص: ٢٣. (٢) القصص: ٢٤. (٣) القصص: ٢٥.

﴿فَلَمّٰا جٰاءَهُ وَ قَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ﴾.(١)

کاتێک چۆ خزمەت حەزرەتی شوعەیب و سەلامی کرد و دانیشت نان و مان خواردن تەواو بوو. ئنجا حەزرەتی شوعەیب لێی پرسی لە کوێڕا هاتووی؟ ئەویش بە تەواوی بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە.

﴿قٰالَ لٰا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظّٰالِمِينَ﴾.(٢)

حەزرەتی شوعەیب دڵ خۆشی دایەوە و فەرمووی: مەترسە لە دەست ئەو قەومە زاڵمە رزگارت بووە.

﴿قٰالَتْ اِحْدٰاهُمٰا يٰا اَبَتِ اسْتَئْجِرْهُ اِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَئْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْاَمِينُ﴾.(٣)

یەکێک لە کچەکان عەرزی بابی کرد ئەی باوکە ئەو پیاوە ڕاگرە بە شوان چاکترین کەسێکە بە کرێی بگری، زۆر بە تاقەتە و زۆر ئەمینە. حەزرەتی شوعەیب تۆزێک ڕاما و لە پاشان سەری بەرز کردەوە و فەرمووی:

﴿قٰالَ اِنّي اُرِيدُ اَنْ اُنكِحَكَ اِحْدَى ابْنَتَيَّ هٰاتَيْنِ عَلىٰ اَنْ تَأْجُرَني ثَمٰانِيَ حِجَجٍ فَاِنْ اَتْمَمْتَ عَشْراً فَمِنْ عِنْدِكَ وَ مٰا اُرِيدُ اَنْ اَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُني اِنْ شٰاءَ اللّٰهُ مِنَ الصّٰالِحِينَ﴾.(٤)

من دەمەوێ یەکێک لەو دوو کچانەت لێ مارەکەم بەو شەرتە هەشت ساڵ شوانیم بۆ بکەی، ئەگەر دەساڵیشت تەواو کرد ئەوە پیاوەتی خۆتە من تۆبزیت لێ ناکەم بە ئومێدی خوا زۆریشت لەگەڵ باش دەبم.

﴿قٰالَ ذٰلِكَ بَيْني وَ بَيْنٰاكَ اَيَّمَا الْاَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلٰا عُدْوٰانَ عَلَيَّ وَاللّٰهُ عَلىٰ مٰا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾.(٥)

حەزرەتی مووسا فەرمووی: زۆر باشە بەڵام با ئەو قسە هەر لە بەینی خۆماندا بێ و خوا شاهید بێ لە سەر ئەوەی دەیڵێین. سەر و نەهێشینم هەشت ساڵ شوانی بۆ حەزرەتی شوعەیب کرد      ی مارەکرد و ماوەیەکیش مایەوە. ئنجا ئارەزووی

(١) و (٢) القصص: ٢٥. (٣) القصص: ٢۶. (۴) القصص: ٢٧.
(۵) القصص: ٢٨.

وولاتی میسری کەوتە سەر و چۆ خزمەت حەزرەت شوعەیب گوتی: دەبێ روخسەتمان بدەی بچینەوە بۆ میسر. حەزرەتی شوعەیب گریا و فەرمووی: من پیر بووم بۆ بە جێم دێڵی؟ گوتی: ئاخر زۆر غەریبی دایکم و هارونی برام و کەلسومی خوشکم دەکەم و دەمێکە لێیان بێ خەبەرم. حەزرەتی شوعەیب فەرمووی: دا بچن ئەو عەسایەی کە بە میرات لە باب و باپیرانم بۆ ماوەتەوە بۆم بێنن، کە هێنایان دای بە حەزرەتی مووسا و گوتی: ئەو عەسایە هەڵگرە میراتی پێغەمبەرانە ئومێدم وایە خوا بت کا بە پێغەمبەر.

﴿فَلَمّٰا قَضىٰ مُوسَى الْاَجَلَ وَ سٰارَ بِاَهْلِهِ آنَسَ مِنْ جٰانِبِ الطُّورِ نٰاراً﴾.(١)

کاتێک ماوەکەی تەواو کرد و روخسەتی وەرگرت و بە خۆ و خێزانی خوا حافیزیان لە حەزرەتی شوعەیب کرد و بەرەو میسر کەوتنە رێ. ئەو رۆژە تا ئێوارە رۆیشتن، لە ئێوارێدا ئاسمان دەستی کرد بە شریخو و هوڕی هەوران و دنیا تاریک بوو، چاو چاوی نەدەدی، دای دایە بەفر و باران و ڕێگایان لێ وون بوو. حەزرەتی مووسا کە ڕووانی لە لای کێوی تووری سینا ڕا ئاورێک دیار بو تروسکەی دەهات.

﴿قٰالَ لِاَهْلِهِ امْکُثُوا اِنّی آنَسْتُ نٰاراً لَعَلّی آتیکُمْ مِنْهٰا بِخَبَرٍ اَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النّٰارِ لَعَلَّکُمْ تَصْطَلُونَ﴾.(٢)

بە ژنەکەی گوت: ئێوە لێرە دانیشن من چاوم لە ئاگرێکە دەچم خەبەری ڕێگا لە خاوەن ئاگرەکە دەپرسم یان دەستە چیلێکی لێ دێنم و خۆی پێ گەرم دەکەینەوە.

﴿فَلَمّٰا اَتٰاهٰا نُودِیَ مِن شٰاطِیءِ الْوٰادِ الْاَیْمَنِ فِی الْبُقْعَةِ الْمُبٰارَکَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ اَنْ یٰا مُوسىٰ اِنّی اَنَا اللّٰهُ رَبُّ الْعٰالَمینَ﴾.(٣)

کاتێک نزیک بۆوە تەماشای کرد نورێک لە ئاسمانڕا هاتووە لە دارێکی داوە زۆر ترسا و خۆفی ڕێ نیشت، لە لای ڕاستی‌یەوە لەو جێگا موبارەکە لە شیوەکەی نزیک کێوی توور دەنگێک لە غەیبەوە بانگی کرد و فەرمووی: مەترسە من خوای هەموو عالەمم.

﴿اِنّی اَنَا رَبُّکَ فَاخْلَعْ نَعْلَیْکَ اِنَّکَ بِالْوٰادِ الْمُقَدَّسِ طُویً﴾.(٤)

فەرمووی: من خوای تۆم پێڵاوەکانت داکەنە تۆ لە شیوی «تووای» زۆر گەورەیە.

---

(١) و (٢) القصص: ٢٩. (٣) القصص: ٣٠. (٤) طه: ١٢.

﴿وَ اَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمٰا يُوحىٰ﴾.(١)

من تۆم کرد بە پێغەمبەر گوێ ڕاگرە بۆو ئامۆژگاریانە و ئەو قسانەی پێت دەڵێم.

﴿اِنَّنىٖ اَنَا اللّٰهُ لٰا اِلٰهَ اِلّٰا اَنَا فَاعْبُدْنىٖ وَ اَقِمِ الصَّلٰاةَ لِذِكْرىٖ﴾.(٢)

بە ڕاستی هەر من خوام عیبادەت بۆ من بکە و نوێژ بە یادی منەوە بکە.

﴿اِنَّ السّٰاعَةَ آتِيَةٌ اَكٰادُ اُخْفيٖهٰا لِتُجْزىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمٰا تَسْعىٰ﴾.(٣)

بە ڕاستی ڕۆژی قیامەت هەر دێ، گۆمانت نەبێ، بۆ ئەوەی هەموو کەس حیسابی کردەوەی لە گەڵدا بکرێ.

﴿فَلٰا يَصُدَّنَّكَ عَنْهٰا مَنْ لٰا يُؤْمِنُ بِهٰا وَاتَّبَعَ هَوٰاهُ فَتَرْدىٰ﴾.(٤)

بە قسەی ئەوانە بە سەهو نەچی کە باوەڕیان بە دوا ڕۆژ نیە و خۆت بە هیلاک بەری، ئنجا کە خوای تەعالا حەزرەتی مووسای کردە پێغەمبەر ویستی چەند موعجیزەی نیشان بدا، بۆ ئەوەی ئومێدی زیاتر بێ و نەترسێ، فەرمووی:

﴿وَ مٰا تِلْكَ بِيَميٖنِكَ يٰا مُوسىٰ﴾.(٥)

ئەوە چیە بە دەستی ڕاستەوەیە؟ عەقڵ و بیری ئادەمیزاد و بەشەری لە جوابی ئەو پرسیارە سەرسام دەبێ هەر دەبێ بە گوێرەی بیری ئینسانی جواب وەدا.

﴿قٰالَ هِىَ عَصٰاىَ اَتَوَكَّؤُ اعَلَيْهٰا وَ اَهُشُّ بِهٰا عَلىٰ غَنَمىٖ وَ لِىَ فيٖهٰا مَآرِبُ اُخْرىٰ﴾.(٦)

ناچار گوتی: ئەی خوای گەورە بڵێم چی؟ ئەوە عەساکەمە کە ماندوو بووم لە ڕێگادا و لە بەر مەڕ خۆی داوێمە سەر، گەڵای دارانیشی بۆ مەڕەکان پێ دەکوتم و هەڵدەوەرێنم، چەند ئیشی دیشی پێ دەکەم.

﴿قٰالَ اَلْقِهٰا يٰا مُوسىٰ﴾.(٧) ﴿فَاَلْقٰاهٰا فَاِذٰا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعىٰ﴾.(٨)

خوا فەرمووی: یا مووسا عەساکەت فڕێ دە، فڕێ دا و بوو بە هەژدیهایێکی وا زەلام نەدەوێرا پڕ بە چاوان تەماشای کا، حەزرەتی مووسا لە ترسانی ڕای کرد.

﴿قٰالَ خُذْهٰا وَ لٰا تَخَفْ سَنُعيٖدُهٰا سيٖرَتَهَا الْاُولىٰ﴾.(٩)

---

(١) طه: ١٣. (٢) طه: ١٤. (٣) طه: ١٥.
(٤) طه: ١٦. (٥) طه: ١٧. (٦) طه: ١٨.
(٧) طه: ١٩. (٨) طه: ٢٠. (٩) طه: ٢١.

فەرمووی: هەڵی گرە و مەترسە وەک ئەووەڵ جاری لێ دەکەینەوە، کە دەستی بۆ برد و هەڵی گرت بۆوە بە عەساکەی جاران، دووبارە خوا فەرمووی:

﴿وَاضْمُمْ يَدَكَ اِلٰى جَنٰاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضٰاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ آيَةً اُخْرىٰ﴾.(١)

دەستی ڕاستت دەباخەڵێنێ و بیهێنە دەرەوە سپی دەبێ و بەڵەک نابێ و عەیبدار نابێ، حەزرەتی مووسا کە دەستی ڕاستی خستە باخەڵەوە و هێنایە دەرەوە، وەک ڕۆژ دنیای ڕووناک کرد و ئەویش بوو بە موعجیزەیێکی دی، ئینجا خوا فەرمووی:

﴿اِذْهَبْ اِلٰى فِرْعَونَ اِنَّهُ طَغىٰ﴾.(٢)

بڕۆ بۆ میسر بۆ لای فیرعەون بانگی کە بۆ خواپەرستی زۆری تووغیان کردوە.

﴿قٰالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي﴾. ﴿وَ يَسِّرْ لِي اَمْرِي﴾. ﴿وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسٰانِي﴾. ﴿يَفْقَهُوا قَوْلِي﴾. ﴿وَاجْعَلْ لِي وَزِيراً مِنْ اَهْلِي﴾. ﴿هٰارُونَ اَخِي﴾.(٣)

حەزرەتی مووسا گوتی: ئەی خوای گەورە هەرچی دەفەرمووی بە سەر سەر، بەڵام دەبێ ئەو چوار داوایانەم بۆ جێ بە جێ بکەی. سینگ و دڵم فراوان و گوشاد بکەی تاباری پێغەمبەری هەڵ گرێ و لای گران نەبێ. ئەوەی پێم دەسپێری بۆم ئاسان بکەی. زمانم تۆزێک ڕەوان و فەصیح بکەی ئەو لەنگی‌یەم نەمینێ، تا تێم بگەن، هارونی براشم بکە بە وەزیر و شەریکم.

﴿قٰالَ قَدْ اُوتِيتَ سُؤْلَكَ يٰا مُوسىٰ﴾.(٤)

خوا فەرمووی: ئەوا هەر چوار داواکاریەکەتم جێ بە جێ کرد.

﴿قٰالَ رَبِّ اِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْساً فَاَخٰافُ اَنْ يَقْتُلُونِ﴾.(٥)

دووبارە حەزرەتی مووسا گوتی: ئاخر من نەفەرێکم لە قەومی فیرعەون کوشتووە دەترسم بمکوژنەوە! فەرمووی: یا مووسا مەترسە زۆر جارم تۆ خەلاس کردووە، تۆ لە بیرت نایە بە دایکتمان گوت: بتخاتە تابوتەوە و فڕێی داتە ناو بەحرەوە! بە بەحریشمان گوت: هەڵت گرێ و بت باتەماڵی دوژمنی من و تۆ.

خۆشەویستیم خستە دڵی فیرعەون و ماڵ و خێزانیەوە و خۆشیان ویستی، خوشکەکەتم

---

(١) طه: ٢٢. (٢) طه: ٢٤. (٣) طه: ٢٥ ـ ٣٠.
(٤) طه: ٣٦. (٥) القصص: ٣٣.

نارده ماڵی فیرعەون دایکتی نیشان دان تا شیرت بداتێ و بت باتەوە لای خۆی و چاوی پێت ڕووناک وەبێ و پەرۆشی نەبێ و خەفەت نەخوا. کە کابراشت کوشت هەر نەجاتمان دای و چووی بۆ مەدیەن چەند ساڵ مایەوە و ژنت هێنا و دەوڵەمەند بووی، هەروەها لە زۆر نارەحەتی خەلاسمان کردووی.

﴿اِذْهَبْ اَنْتَ وَ اَخُوكَ بِآيَاتِي وَ لَا تَنِيَا فِي ذِكْرِي﴾. ﴿اِذْهَبَا اِلىٰ فِرْعَونَ اِنَّهُ طَغَىٰ﴾. ﴿فَقُولَا لَهُ قَوْلاً لَيِّناً لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ اَوْ يَخْشَىٰ﴾.(١)

خوا فەرمووی: بڕۆ لەگەڵ هاڕونی برات بۆ لای فیرعەون، ئەو موعجیزانە بنوێنە و درێغی مەکەن، چونکە فیرعەون توغیانی کردووە. بەڵام بە لە سەر خۆیی و بە هێواشی قسەی لەگەڵ بکەن، بەڵکو بگەڕێتەوە یان بترسی، حەزرەتی مووسا هاتەوە بۆ لای ژن و مەڕ و ماڵەکەی و بەیانی بەرە و میسر وەڕێ کەوتن، لە قەراغ شار ژن و ماڵەکەی بە جی هێشتو و چو بۆ ماڵی دایکی دەرگایان لێ کردەوە، بەڵام دایکی نەی‌ناسیەوە، هارونی برای هاتەوە بە خێر هاتنی کرد و زوو ناسیەوە. ئنجا ئەو دایک و کوڕە پێک شاد بوونەوە و یەکتریان زۆر ماچ کرد و حەزرەتی مووسا تەواوی بەسەرهاتی خۆی و کارەساتی بۆ گێڕانەوە، زۆریان پێ خۆش بوو چوون ژن و ماڵەکەشیان هێنا بۆ شار. ئنجا پاش دوو سێ ڕۆژ حەسانەوە، بە جووتە چوونە بارەگای فیرعەون گوتیان: ئێمە پێغەمبەری خواین. ئەو خوایە کە تۆ یەکێکی لە عەبد و بەندەگانی و تۆ خوا نی و دەبێ لەو ڕۆ بە دواوە کارت بە سەر بەنی‌ئیسرائیلیانەوە نەبێ و عەبدی تۆ نین، فیرعەون کە حەزرەتی مووسای ناسیەوە و ئەو قسانەی لێ بیستن غەزەبی گرت و زۆر تووڕە بوو، گوتی: ئەی مووسا دەبوو هەموو کەس قسە بکا تۆ قسە نەکەی!

﴿قَالَ اَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيداً وَ لَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ﴾.(٢)

ئایا من تۆم بە منداڵی گەورە نەکرد و سی ساڵ لە ماڵی مندا نەبووی؟ چۆن دەبێ ئەوەندە بێ وەفا بی؟!

﴿وَ فَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَ اَنْتَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾.(٣)

گوتی: تۆ هەر ئەو کەسە نی پیاوێکت بە ناحەق کوشت؟ تۆ چۆن دەبیە پێغەمبەر؟! تۆ

---

(١) طه: ٤٢ ـ ٤٤. (٢) الشعراء: ١٨. (٣) الشعراء: ١٩.

کوفرانی نیعمەتی منت کرد، ئەو هەموو چاکە و پیاوەتیەت چاو لێ نەبوو؟ واش خزمێکی منت کوشت و ڕات کرد!

حەزرەتی مووسا فەرمووی: مـن ئـەو پیاوەم بـە عـەمدی نـەکوشت نـەدەبوو ئێوە خەریکی کوشتنەوەی من بن؟ من لە ترسی ئێوە ڕام کرد، بەڵام خوای گەورە بە گەورەیی خۆی منی کردەوە بە پێغەمبەر. فەرمووی: ئەی فیرعەون ڕاست دەکەی چاکەت لەگەڵ من کردوە، بەڵام هەزار ئەوەندەی چاکەکە بە ئازار دانی بـەنی ئـیسرائـیلیەکـان تـۆڵەت لێ کردمەوە و نارەحەتت کردم.

﴿قٰالَ فِرْعَونُ وَ مٰا رَبُّ الْعٰالَمِينَ﴾.(١)

فیرعەون بە گاڵتەوە گوتی: خوای هەموو عالەم کێیە؟

﴿قٰالَ رَبُّ السَّمٰوٰاتِ وَالْاَرْضِ وَ مٰا بَيْنَهُمٰا اِنْ كُنْتُمْ مُوقِنِينَ﴾.(٢)

گوتی: خوای هەموو کوراتی ئاسمانی و زەوی و هەرچی لە بـەینیاندا هـەیە خـوای ئەوانیش و هەموو عالەمە ئەگەر بزانن و باوەڕتان هەبێ.

﴿قٰالَ لِمَنْ حَوْلَهُ اَلٰا تَسْتَمِعُونَ﴾.(٣)

فیرعەون ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: گوێتان لێیە چ جواب دەداتەوە؟ من لە خوای لێ دەپرسم ئەو باسی ئیشەکانی دەکا. حەزرەتی مووسا گوێی نەدایە و گوتی:

﴿قٰالَ رَبُّكُمْ وَ رَبُّ آبٰائِكُمُ الْاَوَّلِينَ﴾.(٤)

خوای ئێوە و خوای باب و باپیرانتان هەر یەکە.

﴿قٰالَ اِنَّ رَسُولَكُمُ الَّذي اُرْسِلَ اِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ﴾.(٥)

فیرعەون گوتی: خەڵکینە پێغەمبەرەکەتان شێتە من لە چی پرسیار لێ دەکەم و ئەو چیم جواب دەداتەوە؟

﴿قٰالَ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَ الْمَغْرِبِ وَ مٰا بَيْنَهُمٰا اِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ﴾.(٦)

حەزرەتی مووسا خۆی هەڵە کرد و گوتی: خوای ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا و هەرچی چاوتان پێدەکەوێ هەر یەکە ئەگەر عەقڵتان هەبێ.

---

(١) الشعراء: ٢٣. (٢) الشعراء: ٢٤. (٣) الشعراء: ٢٥.
(٤) الشعراء: ٢٦. (٥) الشعراء: ٢٧. (٦) الشعراء: ٢٨.

﴿قَالَ لَئِنِ اتَّخَذْتَ اِلٰهاً غَيْرِي لَاَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ﴾.(١)

فیرعەون هەڕەشەی کرد و گوتی: ئەی مووسا ئەگەر غەیری من بە خوا بزانی زیندانیت دەکەم. حەزرەتی مووسا لە سەر خۆ فەرمووی:

﴿قَالَ اَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَيْءٍ مُبِينٍ﴾.(٢)

ئەگەر موعجیزەشت نیشان بدەم هەر زیندانیم دەکەی؟

﴿قَالَ فَأْتِ بِهِ اِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾.(٣)

فیرعەون گوتی: دەدەی ئەگەر ڕاست دەکەی.

﴿فَاَلْقٰى عَصٰاهُ فَاِذٰا هِيَ ثُعْبٰانٌ مُبِينٌ﴾.(٤) ﴿وَ نَزَعَ يَدَهُ فَاِذٰا هِيَ بَيْضٰاءُ لِلنّٰاظِرِينَ﴾.(٥)

حەزرەتی مووسا عەساکەی فڕێدا و بوو بە هەژدیهایەک و دەستی کرد بە قۆرت و پێچ و حەزرەتی مووسا دەستی دەشەویلان کردەوە و بۆوە بە عەساکەی جاران، دەستیشی دە باخەڵ نا و هێنایەوە دەرێ چاوی لە بەر هەڵ نەدەهات لەبەر سپیانی.

﴿قَالَ لِلْمَلَاِ حَوْلَهُ اِنَّ هٰذٰا لَسٰاحِرٌ عَلِيمٌ﴾.(٦)

فیرعەون ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: بە ڕاستی مووسا ساحیرێکی زۆر گەورەیە.

﴿يُرِيدُ اَنْ يُخْرِجَكُمْ مِنْ اَرْضِكُمْ بِسِحْرِهِ فَمٰاذٰا تَأْمُرُونَ﴾.(٧)

مووسا دەی هەوێ بە سیحر لە وولاتی میسر دەرتان کا. جا چ تەگبیرێک دەکەن و دەڵێن چی؟ جا با لێرەدا هەموو لایەک بە خوا بسپێرین و ئەگەر عومر وەفای کرد سبەینێ دێینەوە خزمەت حەزرەتی مووسا و گوێ دەگرینەوە لە هێندێکی دی لە باسی بە سەرهاتی ئەو پێغەمبەرە گەورە و خۆشەویستە.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلٰى سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلٰى جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(١) الشعراء: ٢٩. (٢) الشعراء: ٣٠. (٣) الشعراء: ٣١.
(٤) الشعراء: ٣٢. (٥) الشعراء: ٣٣. (٦) الشعراء: ٣٧.
(٧) الشعراء: ٣٥.

٣

# حەزرەتی مووسا

## باسی «حەزرەتی مووسا» سەلامی خودای لە سەر بێ

بسم الله الرحمن الرحيم

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

با گوێ بگرینەوە بۆ باسی بەسەرهاتی حەزرەتی مووسا و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین. لە مەوعیزەی دوێنێدا گوتمان فیرعەون ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: تەگبیر چیە؟

﴿قٰالُوا اَرْجِهْ وَ اَخٰاهُ وَابْعَثْ فِى الْمَدٰائِنِ حٰاشِرِينَ﴾.(١)

گوتیان: مۆڵەتێک بۆ مووسا و هارون دانێ و پیاو بۆ شارەکان بنێرە.

﴿يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحّٰارٍ عَلِيمٍ﴾.(٢)

با هەر جادوگەر و سیحربازێک هەیە بانگیان کەن و بە سیحر مووسا بۆڕ دەن.

﴿فَجُمِعَ السَّحَرَةُ لِمِيقٰاتِ يَوْمٍ مَعْلُومٍ﴾.(٣)

---

(١) الشعراء: ٣٦.    (٢) الشعراء: ٣٧.    (٣) الشعراء: ٣٨.

فیرعەون پیاوی نارد هەرچی سیحرباز بوو کۆیـان کـردەوە، لە ڕۆژی دیـاری کـراودا فیرعەونیش بە وەزیر و وزەرا و لشکر و سپاوە و تـەواوی خـەڵکـی شـاری «مـیسر» لە مەیدانی دیاری کراوداکۆ بونەوە. حەزرەتی مووساش لەگەڵ هارونی برایدا هاتنە ناویان. جادوگەرەکان ڕوویان کردە فیرعەون و گوتیان: ئەگەر ئێمە بە سەر مووسادا سەرکەوتین خەڵاتمان دەکەی؟ گوتی بەڵێ خەڵاتیشتان دەکەم و بە چاوی حـوڕمـەتیش تـەماشاتان دەکەم و ڕوتبەشتان زیاد دەکەم، جادوگەرەکان ڕوویان کردە حەزرەتی مووسا وگوتیان: تۆ لە پێشەوە سیحری خۆت دەکەی یان ئێمە پێش کەوین؟ حەزرەتی مووسا فەرمووی: ئێوە چیتان لە دەست دێ بیکەن و پێش کەون. جادوگەرەکان سوێندیان خوارد و گوتیان: بـە گەورەیی فیرعەون ئێمە سەر دەکەوین. هەزاران گوریس و عەسا و وەکازیان فڕێ دایـە مەیدان. لە پێش چاوی خەڵک بوون بە مارو ئەژدیها و پەلاماری خەڵکیان دەداو خەڵک لە ترسان خەریک بوون ئەستۆی خۆیان بشکـێنـن. فـیرعەون و وەزیـرەکـان لە خـۆشـیان گەشکەیان گرتبو، لایان وا بوو تازە سەر دەکەون.

﴿فَاَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُوسىٰ﴾.(١)

بەڵام حەزرەتی مووسا لە دڵدا زۆر دەترسا پێی وا بوو ناتوانێ سیحرەکانیان بەتاڵ بکاتەوە.

﴿قُلْنا لا تَخَفْ اِنَّكَ اَنْتَ الْاَعْلىٰ﴾.(٢)

بەڵام خوا بە وەحی فەرمووی: یـا مـووسا مـەترسە تـۆ سـەر دەکـەوی، ئـەوەی بـە دەستەوەیە فڕێی دە تەواوی مار و ئەژدیهاکانی وان کۆ دەکاتەوە.

﴿فَاَلْقىٰ مُوسىٰ عَصٰاهُ فَاِذٰا هِيَ تَلْقَفُ مٰا يَأْفِكُونَ﴾.(٣)

حەزرەتی مووسا ناوی خوای هێنا و عەساکەی فڕێ دا، هەموو مار و ئەژدیهایەکانی هەڵ لووشین. ساحیرەکان کە ئەوەیان چاو پێ کەوت و ئەو موعجیزە گەورەیان دی هەمرو ئیمانیان هێنا و بە سوجدەدا کەوتن، فیرعەون وەخت بوو لە داخان شەق بەرێ، گـوتی: دیارە مووسا مامۆستاتانە لە جادوگەریدا، بۆیە نای وێرنێ بە بێ ئیزنی من ئیمانتان پێ

(١) طه: ٦٧. (٢) طه: ٦٨. (٣) الشعراء: ٤٥.

هێنا، ڕاوەستن دەست و قاچتان دەبڕم و بە سەر دار خورماوە هەڵتـان داوەسـم ئـەگـەر پەشیمان نەبنەوە، جا ئەو کاتە دەزانن عەزابی من ناخۆشترە یان ئی خوای مووسا، گوتیان: چیت لە دەست دێ بیکە.

﴿اِنَّا اِلیٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾.(١)

ئێمە رجوع دەبینەوە بۆلای خـوا، فـیرعەون ئـەمری کـرد دەست و قـاچی زووربـەی ساحیرەکانیان بڕی و هەڵیان هاوەسین و شەهیدیان کردن. فیرعەون دەستە و دائیرەکەی ئــەو هـەموو مـوعجیزە گـەورەیان دیـن کـە چـی ڕۆژ لە دوا ڕۆژ کـافرتر دەبـوون. پیاو ماقووڵەکانی گوتیان: ئەی پاشا ئەوە تا کەی بەنی ئیسرائیلیەکان ئاوا بەر هـەڵدا دەکـەی وڵاتەکەمان بە فەساد بەرن و تۆ و خواکانمان نەپەرستن؟ فیرعەون دڵخـوشی دانـەوە و گوتی: غەمتان نەبێ، کوڕەکانیان دەکوژم و کچەکانیان دەکەین بە جاریە و قرەواش. زۆریان لە بەنی ئیسرائیلیەکان کوشت، ئەوانیش پەنایان برد بۆ لای حەزرەتی مووسا و گـوتیان: قوربان زۆریان لێ کووشتووین چارمان چیە؟ فەرمووی: خۆتان ڕا گرن ئومێدم وایە خوا دوژمنی ئێوە بە هیلاک بەرێ و ئێوە بکا بە خاوەنی ئەو وڵاتە و خاوەن زەوی، جا خۆتان و کردەوەتان. ڕاوی دەڵێ ئاسیەی کچی مزاحیم بە دزی فیرعەون ئیمانی هێنا بوو کە ژنی فیرعەون بوو، ڕۆژێک لە بەر ئاوێنە سەری بە شانە دادێنا، شانەکەی لە دەست بەر بووە، تێک چوو گوتی: یا ربی ئاوا تەخت و بەختی فیرعەون تێک چێ، فیرعەون گوێی لێ بوو، بە توڕییەوە گوتی: دیارە ئیمانت بە مووسا هێناوە؟ ئاسیە گوتی: بەڵێ، فیرعەون توڕە بو و گوتی: ئەگەر پەشیمان نەبیەوە عەزابت دەدەم. ئاسیە گوتی: خان چ دەکـەی بـیکە! فیرعەون ئەمری کرد دەست و قـاچیان بـە گـوڵ مـیخ داکـوتان. لەو کـاتەدا حـەزرەتی جوبرەئیل هات و فەرمووی: ئەی ئاسیە دەرگای هەر حەوت ئاسمانەکان خراونە سـەر پشت و مەلائیکەی حەوت تەبەقەی ئاسمان تەماشای تۆ دەکەن، چی داوا دەکەی خوا بۆت جێ بە جێ دەکا، گوتی:

﴿رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتاً فِى الْجَنَّةِ وَ نَجِّنِي مِنْ فِرْعَونَ وَ عَمَلِهِ﴾.(٢)

---

(١) الشعراء: ٥٠. (٢) التحريم: ١١.

ئەی خوای گەورە داوا دەکەم خانوێکم لە بەهەشت بۆ دروست بکەی و لە دەست فیرعەون و ناپیاوەکانی نەجاتم بدەی، خوا داواکەی وەرگرت و وەفاتی کرد. ئەو هەموو ئامۆژگاری‌یە جوانانەی حەزرەتی مووسا هیچ سوودیان نەبو، ڕۆژ لە دوا ڕۆژ فیرعەون و دار و دەستەکەی کافرتر دەبوون و ئەزیەتی موسوڵمانەکانیان زیاتر دەدا. ڕۆژێک حەزرەتی مووسا و هارون دوعایان لێ کردن و حەزرەتی مووسا فەرمووی:

﴿رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَونَ وَ مَلأَهُ زِينَةً وَ أَمْوَالاً فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا عَنْ سَبِيلِكَ﴾.(١)

ئەی خوای ئێمە تۆ زینەتی دنیا و ماڵ و سەروەتێکی زۆرت داوە بە فیرعەون و دارو دەستەکەی. ئەی خوای ئێمە بۆ ئەوەی بە هۆی ئەو ماڵ و سەروەتە لە ڕێگای ڕاستی تۆ لادەن.

﴿رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَىٰ أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلا يُؤْمِنُوا حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾.(١)

ئەی خوای گەورە ماڵیان بە دەستەوە مەهێڵە و دڵیان ڕەشتر بکە، چونکە تا عەزاب نەبینن ئیمان ناهێنن.

﴿قَالَ قَدْ أُجِيبَتْ دَعْوَتُكُمَا﴾.(٢)

خوا فەرمووی: دوعاکەم گیرا کردن و بە هۆی دوعا کردنی ئێوە.

﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ﴾.(٣)

تۆفانێکمان ناردنە سەر باغ و باغات و مەڕ و ماڵات و زەوی و زار و زەراعەت و فەلاحەتەکەی نەهێشتن.ساڵی دووایی کوللەمان بە سەردا باراندن تەڕ و یوشیان وەکێک دەخوارد و شینایی لە شاری میسر بڕی و هیچیان نەما و زۆریان لە برسان مردن. جارێکی دی لشکری ئەسپێیانمان ناردنە سەر، ئامانیان پێ هەڵگرتن و خەو و خواردنیان نەما. ساڵێکی دی بۆقمان بە سەردا باراندن دەکەوتنە ناو چێشتیانەوە، دەچونە ناو بەرگ و لیباسیانەوە، دەچوونە ناو لێفە و دۆشەکیانەوە. ئنجا تووشی نەخۆشی نەزیف و خوێن

---

(١) و (١) یونس: ٨٨. (٢) یونس: ٨٩. (٣) الأعراف: ١٣٣.

بوون و خوێن ڕاسانمان کردن. یان وەکو بە ڕیوایەتێکی دی دەڵێن بە قودرەتی خوا تا چل شەو و ڕۆژ کە قیبتیەکان دەچوون بۆ ئاو خواردنەوە و ئاو هەڵێنجان ئاوەکە لە مست و گۆزەکانیاندا دەبوو بە خوێن، بەڵام بۆ موسوڵمانەکان هەر ئاوی ڕوون بوو. ئەوکافرانە تا تووشی یەکێک لەو بەڵایانە دەبوون پەنایان دەبردە بەر حەزرەتی مووسا و دەیان گوت:

﴿يٰا مُوسَى ادْعُ لَنٰا رَبَّكَ بِمٰا عَهِدَ عِندَكَ لَئِنْ كَشَفْتَ عَنَّا الرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ﴾.(١)

ئەی مووسا دوعامان بۆ بکە خوا ئەو بەڵایانەمان لە سەر لا با، ئەگەر ئەو بەڵا و عەزابەمان لە سەر هەڵگرێ ئیمانت پێ دێنین. حەزرەتی مووسا دووعای دەکرد و بەڵاکەیان لە سەر لا دەچوو.

﴿فَلَمّٰا كَشَفْنٰا عَنْهُمُ الرِّجْزَ اِلىٰ اَجَلٍ هُمْ بٰالِغُوهُ اِذٰا هُمْ يَنْكُثُونَ﴾.(٢)

بەڵام خوا دەفەرمووێ: کاتێک عەزابەکەمان پاش ماوەیەکی دیاری کرا و لە سەر لا بردن گورج پەشیمان دەبوونەوە و دەچوونەوە سەر قەراری جاران.

بە موعجیزەی عەسا و یەدی بەیزا و توفان و کولله و ئەسپێ و بۆق و بوونی ئاو بە خوێن و سەروەت نەمانیان هیچ عیبرەت گرتوو نەبوون و ئیمانیان نەهێنا و موسوڵمانەکانیان هەر نارەحەت‌تر دەکردن.

﴿وَ لَقَدْ اَوْحَيْنٰا اِلىٰ مُوسىٰ اَنْ اَسْرِ بِعِبٰادي﴾.(٣)

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئێمە وەحی‌مان کرد بۆ لای مووسا کە بە شەو لەگەڵ بەنی‌ئیسرائیلیەکان میسر بە جێ بێڵن و بەرەو فەلەستین وەرێ کەون.

﴿فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقاً فِي الْبَحْرِ يَبَساً لٰا تَخٰافُ دَرَكاً وَ لٰا تَخْشىٰ﴾.(٤)

خوا فەرمووی: کە چوییە سەر بەحری ڕەش عەساکەت لە بەحرەکە بدە و لەوە مەترسە دوژمن بتان گاتێ، یان غەرق بن، چونکە کاتی بە هیلاک چوونی فیرعەون و قەومەکەی نزیک بۆتەوە.

لەو کاتەشدا حەزرەتی جوبرەئیل بە فەرمانی ڕەببی جەلیل خۆی بردە سەر وێنەی پیاوێک و چوو بۆ لای فیرعەون و گوتی: ئەی پاشا من بەندەیەکم لە بەندەکانی تۆ،

---

(١) الأعراف: ١٣٤. (٢) الأعراف: ١٣٥. (٣) و (٤) طه: ٧٧.

عەبدێکم هەیە هەموو ناز و نیعمەتێکم داوەتێ، بەڵام هیچم بە قسە ناکا و خۆی وەک من حیساب دەکا، جەزای ئەو عەبدە چیە؟ فیرعەون گوتی: عەبدی وا دەبێ لە بەحردا غەرق بکرێ، فەرمووی: دە بۆم بنووسە، فیرعەون بە خەتی خۆی نووسی هەر عەبدێک بە قسەی گەورەی خۆی نەکا دەبێ بخرێتە بەحرەوە. حەزرەتی جوبرەئیل نامەکەی هەڵگرت و هاتە دەرەوە چوو ئەو کارەساتەی بۆ حەزرەتی مووسا گێڕایەوە، حەزرەتی مووسا بەنی ئیسرائیلیەکانی کردە دوازدە دەستە و شەو بە نەهێنی لە میسر وەدەرکەوتن و ڕۆیشتن و بەیانی ئەو شەوە گەینە سەر بەحری سوور لە خەلیجی سویس هەر ئەو شەوە فیرعەون خەبەری زانی بە خۆیی و لشکرێکی زۆرەوە، دوایان کەوت، لە کاتی ڕۆژهەڵاتدا لێیان نزیک بۆوە، بەنی ئیسرائیلیەکان کە چاویان بە فیرعەون و لشکرەکەی کەوت زۆر ترسان، عەرزی حەزرەتی مووسایان کرد قوربان ئەوا فیرعەون بە خۆ و لشکرێکی زۆرەوە گەییە سەرمان چارمان چیە؟ حەزرەتی مووسا فەرمووی: مەترسن، خوامان لەگەڵە.

﴿فَاَوْحَيْنَا اِلَىٰ مُوسىٰ اَنِ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ﴾.(١)

خواوەندی گەورە لە قورئاندا دفەرمووێ: لەو کاتەدا وەحیمان کرد بۆ مووسا و گوتمان: یا مووسا عەساکەت لە دوازدە جێگاوە بە بەحرەکەدا بێنە.

﴿فَانْفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ﴾.(٢)

حەزرەتی مووسا عەساکەی لە دوازدە جێگا بە بەحرەکەدا هێنا و لە هەر دوازدە جێگا بەحر شەق بوو، ئاوەکە بەرز بۆوە وەک کێوی گەورە ئەمبەر و ئەو بەری ڕێگای گرت، بەنی ئیسرائیلیەکان هەر دەستەی بە ڕێگایەکدا دەستیان کرد بە پەڕینەوە، لەو وەختەدا فیرعەون بە خۆیی و هامان و وزەڕا و لشکرەوە گەییە سەر بەحر، تەماشای کرد لە دوازدە لاوە بەحرەکە شەق بووە و بەنی ئیسرائیلیەکانی پێدا دەپەڕنەوە، ڕووی کردە لشکر و سوپاکەیی و گوتی: بزانن بۆ ئەوەی بگەینە سەر بەنی ئیسرائیلیەکان ئەو بەحرە چۆن شەق بووە؟ ئەوانیش باوەڕیان کرد و وەدوای کەوتن، بەڵام تا ئەمان گەینە ناوەڕاستی بەحر حەزرەتی مووسا و موسوڵمانەکان پەڕینەوە. ئنجا خوا ئەمری کرد بە ئاوی بەحرەکە وێک

---

(١) و (٢) الشعراء: ٦٣.

کەوێتەوە، بە ئەمری خوا ئاوی بەحرەکە لە پێشەوە و لە دواوەیان ڕا هاتەوە یەک و تەواوی لشکری فیرعەون غەرق بوو، لەو کاتەدا حەزرەتی جوبرەئیل هات ئەو نامەی کە لە پێشەوە گوتمان فیرعەون بە خەتی خۆی نووسی بووی دایە دەست فیرعەون. کە کاغەزەکەی خوێندەوە زانی ڕزگاری نابێ.

﴿قٰالَ آمَنْتُ اَنَّهُ لٰا اِلٰهَ اِلَّا الَّذي آمَنَتْ بِهِ بَنُوا اِسْرٰائيلَ وَ اَنَا مِنَ الْمُسْلِمينَ﴾.(١)

گوتی: ئیمانم هەیە کە هیچ خوایە نیە ئەو خوایە نەبێ کە بەنی‌ئیسرائیلیەکان ئیمانیان پێ هێناوە ئەوا منیش بوومە یەکێک لە موسوڵمانان و ئیمانم هێنا، وەی زانی وەک جاران کە پەشیمان بۆوە ڕزگاری دەبێ.

﴿اَلْآنَ وَ قَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَ كُنْتَ مِنَ الْمُفْسِدينَ﴾.(٢)

حەزرەتی جوبرەئیل فەرمووی: تازە ئیمان دێنی؟ تا ئێستا گوناهت کرد و فاسید بووی تازە پەشیمانی هیچ سوودی نیە، فیرعەونیش غەرق بوو، حەزرەتی مووسا بە موسوڵمانەکانی گووت فیرعەون خنکا بەڵام ئەوان لە خۆشیان باوەڕیان نەدەکرد، حەزرەتی مووسا لە خوای داوا کرد کەلاکی فیرعەون سەر ئاو کەوێ، بە ئەمری خوا کەلاکی فیرعەون کەوتە سەر ئاوەکە و بەنی‌ئیسرائیلیەکان ئاسوودە بوون. جا لەو کاتەوە تا ئێستا ئاو مردو ڕا ناگرێ و سەر ئاو دەکەوێ. ئنجا بەنی‌ئیسرائیلیەکان بەرە و فەلەستین کەوتنە ڕێ، لە ڕێگادا تووشی قەومێک بوون بتیان دەپەرست. جا چونکە ئەوانیش لە میسر گەورە بووبون و خۆشیان زوو بت‌پەرست بوون، داوایان لە حەزرەتی مووسا کرد و گوتیان: یا مووسا دە تۆش چەند خوای ئاوامان بۆ پەیدا بکە، حەزرەتی مووسا فەرمووی: دیارە ئێوە زۆر نەفامن نازانن بت‌پەرستی شتێکی بەتاڵە؟! تۆبە بکەن تا خوا غەزەبی لێ نەگرتون! بەنی‌ئیسرائیلیەکان تۆبەیان کرد و پەشیمان بوونەوە. ڕۆیشتن تا گەیشتنە شیبهە جەزیرەی سینا، دنیا زۆر گەرم بوو، خانوێک نەبوو بچنە ناوی، دارێک نەبوو لە ژێر سێبەری دانیشن و تاوێک وەحەسێن، ئاوی شیرین نەبوو وەی‌خۆن لە شیر بەولاوە پێ‌خۆر دەست نەدەکەوت، زۆر نارەحەت بوون، ئەو ژیانەیان نەدیبوو، لە میسر گەورە

---

(١) یونس: ٩٠. (٢) یونس: ٩١.

بیوون، چونە خزمەت حەزرەتی مووسا و شکایەتی حاڵی خۆیان کرد و حەزرەتی مووسا دوعای بۆ کردن.

﴿وَ اَوْحَيْنٰا اِلَىٰ مُوسىٰ اِذِ اسْتَسْقٰاهُ قَوْمُهُ اَنِ اضْرِبْ بِعَصٰاكَ الحَجَرَ فَانْبَجَسَتْ مِنْهُ اثْنَتٰا عَشَرَةَ عَيْناً قَدْ عَلِمَ كُلُّ اُنٰاسٍ مَشْرَبَهُمْ﴾.(۱)

خوا دەفەرمووێ: کە قەومەکەی داوای ئاویا نلە مووسا کرد گوتمان عەساکەت لەو بەردە زلە ڕاکێشە، کە وای کرد لە دوازدە جێگا دوازدە سەرچاوەی لێ جاری بوو، هەر تائیفەی سەرچاوەی خۆی دیاری کرا بوو دەیزانی.

﴿و ظَلَّلْنٰا عَلَيْهِمُ الْغَمٰامَ وَ اَنْزَلْنٰا عَلَيْهِمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوىٰ﴾.(۲)

هەورمان نارد لەنگەری لە سەر ڕاگرتن و سێبەری لە سەر کردن تا گەرمایان نەبێ. گەزۆ و سەلوامان بۆ باراندن تا برسیان نەبێ پێمان گوتن:

﴿كُلُوا مِنْ طَيِّبٰاتِ مٰا رَزَقْنٰاكُمْ﴾.(۳)

بخۆن لەو رزقە پاکەی داومانە بە ئێوە، بەڵام بە داخەوە بەنی ئیسرائیلیەکانیش زۆر سپڵە بوون، بەهانەی زۆریان بە حەزرەتی مووسا دەگرت، داوای زۆر شتی بێ جایان دەکرد. هەر وەکو تا ئێستاش ئەو خووە لە دڵی جولەکەکاندا ماوەتەوە.

جا با ئەو ڕۆژ لێرەدا ئێوە و حەزرەتی مووسا بە خوا بسپێرم و تا مەجلیسی بەیانی خوا ئاگاداری هەموو لایەکمان بێ.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(۱) و (۲) و (۳) الأعراف: ۱۶۰.

**٤**

# حەزرەتی مووسا

## باسی «حەزرەتی مووسا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

با بۆ باسی هێندێکی دیش گوێی ڕاگرین لە ژیان و بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە گەورە کە حەزرەتی مووسایە و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین حەزرەتی مووسا هەر لە میسر موژدەی دابوو بە بەنی ئیسرائیلیەکان کە بەو زوانە فیرعەون لە بەین دەچێ و خوای گەورە کتێبێکی بۆ دەنێرێ دەبێ پەیرەوی لە یاسا و بەندەکانی بکەن. جا لە دوا ئەوە کە فیرعەون غەرق بوو ئەوانیش بەرەو فەلەستین کەوتنە ڕێ. حەزرەتی مووسا داوای لە خوا کرد کە کیتابە ئاسمانیەکەی بۆ بنێرێ.

﴿وَ وٰاعَدْنٰا مُوسَىٰ ثَلٰاثِ...﴾.(١)

خوا دەفەرمووێ: ئێمە وەعدەمان بۆ حەزرەتی مووسا دانا کە بچێتە سەر کێوی توور و

---

(١) الأعراف: ١٤٢.

سی ی ڕۆژ لەوی وەمێنێ و بە ڕۆژو بێ. حەزرەتی مووساغ بە ئەمری خوا چۆ بۆ کێوی توور و سی ی ڕۆژ لەوێ بە ڕۆژو بوو خەریکی خواپەرستی بوو.

﴿وَ اَتْمَمْنٰاهٰا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقٰاتُ رَبِّهِ اَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾.(١)

خوا دەفەرمووێ: دە ڕۆژی دیشمان بۆ زیادکرد. چل ڕۆژ بە ڕۆژو بوو.

﴿وَ قٰالَ مُوسىٰ لِاَخِيهِ هٰارُونَ اخْلُفْنِي فِي قَوْمِي وَ اَصْلِحْ وَ لٰا تَتَّبِعْ سَبِيلَ الْمُفْسِدِينَ﴾.(٢)

بەڵام لە کاتی ڕۆیشتندا بە هارونی برای گوت: تا دێمەوە تۆ جێ‌نشینی من بە و وەدووا قسەی پیاو خەراپان مەکەوە و بە سەهووت نەبەن ئاگات لە خۆ بێ.

﴿وَ لَمّٰا جٰاءَ مُوسىٰ لِمِيقٰاتِنٰا وَ كَلَّمَهُ رَبُّهُ قٰالَ رَبِّ اَرِنِي اَنْظُرْ اِلَيْكَ﴾.(٣)

جا کاتێک حەزرەتی مووسا چل ڕۆژەی تەواو کرد و خواوەندی گەورە بە کەلامی ئەزەلی قسەی لە گەڵدا کرد و حەزرەتی مووسا ئەو روتبە و مەقامە و شەرەفەی دەس کەوت، شەوق و ئارەزووی دیداری نووری جەماڵی خوای کەوتە سەر و گوتی: ئەی خوای گەورە زۆر حەز دەکەم بە دیدارت شاد بم و خۆتم نیشان بدەی.

﴿قٰالَ لَنْ تَرٰانِي وَ لٰكِنِ انْظُرْ اِلَى الْجَبَلِ فَاِنِ اسْتَقَرَّ مَكٰانَهُ فَسَوْفَ تَرٰانِي﴾.(٤)

خوا فەرمووی: یا مووسا تۆ من نابینی، بەڵام تەماشا ئەو کێوە بکە کە زۆر لە تۆ گەورەترە و بە قووەت‌ترە، قوردرەت وگەورەیی و عەزەمەتی خۆمی نیشان دەدەم، ئەگەر خۆی لە بەر ڕاگرت ئەوە وا دەکەم تۆش بم بینی.

﴿فَلَمّٰا تَجَلّٰى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَ خَرَّ مُوسىٰ صَعِقاً﴾.(٥)

کاتێک خوای گەورە نووری عەزەمەتی خۆی نیشانی کێوەکە دا وەک هورەی لۆکەی بڵاو بۆوە، حەزرەتی مووساکە وای چاو پێ کەوت بە لادا هات وبێ هۆش کەوت.

﴿فَلَمّٰا اَفٰاقَ قٰالَ سُبْحٰانَكَ تُبْتُ اِلَيْكَ وَ اَنَا اَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ﴾.(٦)

کاتێک وەهۆش خۆی هاتەوە شادە و ئیمانیکی بە حەقی هێنا و گوتی: ئەی خوای گەورە پاک و خاوێنی هەر بۆ تۆیە و تۆبە، من یەکەم کەسم کە شاهیدی دەدەم کە کەس ناتوانێ لە دنیادا تۆ ببینێ.

---

(١) و (٢) الأعراف: ١٤٢. (٣) و (٤) و (٥) و (٦) الأعراف: ١٤٣.

﴿قَالَ يَا مُوسىٰ اِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالَاتِي وَ بِكَلَامِي فَخُذْ مَا آتَيْتُكَ وَ كُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾.(١)

ئنجا خوا فەرمووی: یا مووسا ئەوا من تۆم هەڵبژارد لە ناو خەڵکدا بۆ ئەوەی بتکەم بە پێغەمبەر و قسەت لە گەڵدا بکەم و ئەو تەوراتە وەرگرە و بچۆ بۆ قەمەکەتی وەخوێنە و شوکرانەی خوا بکە.

لە گەڕانەوەدا خوا فەرمووی: یا مووسا تا تۆ گەڕایەوە سامیری قەومەکەتی گومڕا کرد.

﴿فَرَجَعَ مُوسىٰ اِلىٰ قَوْمِهِ غَضْبَانَ اَسِفاً﴾.(٢)

حەزرەتی مووسا زۆر بە تووڕەییەوە گەڕایەوە بۆ لای قەومەکەی. با ئەوەش بزانین کە بەنی ئیسرائیلیەکان چونکە لە میسر بوون، خو و ڕەوشتی میسریەکانیان گرتبوو، زۆریان زۆر ساویلکە بوون و زوو بە سەهو دەچوون. حەزرەتی مووساش کە چوو بۆ کێوی توور قەوڵ وا بوو پاش سی‌ی ڕۆژ بگەڕێتەوە بەڵام چل ڕۆژ تێ پەڕی هەر نەهاتەوە. بەنی ئیسرائیلیەکان لە ناو خۆیاندا لێیان بوو بە مقۆمقۆ، هێندێکیان دەیان گوت: حەزرەتی مووسا وەعدە بە خیلاف دەرچوو، دەیگوت پاش سی‌ی ڕۆژ دەگەڕێمەوە کە چی ئەوا چل ڕۆژیش تێپەڕی هەر نەهاتەوە!

سامیری کە یەکێک بوو لە گومڕاکان زۆر شەیتان بوو، بە هەلی زانی هات تەواوی ئاڵتونی ژنە بەنی ئیسرائیلیەکانی کۆ کردەوە و تواندییەوە و لە سەر شکڵی گوێرەکەیەک بە قاڵب دای ڕشت.

جا بە ڕیوایەتێک دەڵێن: تۆزی ژێر سمی ئەسپی حەزرەتی جوبرەئیلی هەڵ گرتبۆوە کردیە ناو دەمی گوێرەکەکە و وەدەنگ هات و سامیری گوتی: ئەوە خواتانە، تازە حەزرەتی مووسا ناگەڕێتەوە. زوربەی خەڵکەکە ئیمانی پێ هێنا و باوەڕیان کرد. هێندێکیش دەڵێن: کە بای هەڵدەکرد لە کونی خوارەوەی‌ڕا دەهات و لە دەمی دەهاتە دەرێ و دەنگێکی لێ پەیدا دەبوو وەک گوێرەکە دەی هۆڕاند. هارون کە خەبەری زانی دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنیان و گوتی:

(١) الأعراف: ١٤٤. (٢) الأعراف: ١٥٠.

﴿يٰا قَوْمِ اِنَّمٰا فُتِنْتُمْ بِهِ و اِنَّ رَبَّكُمُ الرَّحْمٰنُ﴾.(١)

ئەی قەومی من بە هۆی ئەو گوێرەکەوە خۆتان تووشی فیتنە و گومڕاهی کردووە، ئەو گوێرەکە خوا نیە! خوای ئێوە خاوەن ڕوحم و کەرەمە.

﴿قٰالُوا لَنْ نَبْرَحَ عَلَيْهِ عٰاكِفِينَ حَتّٰى يَرْجِعَ اِلَيْنٰا مُوسىٰ﴾.(٢)

لە جوابدا گوتیان: ئێمە دەستی لێ هەڵناگرین تا حەزرەتی مووسا نەگەڕێتەوە بۆ لامان هەرچەند هارون کردی وکراندی جوابیان نەدایەوە جا وەختێک حەزرەتی مووسا بە ڕڕق هەستاوی و توڕەییەوە هاتەوە زۆریان لێ تۆڕە بوو.

﴿وَ اَلْقَى الْاَلْوٰاحَ وَ اَخَذَ بِرَأْسِ اَخِيهِ يَجُرُّهُ اِلَيْهِ﴾.(٣)

لە داخان ئەو لەوحانەی تەوراتیان لێ نوسرابۆوە فڕێی دانوو ڕیشی هارونی برای ڕاکیشا و هێنای بۆ پێش خۆی وگوتی: بۆ ئاگات لێ نەبوون و هێشتوتن گوێرەکە بپەرستن؟ حەزرەتی هارون دەستی کرد بە گریان و گوتی: کاکە ڕیشم ڕامەکێشە و دوژمنانم پێ خۆش مەکە و لێم توڕە مەبە خەتام نیە، زۆرم ئامۆژگاری کردن بە قسەیان نەکردم، لە ترسی ئەوەش کە تۆ نەڵێی جیاوازیت خستۆتە ناو بەنی ئیسرائیلیەکانەوە بە گژیاندا نەچووم، تەنانەت زۆریشی نەمابوو بم کوژن. ئنجا حەزرەتی مووسا سامیری بانگ کرد و زۆری لێ توڕە بو و فەرمووی:

﴿قٰالَ فَمٰا خَطْبُكَ يٰا سٰامِرِيُّ﴾.(٤)

ئەو گوێرەکەت لە چی دروست کرد و فیتنەت بۆ خستە ناو قەومەکەوە؟ گوتی: قوربان کاتێک حەزرەتی جوبرەئیل سواری ئەسپ ببوو چاوم لێ بوو ئەسپەکەی پێی لە هەر گژ و گیایەک بنایە فەوری شین دەبوو، لە تۆزی بەر پێی چنگێکم هەڵگرتبوو خستمە ناو دەمی گوێرەکەکە و دەنگ هات. حەزرەتی مووسا ڕووی کردە ئاسمان و گوتی:

﴿اِنْ هِيَ اِلّٰا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهٰا مَنْ تَشٰاءُ وَ تَهْدِي مَنْ تَشٰاءُ﴾.(٥)

ئەی خوای گەورە هەرچی هەیە بە دەست تۆیە و فیتنەی تۆیە. هێندێکیان گومڕا دەکەی و هێندێکیان هیدایەت دەدەی. خوا فەرمووی: یا مووسا! خەتای خۆت بوو، تۆ کە

---

(١) طه: ٩٠. (٢) طه: ٩١. (٣) الأعراف: ١٥٠.
(٤) طه: ٩٥. (٥) الأعراف: ١٥٥.

هاتی بۆ کێوی توور قەومەکەت بە هارون سپارد بە منت نەسپارد بۆیە وایان بە سەر هات. ئنجا ڕووی کردە سامیری و گوتی: بڕۆ خەجاڵەت بی لە دنیادا کەس وێت ناکەویٚ و لە قیامەتیشدا بە جەزای خۆت دەگەی. گوێرەکەکەشی ورد کرد و سووتاندی و دەبەحری هاویشت. سامیریش تا مرد کەس قسەی لەگەڵ نەکرد و لە داخان لەکەلاوەیەکدا سەری نایەوە، بەنی‌ئیسرائیلیەکانیش پەشیمان بوونەوە و گوتیان: یا مووسا چارمان چیە؟ ئەگەر خوا ڕەحممان پیٚ نەکا بە هیلاک چوین، حەزرەتی مووسا فەرمووی: تۆبە بکەن و نەفسی خۆتان بشکێنن و تەرکی شەهوەت و دنیا پەرستی بکەن و بە قسەی پێغەمبەری خۆتان بکەن تا خوا عەفووتان بکا. گوتیان: باشە تۆبە دەکەین ئنجا بە ئەمری خوا حەزرەتی مووسا حەفتا کەسی لە پیاو ماقووڵەکانیان هەڵبژارد و بۆ دوعا و پاڕانەوە لەگەڵ خۆیدا بردنی بۆ کێوی توور کە حەزرەتی مووسا لە کێوی توور دەستی کرد بە دوعا و پاڕانەوە و قسەکردن لە خزمەت خوادا، پیاوەکان گوێیان ڕاگرتبوو، هێندێکیان کافر بوونەوە گوتیان:

﴿يَا مُوسىٰ لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ حَتّٰى نَرَى اللّٰهَ جَهْرَةً﴾.(١)

ئیمانت پیٚ ناهێنین تا بە ئاشکرا خوا نەبینین، لەوکاتەدا بە ئەمری خوا کێوی توور لە پێش چاویان بەرز بۆوە بۆ ئاسمان و هات لە سەر سەریان لەنگەری گرت. هەور و بەرق و بروسکە دەستیان کرد بە لیکدان و شریخ و هوڕ، عەرز و ئاسمانیان هێنایە لەرزین، ئەوانیش لە ترسان کەوتن بە عەرزدا و لە هۆش چوون، حەزرەتی مووسا کە وای چاو پیٚ کەوت گوتی:

﴿قٰالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ اَهْلَكْتَهُمْ مِنْ قَبْلُ وَ اِيّٰاىَ﴾.(٢)

ئەی خوای گەورە ئەگەر ئارەزوت بکردایە لە پێش ئەوەدا ئەوانیش و منیشت بە هیلاک دەبردن.

اَتُهْلِكُنٰا بِمٰا فَعَلَ السُّفَهٰاءُ مِنّٰا﴾.(٣)

فەرمووی: ئەی خوای گەورە ئایا بە هۆی کردەوەی چەند کەسێکی بیٚ عەقڵ ئێمەش بە هیلاک دەبەی؟ حەزرەتی مووسا دەستی کرد بە دوعا و پاڕانەوە. خوا دوعاکەی گیرا

(١) البقرة: ٥٥. - (٢) و (٣) الأعراف: ١٥٥.

کرد و وەهۆش هاتنەوە و ئەو جاریش عەفووی کردن و گەڕانەوە. دوبارە حەزرەتی مووسا دەستی کردەوە بە ئامۆژگاری کردنیان بەڵام چونکە زۆر بەد ئەخلاق بوون ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەهانەی خەراپتریان بە حەزرەتی مووسا دەگرت. ڕۆژێک دەیان گوت: لەگەڵ هارونی برات بڕو بۆ غەزا، دەمێک دەیان گوت: ئێمە لێرە دادەنیشین لەگەڵ خوادا بچن فەلەستینمان بۆ بگرن. جا دەچین بۆ فەلەستین جا با بچینە سەر باسی چاو پێ کەوتنی حەزرەتی مووسا بەو عەبدە ساڵحە کە هیندێک لایان وایە حەزرەتی خضر بووە. دەڵێن ڕۆژێک حەزرەتی مووسا ئامۆژگاری قەومەکەی دەکرد، لە دوا تەواو بوونی مەوعیزەکەی یەکێک گوتی: ئەریێ قوربان کەس لە تۆ داناتر و زاناتر هەیە لە سەر دنیا؟ فەرمووی: نەخێر جا بە زاهیریش وا بوو چونکە ئەو گەورەی هەموو پێغەمبەرانی ئەو سەردەمە بوو. فیرعەون لە سەر دەستی وی بە هیلاک چوو بوو، موعجیزەی عەسا و یەدی بەیزای هەبوو، تەوراتی بۆ بە خەڵات هاتبوو، قسەی لە خزمەت خواداکردبوو، بەڵام خواوەندی گەورە عیتابی لێ گرتو و فەرمووی: یا مووسا وا مەزانە کە کەس لە تۆ زاناتر نیە و تۆ لە هەموو کەس زاناتری، وا نیە، من بەندە و عەبدێکم هەیە زۆر لە تۆ زاناترە، حەزرەتی مووسا بەو عیتابە لە قسەی خۆی پەشیمان بۆوە و گوتی: ئەی خوای گەورە، زۆر حەز دەکەم ئەو عەبدەم چاو پێ بکەوێ، تا لە خزمەتیدا بەهرەمەند بم.

خوای تەعالا فەرمووی: ئەگەر بچیە نزیک ئەو جێگایە کە دەریای فارس و دەریای ڕۆم، یان بەحری سپی و بەحری سور تێکەڵ دەبن چاوت پێ دەکەوێ، حەزرەتی مووسا فەرمووی: ئەی خوای گەورە عەلامەت و نیشانەیێکم بۆ دانێ. خوا فەرمووی: یا مووسا ماسیێکی سوور کراوە لەگەڵ خۆت بەرە و بڕۆ، لە هەر جێگایەک ماسیەکەت لێ وون بوو لەو جێگایە بە خزمەت ئەو عەبدە زانایە دەگەی. حەزرەتی مووسا یوشەع کوڕی نوونی لەگەڵ خۆی برد و کەوتە ڕێ، هەر وەکو خوای گەورە لە سورەی «الکهف»دا بە تەواوی ئەو بەسەر هاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ:

﴿وَ اِذْ قٰالَ مُوسىٰ لِفَتٰاهُ لٰا اَبْرَحُ حَتّٰى اَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ اَوْ اَمْضِىَ حُقُباً﴾.(١)

---

(١) الکهف: ٦٠.

ئەی پێغەمبەر تۆ باسی حەزرەتی مووسا بۆ ئوممەتەکەت بگێڕەوە کە بـە یـوشـەعی کوڕی نوونی گوت: وەرە با بڕۆین و هەر دەڕۆم و ڕاناوەستم ئەگەر زۆریشم پێ بچێ تا دەگەمە مەجمەعی بەحرەین

﴿فَلَمّٰا بَلَغٰا مَجْمَعَ بَيْنِهِمٰا نَسِيٰا حُوتَهُمٰا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَباً﴾.(١)

کاتێک گەیشتنە ئەو جێگایە کە دیاری کرا بوو بۆ مولاقات، بەڵام ئەوان نەیاندەزانی ئەوێیە، دانیشتن بۆ حەسانەوە و حەزرەتی مووسا سەری وە سەر بەردێک کرد و خەوی لێ کەوت. جا بە ڕیوایەتێک دەڵێن لەو کاتەدا خوای گەورە هەورێکی هێنا و چەند دڵۆپە باران بارین و بە دڵۆپە بارانەکان ماسیەکە زیندو بۆوە و خۆی هاویشتە ناو بەحرەکـەوە. هێندێکیش دەڵێن: کانی و سەرچاوەی ئاوی حەیات لەوێ بوو، حەزرەتی یوشەع چـوو دەست نوێژی لێ هەڵگرت، کە هاتەوە چەند دڵۆپە ئاوێک لە دەستی پـڕژان وە پشـتی ماسیەکە کەوتن و زیندو بۆوە. جا هەر کامیان بێ هەر موعجیزەی حەزرەتی مـووسایە. یوشەع کە وای زانی چوو بە حەزرەتی مووسا بڵێ، بەڵام شەیتان لە بیری بردەوە.

﴿فَلَمّٰا جٰاوَزٰا قٰالَ لِفِتٰاهُ آتِنٰا غَدٰائَنٰا لَقَدْ لَقِينٰا مِنْ سَفَرِنٰا هٰذٰا نَصَباً﴾.(٢)

کاتێک حەزرەتی مووسا لە خەو خەبەری بۆوە و هەستان ڕۆیشتن و دور کەوتنەوە، حەزرەتی مووسا ڕوی کردە یوشەع و فەرمووی: با دانیشین و نانەکەمان بخۆین بە ڕاستی زۆرم برسی‌یە و لەو سەفەرە زۆر ماندو بووم.

﴿قٰالَ اَرَاَيْتَ اِذْ اَوَيْنٰا اِلَى الصَّخْرَةِ فَاِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَ مٰا اَنْسٰانِيهِ اِلَّا الشَّيْطٰانُ اَنْ اَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَباً﴾.(٣)

یوشەع کە دەستی بۆ زەمیلەکە برد بەسەرهاتی ماسیەکەی وەبیر هاتەوە و بە شەرمەوە بۆ حەزرەتی مووسای گێڕایەوە و گوتی: کە چووینە سەر بەردەکە و جەنابت خەوت لێ کەوت ماسیەکە زیندو بۆوە و خۆی فڕێدایە ناو بەحرەکە خەیاڵم بوو عەرزت کەم بەڵام شەیتان لە بیری بردمەوە.

﴿قٰالَ ذٰلِكَ مٰا كُنّٰا نَبْغِ فَارْتَدّٰا عَلىٰ آثٰارِهِمٰا قَصَصاً﴾.(٤)

---

(١) الکهف: ٦١. (٢) الکهف: ٦٢. (٣) الکهف: ٦٣.
(٤) الکهف: ٦٤.

حەزرەتی مووسا کە ئەو خەبەرەی بیست زۆر خۆشحاڵ بوو، گوتی: ئەوەی لێی دەگەڕێین ئەوا نیشانەی دەرکەوتن. بە جێ پێی خۆیاندا گەڕانەوە تا چوونە نزیک ئەو جێگایە کە ماسیەکەی لێ زیندوو بۆوە.

﴿فَوَجَدٰا عَبْداً مِنْ عِبٰادِنٰا آتَيْنٰاهُ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنٰا وَ عَلَّمْنٰاهُ مِنْ لَدُنّٰا عِلْماً﴾.(١)

خوا دەفەرمووێ: لەوێ تووشی پیاوێک لە پیاوەکانی ئێمە بوون، کە بەرەکەت و ڕەحمەتی زۆرمان بە سەردا رشتبوو، زانیاری زۆرمان دابوویە. زوربەی زانایان دەڵێن حەزرەتی خضر بووە.

﴿قٰالَ لَهُ مُوسىٰ هَلْ اَتَّبِعُكَ عَلىٰ اَنْ تُعَلِّمَنِ مِمّٰا عُلِّمْتَ رُشْداً﴾.(٢)

حەزرەتی مووسا گوتی: ئیجازە دەدەی ببمە هاوڕێت بەو شەرتە لەو زانیاری‌یەی خۆت فێرم کەی؟

﴿قٰالَ اِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْراً﴾.(٣)

حەزرەتی خضر گوتی: پێم خۆشە، بەڵام ناتوانی خۆت ڕاگری و سەبر بگری دەنگ نەکەی.

﴿وَ كَيْفَ تَصْبِرُ عَلىٰ مٰا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْراً﴾.(٤)

گوتی: چۆن دەتوانی ڕەفاقەتی من بکەی و سەبر بگری لە سەر ئەو شتانەی کە خۆت نایان زانی و بە زاهیر موخالیفی شەریعەتی تۆن و من دەیان کەم؟ بەڵام لە ڕاستیدا وا نین. دەزانم خۆت پێ ڕاناگیرێ، چونکە خواوەندی گەورە بنیادەمی وا دروست کردووە هەمیشە ڕخنە بگری و کاری کەسی پێ باش نەبێ و هەر خەریکی گفت و گۆ و کێشە و هەرا بێ.

﴿قٰالَ سَتَجِدُنِي اِنْ شٰاءَ اللّٰهُ صٰابِراً وَ لاٰ اَعْصِي لَكَ اَمْراً﴾.(٥)

حەزرەتی مووسا گوتی: بە ئومێدی خوا دەمبینی سابیر دەبم و بێ ئەمریت ناکەم.

﴿قٰالَ فَاِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلاٰ تَسْئَلْنِي عَنْ شَيْءٍ حَتّٰى اُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْراً﴾.(٦)

---

(١) الکهف: ٦٥. (٢) الکهف: ٦٦. (٣) الکهف: ٦٧.
(٤) الکهف: ٦٨. (٥) الکهف: ٦٩. (٦) الکهف: ٧٠.

حەزرەتی خضر گوتی: باشە بەو شەرتە هەرچی چاوت پێ کەوت قسە نەکەی و پرسیار نەکەی و ئیعتیزاز نەگری! کە سەفەرەکەمان تەواو بوو خۆم هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم. حەزرەتی مووسا شەرتەکەی قبووڵ کرد و بریاری سەفەریان‌دا.

جا با لێرەدا هەموو لایەک بە خوا بسپێرین و ئەگەر عومر وەفای کرد بەیانی دەچینەوە خزمەتیان.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلٰى سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلٰى جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

٥

# حەزرەتی مووسا

## باسی «حەزرەتی مووسا» سەلامی خودای لە سەر بێ

### بسم الله الرحمن الرحيم

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

با ئیمڕۆژ بچینەوە خزمەت حەزرەتی مووسا و حەزرەتی خضر و بزانین چیان کرد و چیان چاو پێ کەوت و چۆن لێک جیا بوونەوە؟ لە ئامۆژگاری دوێنێدا گوتمان: حەزرەتی مووسا بەڵێنی‌دا هەرچی چاوی پێ کەوت سەبر بگرێ و دەنگ نەکا یوشەعی کوڕی نوونیان بە جێ هێشت و دو بە دو کەوتنە ڕێ. بە گوێ بەحردا ڕۆیشتن.

﴿فَانْطَلَقٰا حَتّٰىٰ اِذٰا رَكِباً فِي السَّفِينَةِ خَرَقَهٰا قٰالَ اَخَرَقْتَهٰا لِتُغْرِقَ اَهْلَهٰا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئاً اِمْراً﴾.(١)

بە قەراغ بەحردا ڕۆیشتن تا تووشی کەشتی‌یەک بوون لە دوا سەلام کردن و بە خێر هاتن بە کەشتی‌یەوانیان گوت: سوارمان ناکەی؟ کابرای کەشتی‌یەوان کە تەماشای ناو

---

(١) الكهف: ٧١.

چاوانی کردن گوتی: دیارە ئەوانە زۆر خانەدان و نەجیب و پیاو چاکەن، گوتی: فەرموون سوار بن و هیچ پارەشی لێ وەر نەگرتن و زۆریشی حورمەت لێ گرتن. لە نەخافڵ حەزرەتی خضر دوو تەختەی لە کەشتی‌یەکە دەرهێنان و کەشتی‌یەکەی کوون کرد و عەیب داری کرد. حەزرەتی مووسا نەبێ کەس چاوی لێ نەبوو. حەزرەتی مووسا خۆی پێ ڕانەگیرا و پەیمانی لە بیر چۆوە و گوتی: بۆیەت کوون کرد تا خەڵکەکە غەرق بن؟ بە ڕاستی کارێکی عەیب‌دار و خەراپت کرد، لای خۆی ئەوان پیاوەتیان لەگەڵ ئێمەدا کرد. حەزرەتی خضر هیچ وەسەر خۆی نەهێنا و تورە نەبوو بە هێواشی ئاوڕی دایەوە و فەرمووی:

﴿قٰالَ اَلَمْ اَقُلْ اِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْراً﴾.(١)

ئاخر من نەمگووت تۆ ناتوانی خۆت ڕاگری و دەنگ نەکەی؟

﴿قٰالَ لٰا تُؤٰاخِذْنِي بِمٰا نَسِيتُ وَ لٰا تُرْهِقْنِي مِنْ اَمْرِي عُسْراً﴾.(٢)

حەزرەتی مووسا شەرتەکەی وەبیر کەوتەوە و زانی پەیمانی شکاندووە، دەستی کرد بە عوزر هێنانەوە و گوتی: بمبورە، نەمزانی عەهدەکەم لە بیر چووبۆوە، بە ئومێدی خوا لێرە بە دواوە دەنگ ناکەم. حەزرەتی خضر عوزری لێ قبووڵ کرد و لە کەشتی دابەزین و؛

﴿فَانْطَلَقٰا حَتّٰى اِذٰا لَقِيٰا غُلٰاماً فَقَتَلَهُ قٰالَ اَقَتَلْتَ نَفْساً زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئاً نُكْراً﴾.(٣)

ڕۆیشتن تا گەینە قەراغ دێیەک کۆمەڵێک منداڵ گاڵتەیان دەکردن، حەزرەتی خضر بە هەر جۆرێک بوو منداڵێکی لە منداڵەکان دور خستەوە و کوشتی. حەزرەتی مووسا ئیمانی لە دڵدا نەما و تورە بو و گوتی: ئەرێ ئەو منداڵەت بۆ کوشت بە ناحەق؟ خۆ کەسی نەکوشتوە بە ڕاستی گوناهێکی زۆر گەورەت کرد. حەزرەتی مووسا ناحەقی نەبوو تورە بێ، چونکە منداڵیکی نەدیو و نەناسی و بێ گوناح کە جێگای دڵ پێ خۆش کردنی پاشە ڕۆژی دایک و بابی بوو، بێ ئەوەی کەسی کوشتبێ بکوژرێ ڕەوا نیە. بە تایبەتی بە دەستی یەکێک لە وەلیانی خوا.

---

(١) الكهف: ٧٢. (٢) الكهف: ٧٣. (٣) الكهف: ٧٤.

﴿قَالَ اَلَمْ اَقُلْ لَكَ اِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْراً﴾.(١)

حەزرەتی خضر ئەو جارەش ئاوڕی دایەوە و گوتی: ئاخر نەمگوت ناتوانی ڕەفاقەتی من بکەی و خۆت پێ ڕا ناگیرێ؟

﴿قَالَ اِنْ سَاَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي عُذْراً﴾.(٢)

حەزرەتی مووسا هاتەوە سەر خۆ و پەیمانەکەی وەبیر کەوتەوە و گوتی: ئەگەر لەوە بە دواوە سوئالم لێ کردی ڕەفاقەتم مەکە چونکە حەقتە هاوڕێیم نەکەی. حەزرەتی خضر شەرتەکەی قبووڵ کرد و؛

﴿فَانْطَلَقَا حَتّٰى اِذَا اَتَيَا اَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا اَهْلَهَا فَاَبَوْا اَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَاراً يُرِيدُ اَنْ يَنْقَضَّ فَاَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ اَجْراً﴾.(٣)

ڕۆیشتن تاگەینە دێیەک، هەموو دێیەکەگەڕان کەس ڕای نەگرتن. ئەو شەوە چوونە کەلاوە کۆنێک، بەیانی حەزرەتی خضر تەماشای کرد ئەوا دیوارێک خەریکە بڕوخێ، دەستی کرد بە چاکردنەوەی دیوارەکە. حەزرەتی مووسا دووبارە خۆی پێ ڕانەگیرا و گوتی: ئاخر من ئەوا لە برسان دەمرم، تەواوی ئەو ماڵانەمان پشکنین نانێکیان نەدایێ، ئەگەر بە کرێ چاکی بکەیەوە و بیدەین بە نان باشتر نیە؟

﴿قَالَ هٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَ بَيْنِكَ سَاُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْراً﴾.(٤)

ئنجا حەزرەتی خضر فەرمووی: ئەو شەرتەی دوایشت بوو بە هۆی جیا بوونەوەی ئێمە. جا با پێت بڵێم و ئاگادارت بکەم لە سەر ئەو شتانە کە من کردمن.

﴿اَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَاَرَدْتُّ اَنْ اَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْباً﴾.(٥)

جارێ کەشتی‌یەکە ماڵی چەند فەقیر و هەتیوو بوو، گوزەرانیان اە سەر ئەو کەشتی‌یە بوو، لەو بەحرەدا دەیان گێڕا، ویستم عەیب‌داری بکەم، چونکە پیاوی مەلیک بە شۆین کەشتی‌یاندا دەگەڕا، هەرچی ساغ بوایە بە سوغرەیان دەگرت، بەڵام ئەگەر عەیب‌دار

---

(١) الکهف: ٧٥. (٢) الکهف: ٧٦. (٣) الکهف: ٧٧.
(٤) الکهف: ٧٨. (٥) الکهف: ٧٩.

بووایە لاقەیان نەدەکرد، ئەوە بوو لە پاش مە هاتن تەماشایان کرد کە زانیان عەیبدارە خۆیان تێ نەگەیاند و خاوەنەکانیشی بە ئاسانی چاکیان کردەوە و پەکیان نەکەوت.

﴿وَ اَمَّا الْغُلٰامُ فَكٰانَ اَبَوٰاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينٰا اَنْ يُرْهِقَهُمٰا طُغْيٰاناً وَ كُفْراً﴾.(١)

کوڕەکەش کە کوشتم لە بەر ئەوە بوو باوک و دایکەکەی زۆر موسوڵمان بوون، دەترسام لەوەی ئەو کوڕە گەورە بێ و ئەو باوک و دایکە کافر کا.

﴿فَاَرَدْنٰا اَنْ يُبْدِلَهُمٰا رَبُّهُمٰا خَيْراً مِنْهُ زَكٰاةً وَ اَقْرَبَ رُحْماً﴾.(٢)

ئەو کوڕەم لە کۆڵ کردنەوە ویستمان خوا ئەولادی بە ڕەحمتر و پاکتر و خۆشەویستیان بداتێ.

﴿وَ اَمَّا الْجِدٰارُ فَكٰانَ لِغُلٰامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَ كٰانَ تَحْتَهُ كَنْزٌ لَهُمٰا وَ كٰانَ اَبُوهُمٰا صٰالِحاً فَاَرٰادَ رَبُّكَ اَنْ يَبْلُغٰا اَشُدَّهُمٰا وَ يَسْتَخْرِجٰا كَنْزَهُمٰا رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ وَ مٰا فَعَلْتُهُ عَنْ اَمْرِي ذٰلِكَ تَأْوِيلُ مٰا لَمْ تَسْطِعْ عَلَيْهِ صَبْراً﴾.(٣)

فەرمووی: بێینەوە سەر دیوارەکە ئەو دیوارە دیواری دو کوڕی هەتیوو بوو، لە بن ئەو دیوارەدا خەزنە و پارەی شاردراوە هەبوو، ئەو هەتیوانە باوکیان زۆر پیاوێکی باش بوو، خوا ویستی ئەو پارە بە نەسیب ئەو هەتیوانە بێ، جا ئەگەر دیوارەکەم چاک نەکردایەوە دەڕوخا و خەڵک پارەکەی دەدۆزیەوە، ئەوەش بزانە کە ئەو شتانەم هیچ لە خۆڕا نەکردوون، هەمووم بە ئەمری خوا کردون. جا ئەوەیە مەعنای ئەو شتانەی نەددەتوانی خۆڕاگری و دەنگ نەکەی. حەزرەتی خضر خواحافیزی لە حەزرەتی مووسا کرد و ون بوو، حەزرەتی مووساش گەڕایەوە بۆ لای یوشەع و هاتنەوە بۆ ناو بەنی ئیسرائیلیەکان و تا وەفاتی کرد شەو و ڕۆژ خەریکی ئامۆژگاریان بوو. جا ئەگەر کەمێک بیر لە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی مووسا بکەینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە ئینسان دەبێ لە بەرامبەر بەڵا و موسیبەتدا خۆ ڕاگر بێ، چونکە زۆر جاری وایە بە پێچەوانەی خواستی ئێمە خێری پێوەیە، هەر وەک حەزرەتی مووسا کە لە بەر فیرعەون کۆچی کرد و خۆی ڕاگرت بۆ بەڵا و غەریبی و لە ئاخریدا تووشی خۆشی بوو، خوا کردی بە پێغەمبەر و بردی بۆ کێوی توور و قسەی لەگەڵ کرد.

---

(١) الكهف: ٨٠. (٢) الكهف: ٨١. (٣) الكهف: ٨٢.

ئەو کەسەی لەززەتی ئیمانی چێشت دەتوانێ لە پێناو ئیمان و باوەڕیدا خۆی بەخت کا و خۆڕاگرێ وەک حەزرەتی مووسا، لە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی مووسادا خوای گەورە ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە فیرعەون و قەومەکەی چۆن چۆن بە هۆی خۆ بە زل زانی و زوڵم و بێ ئیمانیەوە بە هیلاک چوون، هەر وەکو لە سورەی «القصص»دا دەفەرمووێ:

﴿وَاسْتَكْبَرَ هُوَ وَ جُنُودُهُ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَ ظَنُّوا أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ﴾.(١)

فیرعەون و سوپاکەی لە سەر ئەرز خۆیان بە زل گرت و زوڵمیان کرد، بە ناحەق لایان وا بوو نایێنەوە بەردەستی ئێمە.

﴿فَأَخَذْنَاهُ وَ جُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ﴾.(٢)

ئێمەش بە خۆ و بە لشکرەکەیەوە لە ناو بەحردا غەرقمان کردن.

﴿فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ﴾.(٣)

جا ئەی گوێگری موسوڵمان بزانە ئاخری زاڵمان هەر بە هیلاک چوونە و هەر حەق بە سەر ناحەقدا سەردەکەوێ. دووبارە لە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی مووسادا ئەو پەندەش وەر دەگرین کە دەبێ میللەتان ئازاد بن و کەس ژێردەستی کەس نەبێ.

دەبێ موسوڵمانان دەرس لە بەنی ئیسرائیلیەکان وەرگرن، کە لەگەڵ ئەو هەموو کوشتن و بڕینە دەستیان لە حەزرەتی مووسا هەر هەڵ نەگرت و دەستیان لە ماڵ و مڵکی میسر هەڵگرت و وەدوای کەوتن. دەبێ لەو ئایەتە پەند و ئامۆژگاری وەرگری کە خوا بە حەزرەتی مووسا و هارون دەفەرمووێ:

﴿فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَيِّنًا لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ﴾.(٤)

واتە ئێوە ئەی مووسا و هارون کە چوون بۆ ئامۆژگاری فیرعەون بە نەرم و لە سەر خۆیی قسەی لەگەڵدا بکەن، بە تایبەتی ئەوانەی ئامۆژگاری خەڵک دەکەن، دەبێ رویان خۆش بێ و زمانیان نەرم بێ و لە سەر خۆ بن. هەر وەها ئەو بەسەرهاتە دەڵی دەبێ ئینسان وەک حەزرەتی مووسا وەدوا عیلم و زانیاری بکەوێ، با تووشی غەریبی و سەفەر و

---

(١) القصص: ٣٩. (٢) و (٣) القصص: ٤٠. (٤) طه: ٤٤.

نارەحەتیی و برسی‌یەتیش ببێ، دەبێ بۆ ئەدەب لەگەڵ ماموستاکەیدا چاو لە حەزرەتی مووسا بکا، کە ڕووی کردە حەزرەتی خضر و فەرمووی:

﴿هَلْ اَتَّبِعُكَ عَلىٰ اَنْ تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْداً﴾.(١)

واتە روخسەت هەیە وەدوات کەوم و لە زانیاری‌یەی خۆت شتێکم فێر کەی؟ خولاسە ئەگەر بە وردی تەماشای باسی بەسەرهاتی و ژیانی حەزرەتی مووسا بکەینەوە هەزاران پەند و ئامۆژگاری تێدایە، جا با بزانین چۆن وەفاتی کردووە.

ڕاوی دەڵێ کاتێک وەفاتی حەزرەتی مووسا نزیک بۆوە، ڕۆژێک بەنی ئیسرائیلیەکانی کۆکردەوە و ئامۆژگاری زۆر بە نرخی کردن و یوشەعی کوڕی نونی کردە جێ‌نشینی خۆی و چوو بۆ کێوی توور لە ڕێگادا گوێی لە دەنگێک بوو گوتی: وەختی مردنت نزیک بۆتەوە، زانی کە وەحیە لە لایەن خواوە، زۆر ترسا و گوتی: ئەی خوای گەورە ئەو دەنگە دەنگی کێ‌یە ئەوەندە با سامە؟ حەزرەتی ئیزرائیل جوابی دایەوە و گوتی: ئەوە دەنگی کەسێکە کە هەموو باوک و فرزەندێک لیک دەکا، دۆست و برادەر لێک دور دەخاتەوە، حەزرەتی مووسا کە زانی دەنگی حەزرەتی ئیزائیلە ئەوەندەی دیش ترسا و گوتی: ئەی خوای گەورە، منداڵی وردم زۆرن کە بمرم کێ بەخێویان دەکا؟ لە غەیبەوە خوا فەرمووی: یا مووسا عەساکەت لەو بەردە ڕاکێشە، کە عەساکەی لە بەردەکە دابە قودرەتی خوا بەردەکە لە ناوڕاستا لەت بوو، کرمێکی لێ هاتە دەرەوە پەلکە گەڵایێکی شینی بە دەمەوە بوو، زکری خوای دەکرد و دەیگوت: گەورەیی بۆ ئەو خوایەی منی لە ناو ئەو بەردەدا خەلق کردووە و لە بیری ناچمەوە. خوا فەرمووی: یا مووسا جا چۆن منداڵەکانی تۆم لە بیر دەچنەوە و رزقیان نادەم و ئاگام لێ نابن؟ حەزرەتی مووسا زۆر دڵ خۆش بوو ترسی مردن و ئیزرائیلی لە بیر چۆوە، زۆر نەڕۆیشت تووشی دوو سێ کەس بوو قەبریان هەڵدەکەند، خوا بە قەوەتەی لێ کردن و جوابیان دایەوە، گوتی: ئەوە گۆڕی کێیە؟ گوتیان: ئی دۆستێکی خوایە، فەرمووی: باشە ڕێگام دەدەن یارمەتیتان بدەم تا ئەمنیش خێرێکم بە نەسیب بێ؟ گوتیان: فەرموو. کە گۆڕەکەیان تەواو کرد، حەزرەتی مووسا گوتی: ئاخر نابێ

---

(١) الكهف: ۶۶.

بزانین داخوا کورتە، درێژە؟ گوتیان خاوەنی ئەوگۆڕە درێژی و کورتی وەک تۆ وایە، ئەگەر زەحمەت نەبێ بە تاقی بکەیەوە بۆمان مەعلوم دەبێ، حەزرەتی مووسا چۆ ناو گۆڕەکە و ڕاکشا و گوتی: بۆ من زۆر باشە لەوکاتەدا حەزرەتی ئیزرائیل سێوێکی لە بەهەشت هێنا و دای بە حەزرەتی مووسا بۆنی پێوە کرد و لە تەمەنی سەد و بیست ساڵیدا وەفاتی کرد.

ئەوانەی قەبرەکەیان هەڵدەکەند حەزرەتی جوبرەئیل و میکائیل و چەند مەلائیکەی دی بوون، بە ئەمری خوا هاتبوون قەبری حەزرەتی مووسا هەڵ کەنن کە وەفاتی کرد شتیان و کفن و دفنیان کرد و ناژتیان. جا بۆیە هێندێک دەڵێن نازانرێ مەرقەدی حەزرەتی مووسا لە کوێیە.

ئەوە بۆ باسی بەسەرهاتی حەزرەتی مووسا، ئومێد دەکەم پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری لێ وەرگرن و بیان کەنە سەرمەشقی ژیانتان.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# حەزرەتی یونس

## باسی «حەزرەتی یونس» سەلامی خودای لە سەر بێ

### بسم الله الرحمن الرحيم

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

با سەرێک لە شاری موسڵ بدەین و بچینە خزمەت حەزرەتی یونسی پێغەمبەر درودی خوای لە سەر بێ و بزانین چی بەسەرهات و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

خواوەندی گەورە لە سورەی «الصّافّات»دا فەرموویەتی:

﴿وَ اِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾.(١)

بە ڕاستی ئەی پێغەمبەر یونس یەکێک بوو لە پێغەمبەران. لە شەش ئایەت لە قورئاندا باسی حەزرەتی یونس کراوە و سورەتێکیش لە قورئان ناو نراوە سورەی یونس. بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە نازدارەش لە کاتێکدا ڕوی داوە کە شاری موسڵ پایتەختی دەوڵەتی ئاشوور بووە، ئەو دەوڵەتەی کە زۆربەی وڵاتی ئاسیای لە ژێر فەرماندا بوو،

---

(١) الصّافّات: ١٣٩.

گەورەترین و خۆشترین شاری ئەو سەردەمە مووسڵ بوو، خەڵکی موسڵ زۆر دەوڵەمەند بوون، بە هۆی دەوڵەمەندی‌یەوە لە خۆیان بایی ببوون توغیانیان کردبوو، ئیمانیان بە خوا نەبوو، بتیان دەپەرستن، زوڵمیان لە داماوان دەکرد، لە گوناح نەدەگەڕانەوە، خواوەندی گەورە حەزرەتی یونسی کوڕی مەتای کردە پێغەمبەر و بانگی کردن بۆ خواپەرستی و دەست هەڵگرتن لە بتپەرستی. بەڵام هەرچەند ئامۆژگاری دەکردن ئەوان گوێیان نەدەدایە، ڕۆژ لە دوا ڕۆژ خەراپتر دەبوون. تا ڕۆژێک خواوەندی گەورە وەحی نارد بۆ حەزرەتی یونس و فەرمووی: ئەی یونس بە قەومەکەت ڕاگەیێنە ئەگەر ئیمان نەهێنن و تۆبە نەکەن و پەشیمان نەبنەوە لە فلان ڕۆژ و لە فلان کات و سەعاتدا عەزابیان بۆ نازڵ دەکەم و غەزەبیان لێ دەگرم جاکەیفی خۆیانە.

حەزرەتی یونس زوربەی خەڵکەکەی کۆکردەوە و فەرمووی: خەڵکینە ئەگەر تا فلان ڕۆژ ئیمان بە خوا نەهێنن و تۆبە نەکەن خوا غەزەبتان لێ دەگرێ، بەڵام خەڵکەکە گوێیان نەدایە و بە قسەیان نەکرد. حەزرەتی یونس کە زانی ئەوا کاتی غەزەبیان نزیک بۆوە بە دزی خەڵک بە تووڕەییەوە شاری موسڵی بە جێ هێشت و چوو بۆ سەر دجلە بۆ ئەوەی سواری کەشتی بێ و ئاگای لە بەڵا و عەزابی قەومەکەی نەبێ. هەر وەکو خوای تەعالا لە سورەی «الأنبياء»دا ئەو بەسەرهاتە باس دەکا و دەفەرمووێ:

﴿وَ ذَا النُّونِ اِذْ ذَهَبَ مُغٰاضِباً﴾.(١)

یەکێک لە پێغەمبەران خاوەن ماسی‌یەکە بوو کە بە تووڕەییەوە قەومەکەی بە جێ هێشت و هاتە سەر بەحر.

﴿فَظَنَّ اَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ﴾.(٢)

لای وا بوو ئێمە لێ دەگەڕێن بە ئارەزوی خۆی بۆ کوێ دچێ بچێ؟ نەی دەزانی چ کارەساتێک ڕووی داوە و ڕوو دەدا! جا با حەزرەتی یونس بە دیار کەشتی‌یەوە بە جێ بێڵین و بگەڕێنەوە بۆ شاری مووسڵ و بزانین لە دووا حەزرەتی یونس چ ڕووی دا.

ڕۆژێک لە نکاو هەورێکی ڕەشی چڵکنی دوکەڵاوی هات و لەنگەری لە سەر شاری مووسڵ بەردانەوە و بە دوکەڵی هەورەکە ڕەنگی خەڵک گۆڕا و دەم و چاویان هەڵقرچا.

(١) و (٢) الأنبياء: ٨٧.

بۆیان ئاشکرا بوو کە ئەوە عەلامەت و نیشانەی عەزاب و غەزەبی خوایە و قسەکەی حەزرەتی یونس وەڕاست دەگەڕێ و زۆر ترسان و زۆر لە حەزرەتی یونس گەڕان نەیاندی‌یەوە. بۆیان ئاشکرا بوو کە ئەویش هەر لە بەر ئەوەیە شاری مووسڵی بە جێ هێشتووە، ئەوەندەی دیش ترسان.

هەموو فەزڵ و فەسڵی خوان. ڕۆژی جومعەی دەی مانگی موحەڕرەم ژن و پیاو و پیر و گەنج و لاو و منداڵ بە شین گابۆڕ و گریان لە شار چوونە دەرێ، هاواری پیاوان و قیژەی ژنان و زیڕەی منداڵان و گابۆڕی مەڕ و ماڵات و پاتاڵ دنیای پڕ کردبوو، بەری ئاسمانی گرتبو و بە دڵ لە بەر خوا دەپارانەوە و تۆبەیان کرد و پەشیمان بوونەوە. خوای گەورە دوعای گیرا کردن و تۆبەی لێ قبووڵ کردن و بەڵا و غەزەبەکەی لە سەر هەڵگرتن. هەر وەک لە سورەی «یونس»دا دەفەرمووێ:

﴿فَلَوْلٰا كٰانَتْ قَرْيَةٌ آمَنَتْ فَنَفَعَهٰا ايمٰانُهٰا اِلّٰا قَوْمَ يُونُسَ لَمّٰا آمَنُوا كَشَفْنٰا عَنْهُمْ عَذٰابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيٰاةِ الدُّنْيٰا وَ مَتَّعْنٰاهُمْ اِلىٰ حينٍ﴾.(١)

ئەگەر خەڵکی شارێک لەو شارانە کە تووشی عەزاب بوون لە پێش هاتنی عەزاب و غەزەبی خوادا تۆبەیان بکردایە و ئیمانیان بێنایە نەجاتیان دەبوو، بەڵام وایان نەکرد. قەومی حەزرەتی یونس نەبێ کە لە پێش کاتی دیاری کراو بۆ عەزاب و غەزەبی خوا تۆبەیان کرد و پەشیمان بوونەوە و ئیمانیان هێنا خوا لە غەزەب و عەزاب ڕزگاری کردن و تاکاتی مردنی تەبیعی خۆیان خۆشیان ڕابوارد و دەیان گوت: ئاخ نەمردوین جارێکی دی حەزرەتی یونسمان چاو پێ کەوتۆتەوە و بە گەورەی خۆمان بە پێغەمبەرمان قبووڵ کردووە. شەو و ڕۆژ بە دوای‌دا دەگەڕان و زۆریان ئاوات بوو بە دیداری شاد وەبن.

با ئەوان لە گەڕاندا بە جێ بێڵین و بچینەوە سەر بەحر و بزانین حەزرەتی یونس دروودی خوای لە سەر بێ چی لێ بەسەر هات.

حەزرەتی یونس کە چۆ سەر بەحر تەماشای کرد ئەوا کەشتی‌یەک لەنگەری گرتووە و ڕاوەستاوە و ئامادەیە بۆ ڕۆیشتن. چۆ لای کابرای کەشتی‌یەوان و داوای لێ کرد بە هەر

---

(١) یونس: ٩٨.

قیمەتێک بێ سوواری بکا، کەشتی‌یەوان کە تەماشای ناو چاوانی کرد زۆر موبارەکی هاتە پێش چاو گوتی: هەرچەند کشتی‌یەکە باریشی گرانە و جێگای کەسی دی نابێ، بەڵام فەرموو سوار بە. هەروەکو خوا لە قورئاندا لە سورەی «الصّافّات»دا ئەو باسەمان بە تەواوی بۆ بەیان دەکا و دەفەرمووی:

﴿اِذْ اَبَقَ اِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾.(١)

کاتێک حەزرەتی یونس لە مووسڵ ڕای کرد و هەڵات و چو بۆ لای کەشتی‌یە پڕەکە و سوار بوو، زۆر نەڕۆیشتن بە ئەمری خوا گێژەڵۆکەیەکی هەڵکرد و شەپۆلی ئاو سەر کەشتی‌یەکە دەکەوتن زۆری نەماکەشتی غەرق ببێ، کەشتی‌یەوان و خەڵکەکە زۆر ترسان.

خەڵکەکە ڕۆیان کردە کەشتی‌یەوان و گوتیان: باری کەشتی‌یەکە زۆر گرانە، با یەکێکمان بخەینە ناو ئاوەکە بەڵکو تۆزێک باری سووک بێ و بڕوا، یەکمان بخنکێ لە هەمووانمان باشترە. کەشتی‌یەوانەکەش گووتی: خەڵکینە من تاقیم کردۆتەوە هەر کاتێک ئەو کەشتی‌یە ڕاوەستا و نەڕۆیی مەعنای وایە عەبد و بەندەیێکی ڕاکردوی تێدایە بۆیە ناڕوا، با پشک باوێن و قورعە ڕاکێشین و بزانین بەرکاممان دەکەوێ؟

﴿فَسٰاهَمَ فَكٰانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ﴾.(٢)

قورعەیان ڕاکێشا وەبەر حەزرەتی یونس کەوت. ڕاوی دەڵێ گوتیان: ئەو کەڕەتە سودفە بوو، با دووبارە قورعە باوێژینەوە چونکە وا دیارە ئەو پیاوە پیاوێکی زۆر نەجیب و خانەدانە بۆ ئەوەی نابێ عەبد و بەندە بێ و ڕای کردبێ تا سێ کەڕەت قورعەیان ڕاکێشا هەر سێک جارەکان وەبەر ئەو دەکەوت. بە ناوی ئەوەوە دەهاتە دەر. ئنجا گرتیان و خستیانە ناو بەحرەکەوە و کەشتی حەرەکەی کرد، لەو کاتەدا مەلائیکەی ئەرز و ئاسمان دەستیان کرد بە گریان و لە بەر خوا دەپاڕانەوە و دەیان گوت: ئەی خوای گەورە ڕەحم بە حەزرەتی یونس بکە. خوای تەعالا فەوری ئەمری کرد بە ماسی‌یەک بچێ دەم بکاتەوە و قووتی بدا و بە ئەمانەت لای ئەو بێ.

﴿فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَ هُوَ مُلِيمٌ﴾.(٣)

---

(١) الصّافّات: ١٤٠. (٢) الصّافّات: ١٤١. (٣) الصّافّات: ١٤٢.

ماسی بە ئەمری خوا هات و دەمی کردەوە و قووتیدا، خەڵکەکە دەستیان کرد بە لۆمە کردنی و خۆشی لۆمەی خۆی دەکرد و لە بەر خوا دەپاڕایاوە، هەر وەکو لە سورەی «الأنبياء»دا دەفەرمووێ:

﴿فَنَادَىٰ فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾.(١)

حەزرەتی یونس لە چوار تاریکاییدا لە تاریکی شەو دا و لە تاریکی ناو بەحردا و لە تاریکی ناو سکی ماسیدا و لە تاریکی دوا ڕۆژ دا هاواری دەکرد و دەیفەرموو: ئەی خوای گەورە بە ڕاستی کەس نیە لایق و شایانی عیبادەت بۆکردن و پەرستن بێ زاتی پاکی تۆ نەبێ و هەرچی کردوتە و دەیکەی بە خۆڕایی نیە. بە ڕاستی من زوڵمم لە خۆم کرد و لە ڕیزی زاڵمانم.

بە ڕیوایەتێک دەڵێن تا چل شەو و ڕۆژ لە زگی ماسییەکەدا مایەوە و هەر زکری خوای دەکرد و لە بەر خوا دەپاڕایەوە.

﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَ نَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ﴾.(٢)

خوا دەفەرمووێ: جوابی دوعا و پاڕانەوەکەمان دایەوە و لە غەم نەجاتمان دا.

﴿وَ كَذَٰلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾.(٣)

هەر وەهاش موسوڵمانان لە ناخۆشی ڕزگار دەکەین و نەجاتیان دەدەین بەڵام:

﴿فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ﴾.(٤)

ئەگەر لە شەرتێکدا حەزرەتی یونس زکر و تەسبیحاتی خوای نەکردایە و خوای فەرامۆش بکردایە.

﴿لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾.(٥)

بە زیندوویی دەمایەوە لە سکی ماسییەکەدا تا ڕۆژی قیامەت.

﴿فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَ هُوَ سَقِيمٌ﴾.(٦)

دەفەرمووێ: ئەمرمان کرد بە ماسییەکە و بردی لە قەراغ بەحر داینا، بەڵام نەخۆش

---

(١) الأنبياء: ٨٧. (٢) و (٣) الأنبياء: ٨٨. (٤) الصّافّات: ١٤٣.
(٥) الصّافّات: ١٤٤. (٦) الصّافّات: ١٤٥.

بوو وەکو منداڵی ساوای لێ هاتبۆوە، زەرد و زەعیف و لاواز و باریک ببوو، بە تایبەتی بە هۆی گەرمایی ناو سکی ماسی‌یەکە.

﴿وَ اَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ﴾.(١)

ئنجا خوا دەفەرمووێ: بۆ ئەوەی تا ماوەیەک بێتەوە سەر خۆ و وەحەسێ و بە تایبەتی بۆ ئەوەی هەم مێشوولە لە نزیکی نەبن و هەم لە بەرەکەی بخوا کولەکەمان بۆ ڕواند، چونکە دەڵێن مێشوولە ناچێتە بن سێبەری کولەکە.

﴿وَ اَرْسَلْنَاهُ اِلىٰ مِائَةِ اَلْفٍ اَوْ يَزِيدُونَ﴾.(٢)

ئنجا خوا دەفەرمووێ: کاتێک کەوتە سەر خۆ ڕەوانەمان کردەوە بۆ سەر قەومەکەی کە لە سەد هەزار کەس زیاتر بوون. بە ڕیوایەتێک دەڵێن خواوەندی گەورە ئەمری کرد بە حەزرەتی جوبرەئیل دستێکی لیباس بۆ بردو و دەبەری کرد و فەرمووی خوا دەفەرمووێ: هەستی بچێتەوە بۆ شاری مووسڵ زیاتر لە سەد هەزار کەس ئیمانی پێ دێنن.حەزرەتی یونس زۆر خۆشحاڵ بوو کە زانی قەومەکەی هەر ماون و خوا غەزەبی لێ نەگرتوون هەستا بە ئەمری خوا هاتەوە بۆ موسڵ و چۆوەماڵەوە خەڵکەکە خەبەریان زانی ژن و پیاو و گەنج و پیر بە پیلیەوە چوون...

﴿فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ اِلىٰ حِينٍ﴾.(٣)

دەستیان ماچ کرد و ئیمانیان پێ هێنا و بە خۆشی وشادی و بە ئیمانەوە ڕایان بوارد، تا هەر کەسە لە کاتی ئەجەلی خۆیدا وەفاتی کرد، بەڵام بە داخەوە بۆمان ئاشکرا نەبوو داخوا ژنی هێناوە یان نا؟ یا چەند کوڕ و کچی هەبووە و تەمەنی چەند بووە؟ بەڵام ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە هەر لە شاری مووسڵ وەفاتی کردوە و ئەوەتا مەرقەدی مووبارەکی لە ناو مزگەوتەکە دایە و بارەگاکەی زیارەتگای گشتی‌یە. جا ئەگەر بە چاوی دڵ بڕوانینە بەسرهاتی حەزرەتی یونس وگەلەکەی ئەو دەرسە وەر دەگرین کە ئینسان دەبێ تا تووشی غەزەب و عەزابی خوا نەبووە دەست لە خەراپە هەڵگری وەک قەومەکەی حەزرەتی یونس. یان ئینسان نابێ ئەگەر تووشی موسیبەتێک بوو خوا فەرامۆش بکا و ناشوکر بێ. هەر وەک حەزرەتی یونس لە ناو سگی ماسی‌یەکش‌دا لە زکری خوا غافڵ نەبوو.

---

(١) الصّافّات: ١٤٦. (٢) الصّافّات: ١٤٧. (٣) الصّافّات: ١٤٨.

خوا خۆی فەرموویەتی: هەر ئینسانێک وەک قەومی حەزرەتی یونس تۆبە بکا یان وەک حەزرەتی یونس زکری خوا بکا لە عەزاب و بەڵا نەجاتی دەدەین. وەکو دەفەرموێ:

﴿وَ كَذٰلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾.[1]

واتە هەروەها موسوڵمانانیش نەجات دەدەین. باسی بەسەرهاتی حەزرەتی یونس پێغەمبەریشمان لێرەدا تەواو بوو، ئومێد دەکەم پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری لێ وەرگرن تا خواوەندی گەورە وەک حەزرەتی یونس و گەلەکەی لە بەڵا و موسیبەت بمان پارێزێ.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(١) الأنبياء: ٨٨.

# ١

# حەزرەتی داوود

## باسی «حەزرەتی داوود» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ جَمِیعِ الْأَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلِینَ وَ عَلیٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِینَ.

موسوڵمانینە ئەوە باسی بەسەرهاتی حەزرەتی داوودە، جا با گوێ ڕاگرین بۆ باسی بەسەر هاتی ئەو پێغەمبەرە دەنگ‌خۆشە و پەند و عیبرەتی لێ وەرگرین.

لە پاش وەفاتی حەزرەتی مووسا یوشەعی کوڕی نوون بوو بە گەورە و جێ‌نشینی حەزرەتی مووسا و جولەکەکانی بردە خاکی فەلەستین.

یەکەم شار کە داگیریان کرد شاری ئەریحا یا ئۆرشەلیم بوو، هەر وەکو قورئان لە سورەی «البقرة»دا دەفەرمووێ:

﴿وَ اِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هٰذِهِ الْقَرْیَةَ فَکُلُوا مِنْهٰا حَیْثُ شِئْتُمْ رَغَداً وَادْخُلُوا الْبٰابَ سُجَّداً وَ قُولُوا حِطَّةٌ نَغْفِرْ لَکُمْ خَطٰایٰاکُمْ وَ سَنَزِیدُ الْمُحْسِنِینَ﴾.(١)

---

(١) البقرة: ٥٨

ئەی پێغەمبەر تۆ بۆ موسوڵمانەکان وەگێڕە کە ئێمە بە جولەکەکانمان گوت: بچنە ناو شاری ئۆرشەلیم و بە ئارەزووی خۆتان چتان پێ خۆش بوو بیخۆن هەموو شتێکتان بە زۆری دەست دەکەوی! بەڵام دەبێ کە چونە ناو شار کورنووش بۆ خوا بەرن و خواتان لە یاد نەچێ و داوای لێ خۆش بوونتان لە خوا بکەن، خوا لە گوناحاتتان خۆش دەبێ و پاداشتی زۆریش دەداتەوە بەو کەسانەی چاکە دەکەن.

﴿فَبَدَّلَ الَّذينَ ظَلَمُوا قَوْلاً غَيْرَ الَّذي قيلَ لَهُمْ﴾.(١)

بەڵام چونکە تەبیعەتی جولەکە هەر وا بووە، زوربەیان بێ ئەمری خوایان کرد و بە تەکەبورەوە چوونە ناو شار و لە باتی تۆبە خەراپەیان دەکرد.

﴿فَاَنْزَلْنا عَلَى الَّذينَ ظَلَمُوا رِجْزاً مِنَ السَّماءِ بِما كانُوا يَفْسُقُونَ﴾.(٢)

خوا دەفەرموێ: بە هۆی زوڵمیانەوە بەڵای ئاسمانیان بۆ ناردن و لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا بە هۆی نەخۆشی تاعونەوە زۆریان مردن. لە پاش وەفاتی حەزرەتی یوشەع ماوەی ٣٥٦ ساڵ بێ پاشا بوون و چەند قازییان دانا بوون بە سەریانڕا دەگەیشتن، بەڵام فەلەستینیەکان و عەمالیقە و ئارامیەکان زۆریان زوڵم لێ دەکردن و تەنانەت لە شەڕێکدا بە خەراپی شکان و ماڵ و منداڵیان بە ئەسیر گیرا.

ئەو تابوتەی کە تەوڕاتی تێدا بوو، پێیان دەگوت: تابووتی عەهد، عادەتیان وا بوو بۆ هەموو غەزایەکیان دەبرد و پێیان وا بوو کە بە هۆی بەرەکەتی ویەوە سەر دەکەون، دوژمنەکانیان ئەویشیان بە تاڵان گرت. جولەکەکان زۆر نارەحەت بوون، لە ساڵی ١٠٤٠ی پێش لە دایک بوونی حەزرەتی عیسادا پیاو ماقوڵەکانیان چوون بۆ لای سموئیلی پێغەمبەر و عەرزیان کرد قوربان دەبێ گەورەیێکمان بۆ دیاری بکەی، تا هەموومان بە قسەی بکەین و وەدووای کەوین بۆ غەزا. هەر وەکو دوبارە قورئان ئەو باسەمان بۆ بەیان دەکا و دەفەرموێ:

﴿اَلَمْ تَرَ اِلَى الْمَلاِ مِن بَعْدِ مُوسىٰ اِذْ قالُوا لِنَبِيٍّ لَهُمُ ابْعَثْ لَنا مَلِكاً نُقاتِلْ في سَبيلِ اللّٰهِ﴾.(٣)

---

(١) و (٢) البقرة: ٥٩. (٣) البقرة: ٢٤٦.

ئایا تۆ ئەزانی کە کۆمەڵێک لە جولەکەکان لە دوا حەزرەتی مووسا چوونە لای پێغەمبەرەکەیان و گووتیان: تۆ گەورەیەکمان بۆ دیاری بکە تا وەدوای کەوین و غەزا بکەین.

﴿قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ اِنْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ اَلَّا تُقَاتِلُوا﴾.(١)

پێغەمبەرەکەیان گوتی: ئاخر لام وایە ئەگەر غەزاتان لە سەر واجب بکرێ ناچن.

﴿قَالُوا وَ مَا لَنَا اَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ وَ قَدْ اُخْرِجْنَا مِنْ دِيَارِنَا وَ اَبْنَائِنَا﴾.(٢)

گوتیان: جا چۆن شەڕ ناکەین لە کاتێکدا ژن و ماڵ و منداڵمان بە ئەسیر گیراون!

﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوا اِلَّا قَلِيلاً مِنْهُمْ وَاللّٰهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾.(٣)

بەڵام کاتێک خوا غەزای لە سەر واجب کردن ٣١٣ کەسیان نەبێ هەموانیان سەرپێچیان کرد.

﴿وَ قَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ اِنَّ اللّٰهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكاً﴾.(٤)

کاتێک پێغەمبەرەکەیان پێ ی گوتن: خواوەندی گەورە تالوت ناوێکی دیاری کردووە کە ببێ بە مەلێک لە سەر ئێوە.

﴿قَالُوا اَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَ نَحْنُ اَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَ لَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِنَ الْمَالِ﴾.(٥)

جولەکەکان گوتیان: قوربان جا چۆن تالوت دەبێتە مەلێک لە سەر ئێمە؟ ئێمە لەو لایقترین ئێمە دەوڵەمەندین ئەو فەقیرە، پاشا و مەلێک دەبێ لە ئەولادی یەهوزا بن ئەو لە ئەولادی بنیامینە!

﴿قَالَ اِنَّ اللّٰهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَ زَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللّٰهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ وَاللّٰهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾.(٦)

گوتی: پێتان خۆش بێ و پێتان ناخۆش بێ خوا ئەوی هەڵبژاردووە و زانیاری و توانایی شەڕی داوەتێ.

خوا پایە و مەقام و ماڵ و ملک بە ئارەزوی خۆی دەدا بە هەر کەسێک ویستی بیداتێ، خوا زانیاری فراوانە. کە زانیان تازە هەر ئەو دەبێ گوتیان: باشە عەلامەت و نیشانەی بوونی بە مەلێک لە لایەن خواوە چیە؟

---

(١) و (٢) و (٣) البقرة: ٢٤٦.     (٤) و (٥) و (٦) البقرة: ٢٤٧.

﴿وَ قٰالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ اِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ اَنْ يَأْتِيَكُمُ التّٰابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِن رَبِّكُمْ وَ بَقِيَّةٌ مِمّٰا تَرَكَ آلُ مُوسىٰ وَ آلُ هٰارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلٰائِكَةُ اِنَّ في ذٰلِكَ لَآيَةً لَكُمْ اِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾.(١)

گوتی: نیشانەی مەلێکی تالوت ئەوەیە کە تابووتی عەهد چەند ساڵە وون بووە، بە هۆی مەلائیکەوە بۆتان دێتەوە و دڵتان ئاسوودە دەبێ، تەواوی ئامۆژگاریەکانی تێدایە کە لە شار چوونە دەرەوە تابووتەکەیان دۆزیەوە و چوون لە سەر دەستی تالوت بەیعەتیان کرد، تالوت لشکرێکی زۆری کۆ کردەوە و بەرەو فەلەستین بۆ شەڕ کردن لەگەڵ عەمالیقەکان کەوتە ڕێ.

ئەوانیش کە زانیان تالوت بە لشکر و سپایێکی زۆرەوە ئەوا هاتە سەریان، بە سەرکردایەتی جالوت ناوێک کە زۆر پاڵەوان بوو، خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد.

﴿فَلَمّٰا فَصَلَ طٰالُوتُ بِالْجُنُودِ قٰالَ اِنَّ اللّٰهَ مُبْتَلِيكُمْ بِنَهَرٍ فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنّي وَ مَنْ لَمْ يَطْعَمْهُ فَاِنَّهُ مِنّي اِلّٰا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ﴾.(٢)

کاتێک تالوت وەڕێ کەوت و لە دوژمن نزیک بۆوە، ویستی سپاکەی بە تاقی بکاتەوە و بزانی داخوا خۆیان بۆ شەڕ و تینوایەتی ڕا دەگرن؟! ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: تووشی چومێک دەبین خوا تاقیتان دەکاتەوە، ئەوەی لە ئاوی ئەو چۆمە وەخوا ئەوە لە جەماعەتی من نیە و ئەوەی نەشخواتەوە لە ئێمەیە، مەگەر بە مستی خۆتان سەر و مشت وەخۆن ئەوە قەیدی نیە.

﴿فَشَرِبُوا مِنْهُ اِلّٰا قَلِيلاً﴾.(٣)

بەڵام کە چوونە سەر ئاوەکە هێندێکیان نەبێ هەموانیان تیر و پڕ ئاویان خواردەوە و لە تاقی کردنەوە دەر نەچوون.

﴿فَلَمّٰا جٰاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ قٰالُوا لٰا طٰاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجٰالُوتَ وَ جُنُودِهِ﴾.(٤)

وەختێک تالوت و موسوڵمانەکان لە ئاوەکە پەڕینەوە بەعزیکیان گوتیان: ئەوڕۆ ئێمە ناوێرینە جالوت و سوپاکەی با بە گژیاندا نەچین و شەڕ نەکەین!

---

(١) البقرة: ٢٤٨. (٢) و (٣) و (٤) البقرة: ٢٤٩.

﴿قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُمْ مُلَاقُوا اللَّهِ كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾.(١)

بەڵام ئەوانەی کە بە ڕاستی موسوڵمان بوون. ئیمانیان بە دوارۆژ و موحاسەبە هەبوو، لە زۆری دوژمن نەترسان و گوتیان: هەر بە گژیاندا دەچین.

﴿وَ لَمَّا بَرَزُوا لِجَالُوتَ وَ جُنُودِهِ قَالُوا رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْراً وَ ثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾.(٢)

کە چوونە مەیدانی موبارەزە، ڕوویان کردە ئاسمان و دوعایان کرد و گوتیان: ئەی خوای گەورە، سەبرمان بە سەردا بڕژێنە و خۆ ڕاگرین لە مەیدانی شەڕدا و بە سەر دوژمندا سەرمان بخە.

﴿فَهَزَمُوهُمْ بِإِذْنِ اللَّهِ وَ قَتَلَ دَاوُدُ جَالُوتَ وَ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَ عَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ﴾.(٣)

خوای گەورە دوعاکەی گیرا کردن و داود جالوتی پاڵەوانی کوشت و خوا مڵک و ماڵ و پێغەمبەرایەتی و لە هەر زانیاریەک خوا ئارەزووی کرد دای بە داوود. جا کوشتنی جالوت بەو جۆرە بوو. وە پاشایەتی و پێغەمبەرایەتی حەزرەتی داوود لێرەڕا دەست پێ دەکا.

قورئان بە درێژی باسی ئەوەی نەکردووە کە حەزرەتی داوود چۆنی جالوت کوشتووە، بەڵام زانایانی مێژوزان و عولەمای تەفسیر دەڵێن کاتێک لشکری جوولەکەکان بە سەرکردایەتی تالوت و لشکری عەمالیقە بە سەرکردایەتی جالوت بەرامبەر وەستان، تا چەند شەو و ڕۆژ هیچ کامیان نەچوونە مەیدان، تا ڕۆژێک لە لشکری عەمالیقەکان پاڵەوانێک بە ناوی جالوت کە سەرکردەی سوپاکە بوو هاتە مەیدان داوای کردکێ دەخۆڕا دەبینێ بۆم بێتە مەیدان تا دۆزەخی نیشان بدەم؟ پڕ بە دۆڵەکە دەی‌نەڕاند و جنێوی دەدان و دەیگوت: کێ پیاوە بابێ؟ ئەگەر لە عەرزی دام ئەوە خۆم و سوپاکەم دەبینە عەبد و بەندەی ئێوە، ئەگەر منیش بەزاندم ببنە بەندەی ئێمە.

چەند ڕۆژ لە بەیانیڕا تا ئێوارە دەی‌نەڕاند کەس نەبوو جوابی وەدا، تالوت زۆری

---

(١) البقرة: ٢٤٩. (٢) البقرة: ٢٥٠. (٣) البقرة: ٢٥١.

خەفەت دەخوارد، وەعدی دابوو هەر کەسێک بۆی بچێتە مەیدان و بی‌کوژێ بیکا بە سەرلشکری و کچەکەی خۆشی بداتێ.

ڕاوی دەڵێ لە شاری بەیت لەحم جوولەکەیەک بوو ناوی یسی بوو، سێ کوڕی لەگەڵ تالوت بوون، دەمێک بوو لێیان بێ خەبەر بوو. ڕۆژێک کوڕە چووکەکەی کە ناوی داوود بو و شوانی مەڕ و ماڵەکەی بوو، ناردی تا خەبەری براکانی بۆ باوکی بێنێتەوە، داوود ڕۆیشت تا چۆ ناو لشکری تالوت، لەو کاتەدا جالوتی کافر ئەوا لە مەیداندا دەنەڕێنی و پیاو نیە جوابی وەدا، زۆری پێ ناخۆش بوو، غیرەتی بزوت و گوتی: ئەرێ گەورەی موسوڵمانەکان کامەیە؟ گوتیان: فڵان کەسە. چوو بۆ لای تالوت و گوتی: قوربان ئەگەر ئیجازەم بدەی من بۆ ئەو کافرە دەچمە مەیدان، تالوت کە تەماشای کرد زۆری وەبەر دڵی کەوت، بەڵام بە سەر وسیمای‌ڕا زانی کە تا ئێستا شەڕی نەدیوە، گوتی: کوڕم وادیارە تۆ پاڵەوان بازیت نەکردووە و شەڕت نەدیون؟ چون دەتوانی بچیە مەیدانی ئەو کافرە؟ گوتی: قوربان بە ئومێدی خوا دەیکوژم.

دووبارە تالوت گوتی: ناوت چیە و کوڕی کێ‌ی و کارت چیە؟ عەرزی کرد قوربان ناوم داوودە و کوڕی یسیی‌م و شوانی بزن و مەڕی باوکم دەکەم. گوتی: قوربان من شێر و گورگ ورچم کوشتووە، تالووت گوتی: دە ئەگەر هەر دەچی وەرە ئەو کراسە زرێ پۆشە لە بەر کە و ئەو گورز و شیرە هەڵگرە جا بچۆ مەیدان. داوود کراسی زرێ‌ی لە بەر کرد. هەر چەند کردی و کراندی نەی زانی پێیەوە بڕوا، دای‌نایەوە گورز و شیری فڕێدان و دەستی دایە قۆچەقانێ شوانیەکەی و چەند بەردی هەڵگرتن و ڕوی کردە مەیدان. تالوت گوتی: ئەگەر بیکوژی کچەکەمت لێ مارە دەکەم و دەت کەم بە سەرلشکر. جالوت کە چاوی پێ کەوت دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی: کەس نەبوو بۆم بێتە مەیدان شوانێکی قۆچەقانی بە دەست نەبێ؟ داوود گوتی: ئەی کافر تۆ وەک سەگ وای و سەگیش دەبێ بەردی پێ دادرێ. جالوت ڕقی هەستا و دستی دایە شیر و پەلاماری دایە، بەڵام حەزرەتی داوود گورج بەردێکی خستە ناو قۆچەقانیەکەی و هاویشتی ڕاست لە ناو چاوانی جالوتی کافری دا و خستی، پیاوانە ڕاماڵی کردێ و شیرەکەی لە دەست دەرهێنا و سەری بڕی. کافرەکان

لە ترسان ڕایان کرد و شکان، تالوت زۆر کەیف خۆش بوو، کچەکەی خۆی لێ مارە کرد و کردیشی بە سەرلشکر، ڕوژ لە دوا ڕۆژ ئاوازەی پیاوەتی و لێ هاتوویی داوود زیاتر پەرەی دەستاند و خۆشەویستر دەبوو، زۆرتر دەکەوتە سەرزاران، بەڵام تۆ لە چەرخی ڕۆژگار گەڕێ.

کەس نازانێ چۆن دەگەڕێ؟ یان چ بکەین لەگەڵ دڵ پارچە گۆشتێکە و هەر تاوە لە سەر مەجازێکە، لە پاش ماوەیەک تالوت فکری گۆڕا دەربارەی داوود، کە زانی لە ناو خەڵکدا باس هەر باسی پیاوەتی داوودە، ڕۆژێک داوود چوو بۆ بارەگای تالوت، زۆر بە گرژ و ناو چاوان تاڵی هاتە پێش چاو، ڕۆژان کە لە دورەوە چاوی پێ دەکەوت ڕوو خۆش و دەم بە پێ کەنینەوە بوو، بەڵام ئەو ڕۆژ خوێن تاڵ و ڕووگرژە، بە تۆبزیش پێ کەنینی نایەتێ.

لە دڵی خۆیدا دەیگوت: دەبێ چ ڕووی دابێ؟ خەڵک چ خەراپەیەکیان گوتبێ؟ بۆ دەبێ ئەو ڕۆژ لەگەڵ مندا وا ڕوو گرژ بێ؟ هەستا چۆوە بۆ ماڵ و کارەساتی بۆ مکیالی خێزانی گێڕایەوە مکیال هەناسەیێکی هەڵکێشا و فرمێسکی هەڵ وەراندن و گوتی: جا چت لێ وەشێرم؟ لەو ڕۆژەوە باوکم زانیویەتی خەڵک ئەوەندیان تۆ خۆش دەوێ و باس باسی چاکە و پیاوەتی تۆیە؟ زۆرت لێ دەترسێ، دەترسێ ڕۆژێک بێ بە تەواوی تۆ دەسەلاتی لە مست دەرهێنی؟

بەو بۆنەیەوە دەی هەوێ بە هەر قیمەتێک بێ لە بەینت بەرێ، ڕاوی دەڵێ ئاخری حەزرەتی داوود مەجبوور بوو بە خۆی و خێزانی بڕوا و چوو بۆ کێوێک و لە ناو ئەشکەوتێکدا دەستی کرد بە خواپەرستی و بەرەبەرە خواپەرستەکان دەوریان دا و قەرەباڵغ لە دەوری پەیدا بوو لەم لاشەوە لە ماوەیێکی زۆر کەمدا بە هۆی ئەوەوە کە تالوت زوڵم و زۆری پەیدا کرد، دەوری چۆڵ بوو، ناچار بوو دەست کا بە شەڕ لەگەڵ ناحەزەکانی و هەروەها بە گژ فەلەستنیەکانیشدا بچێ.

بەڵام لە شەڕدا شکاو کوژرا. ئنجا تەواوی خەڵکی وڵاتی شام و فەلەستین حەزرەتی داوودیان کردە مەلیک و لە عومری چل ساڵیدا خواوەندی گەورەش کردی بە پێغەمبەر و زەبوری بە خەلات بۆ نارده خوارەوە.

دەستی کرد بە پاشایەتی و پێغەمبەری و روتبەی دین و دنیای دەست کەوت و ئاوازەی زانیاری و عەقڵ و دەوڵەمەندی بە دنیادا بڵاو بۆوە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خەڵک زیاتر ئیمانی پێ دێنا و زۆرتر موسوڵمان دەبوون. خواوەندی گەورە ئەوەندەی موعجیزە و ناز و نیعمەت دابوو بە حەزرەتی داوود مەگەر هەر خوا بزانێ، یەکێ لە موعجیزە گەورەکانی زەبوور بوو، یەکی دی دەنگە خۆشەکەی و هەروەها چەند شتی تریش هەر وەکو خوا لە قورئاندا دەفەرموێ:

﴿وَ لَقَدْ آتَيْنٰا دٰاوُدَ مِنّٰا فَضْلاً يٰا جِبٰالُ اَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَ اَلَنّٰا لَهُ الْحَدِيدَ﴾.(١) ﴿اَنِ اعْمَلْ سٰابِغٰاتٍ وَ قَدِّرْ فِي السَّرْدِ﴾.(٢)

بە ڕاستی ئێمە زیاتر لە پێغەمبەران و خەڵک ناز و نیعمەتمان دا بە داوود، بە کێو و باڵندانمان گووت: کە داوود تەسبیحاتی کرد و خوێندی و گریا لە گەڵی بخوێنن و بگرین.

هەروەها ئاسنمان بۆ وەک مێو لێ کرد لە بەر دەستیدا، بێ ئاور و کوتان بۆی نەرم دەبوو، بۆ ئەوەی زرێی لێ ی دروست کا و زەنجیرەکانی نە زۆر باریک بن نە درشت.

چاکی بچنی و پڕ بە بەر خەڵک بن، سەبەب و هۆی زرێ دروست کردنیشی ئەوە بوو، بە ڕۆژ دەگەڕا لە غەرێبان و نەناسیاوانی دەپرسی. دەیگوت: داوود چۆن پیاوێکە، تا ڕۆژێک پیاوێک گوتی: هیچ عەیبی نیە ئەوە نەبی لە بەیتی ماڵ مەسرەف دەکا حەزرەتی داوود لە دڵی خۆیدا گوتی: ڕاست دەکا، دوعای کرد و خوا فێری زرێ دروست کردنی کرد و دەی‌فرۆشتن و خەرجی ماڵ و منداڵی لێ دەکرد.

جا با لێرە حەزرەتی داوود لە ژیانێکی خۆش‌دا بە جێ بیلێین و تا سبەینی ئەو کاتە هەموو لایەک بە خوا بسپێرین.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(١) سبأ: ١٠. (٢) سبأ: ١١.

٢

# حەزرەتی داوود

## باسی «حەزرەتی داوود» سەلامی خودای لە سەر بێ

بسم الله الرحمن الرحيم

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

گوێگرینە با بچینەوە سەر باسی حەزرەتی داوودی نەغمە خوان و گوێ ڕاگرینەوە بۆ پاش ماوەی ژیانی و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین، حەزرەتی داوود کات و وەخت و سەعاتی خۆی کردبوو بە چوار بەش، ڕۆژێک خەریکی عیبادەت و خواپەرستی دەبوو، ڕۆژێکی دی دادگەری و قەزاوەتی دەکرد، ڕۆژی سێهەم ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، ڕۆژی چوارەم خەریکی ئیسراحەت و ڕابواردن دەبوو.

﴿يٰا دٰاوُدَ إِنّٰا جَعَلْنٰاكَ خَلِيْفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النّٰاسِ بِالْحَقِّ وَ لٰا تَتَّبِعِ الْهَوىٰ فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللّٰهِ﴾.[١]

لە سورەی «ص»دا خواوەندی گەورە لە بارەی دادگەری حەزرەتی داوودەوە

---

(١) ص: ٢٦.

دەفەرموێ: ئەی داوود ئێمە تۆمان کردوە بە خەلیفە لە سەر ئەرز، تا قەزاوەت و دادگەری لە بەینی خەڵکدا بکەی، بەڵام لە بەر ئەوەی سروشت و تەبیعەتی بەشەری زۆری وایە بە هۆی ڕوتبە و مەقام وماڵی دنیاوە دەگۆڕێ و لە خۆی بایی دەبێ، خوا حەزرەتی داوود ئاگادار دەکاتەوە و دەفەرمووی: یا داوود ئاگات لە خۆت بێ، حوکم لە بەینی خەڵکدا بە ڕاستی بکە و لە حەق لا نەدەی و بە قسەی نەفس و شەیتان نەکەی لەو ڕێگایە لات دەن کە خوا دایناوە.

﴿وَ دٰاوُدَ وَ سُلَيْمٰانَ اِذْ يَحْكُمٰانِ فِي الْحَرْثِ اِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ وَ كُنّٰا لِحُكْمِهِمْ شٰاهِدِينَ﴾.[1] ﴿فَفَهَّمْنٰاهٰا سُلَيْمٰانَ وَ كُلّاً آتَيْنٰا حُكْماً وَ عِلْماً﴾.[2]

هەر وەکو حەزرەتی داوود دادگەر و زانا بووە، حەزرەتی سولەیمانی کوڕیشی وەها زانا بووە. زانایانی تەفسیرزان لە مەعنای ئەو ئایەتەدا فەرموویانە: ڕۆژێک دوو پیاو دێنە خزمەت حەزرەتی داوود و یەکیان عەرزی دەکا قوربان، مەڕی ئەو پیاوە بە شەو کەوتۆتە ناو دەغڵ و دانەکەم ئەوی خواردویە خواردویەتی دەنا لە بەینی بردووە.

حەزرەتی داوود ڕوی کردە خاوەن مەڕەکە و فەرمووی: ئەو پیاوە ڕاست دەکا؟

گوتی: بەڵێ قوربان، ئنجا ڕووی کردە خاوەن زەراعەتەکە و فەرمووی: زەراعەتەکەت بایی چەند دەبوو؟ کابرا مەبلەغێکی گوت: بە خاوەن مەڕەکانیشی گوت: ئەی مەڕەکانی تۆ بایی چەندن؟ ئەویش مقدارێکی گوت. چی وای لەگەڵ قیمەتی دەغڵ و دانی کابرا فەرق نەبوو.

بە خاوەن مەڕەکەی گوت: دەبێ تۆ مەڕەکانت بدەی بەو پیاوە لە باتی خەلە و خەرمانەکەی، حەزرەتی سولەیمانی کوڕی لەوێ حازر بوو، بە ئەدەبەوە گوتی: ئەی باوکە، ئەگەر ئیجازە هەبێ من قسە بکەم من ڕەئییێکی دیکەم هەیە. باوکی فەرمووی: بڵێ بزانم ڕەئیەکەت چۆنە. حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: ئەو خاوەن مەڕە مەڕەکانی بدا بەو پیاوە لە خوری و بەرگن و شیر و ماست و بەرهەمیان ئیستیفادە بکا. ئەمیش زەوی ئەو دابچێنێ و ئاوی بدا و ئاگاداری بکا تا پێ دەگاتەوە، جا ئەو کاتە زەراعەتەکە تەسلیم بە خاوەن زەوی بکاتەوە و مەڕەکانی وەرگرێتەوە.

---

(١) الأنبياء: ٧٨. (٢) الأنبياء: ٧٩.

حەزرەتی داوود فەرمووی: بە ڕاستی کوڕی خۆشەویستم حوکمەکەت زۆر جوانە و حوکمی بە قسەی ئەو کرد. جا ئەوەیە کە خوای گەورە لە سورەی «الأنبیاء»دا دەفەرمووێ: ئەی پێغەمبەر تۆ باسی داوود و سولەیمان بۆ ئوممەتەکەت بگێڕەوە کە چۆن حوکمیان کرد دەرحەق بەو مەڕانە کە شەو چوو بوونە ناو زەراعەتی کابرا و ئێمە ئاگامان لە حوکمەکەیان بوو، هەر چەند ئەو باوک و کوڕە هەردوکیان زانا و دانا بوون، بەڵام حوکمەکەی سولەیمان جوانتر بوو.

جا با بێینە سەر باسی موبتەلا بوونی حەزرەتی داوود ڕاجیع بە فیتنەی حەزرەتی داوود قسەی زۆر کراون.

یەکێ لەوانە دەڵێ ڕۆژێک باسی گەورەیی حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیسحاق و حەزرەتی یەعقووبی دەخوێندەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: دەبێ چ تاعەت و عیبادەتێکیان زیاتر لە ئێمە کردبێ خوا ئاوای گەورە کردوون؟.

خوای گەورە بەو هۆیەوە عیتابی لێ گرت و وەحی بۆ نازڵ کرد و فەرمووی: یا داوود ئاخر ئەوانم تووشی هەزار دەرد و بەڵا کرد و سەبریان لە سەر گرت بۆیە وام گەورە کردوون. حەزرەتی داوود گوتی: ئەی خوای گەورە ئەمنیش سابیر دەبم، حەزرەتی داوود ئەوەی گوت و حەزرەتی جوبرەئیل نازڵ بوو و گوتی: یا داوود زۆر ئاسودە بوی، بەڵام خۆت خستە نارەحەتی‌یەوە، خۆت بۆ موسیبەت ئامادە بکە. یەکی‌تر دەڵێ داوود ژنی زۆر هێناون، بە قەولێک نەوەد و نۆ ژنی هێناوە، کوڕێک کە ناوی ئەوریای کوڕی حەنان بوو، هەڕەدی لاوی بوو، زۆری حەز دەکرد هاوسەرێکی جوان و باش ونەجیبی دەست کەوێ و دڵی پێ خۆش کا. شەوو ڕۆژ چاوی دەگێڕا، تا ڕۆژێک چاوی بە سابغی کچی شائع کەوت و دڵی چۆە سەر. خۆی بۆ ڕانەگیرا ناردی‌یە خوازبێنیان و داوای کرد و بەڵێنیان پێدا.

ئەوریا شەو و ڕۆژ لە خەیاڵی ئەوەدا بوو چۆن ماڵێک پێکەوە نێ و ژن بێنێ و ژیانێکی خۆش ڕابوێرێ. ئەوریا لاو بوو، لاوەکانیش دەبێ تا گەنج و لاون واجبی سەرشانیان بە جێ بێنن.

بچنە سەربازی و خزمەت بە گەل و نیشتمان بکەن، وا ڕێکەوت لەو سەروبەنەدا حەزرەتی داوود لشکرێکی گەورەی بۆ غەزا ئامادە کرد، ئەوریاش نەی توانی ئەرکی سەرشانی بە جێ نەهێنێ، چوو بوو بە پێشمەرگە و چۆ ڕیزی سەربازەکانەوە. بە ئومێدی ئەوەی کە غەزای تەواو کرد بگەڕێتەوە و لەگەڵ دەزگیرانەکەی زەماوەند بکا.

بەڵام بەندە دەکا خەیاڵان خودا دەکا بەتاڵان، چەرخ بە نەوعێکی تر گەڕا، شەڕ درێژەی کێشا، ئەوریا ئاگای لە ئومێد و ئاواتەکەی بڕا، حەزرەتی داوود دڵی چۆ سەر سابغ. ناردی بۆ خوازبێنیان و دایانێ. چونکە لایان وا بوو ئەوریا هەر نەش‌ماوە ئەگەر ماشبێ خۆ مارەی نەکردووە، حەزرەتی داوود مارەی کرد و گواستی‌یەوە، دەڵێن حەزرەتی سولەیمان لەو ئافرەتەیە.

جا بەو هۆیەوە خوا ئاگاداری کردەوە و عیتابی لێ گرت: هەر وەک خوای گەورە لە سورەی «ص»دا چۆنیەتی ئەو بەسەرهاتەمان بۆ بەیان دەکا و دەفەرمووێ:

﴿وَ هَلْ اَتٰاكَ نَبَؤُا الْخَصْمِ اِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرٰابَ﴾.(١)

ئایا ئەی پێغەمبەر تۆ خەبەری ئەو دوو داواکەر و داوا لێ کراوەت نەزانی‌وە کە لە نکاو لە کاتێکدا حەزرەتی داوود لە میحرابدا بوو لێ‌ی وەژور کەوتن؟

﴿اِذْ دَخَلُوا عَلىٰ دٰاوُد فَفَزِعَ مِنْهُمْ قٰالُوا لٰا تَخَفْ خَصْمٰانِ بَغىٰ بَعْضُنٰا عَلىٰ بَعْضٍ فَاحْكُمْ بَيْنَنٰا بِالْحَقِّ وَ لٰا تُشْطِطْ وَاهْدِنٰا اِلىٰ سَوٰاءِ الصِّرٰاطِ﴾.(٢)

چوونە لای داوود بێ ئەوەی دەرکەوان ئاگایان لێ بێ، هەر چەند بە زاهیری وەک خەڵک دەچوون، بەڵام لە بەر ئەوەی حەزرەتی داوود دەی‌زانی ئەو ڕۆژە حەرەس و دەرکەوان ڕێگا نادەن کەس بچێتە خزمەتی، خەڵکیش بێ ئەمری ناکەن، بە بێ پرس بچنە ژوورەوە. زۆریان لێ ترسا، میوانەکان حاڵی بوون کە حەزرەتی داوود خۆفێکی ڕێ‌نیشت و دەترسێ، گوتیان: مەترسە ئێمە هاتووین بۆ شەرع. یەکمان غەدری لەوی‌تر کردووە، بە ڕاستی شەرعمان بکە و زوڵم مەکە و ڕێگای ڕاستمان نیشان بدە.

﴿اِنَّ هٰذٰا اَخي لَهُ تِسْعٌ وَ تِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِيَ نَعْجَةٌ وٰاحِدَةٌ فَقٰالَ اَكْفِلْنِيهٰا وَ عَزَّنِي فِي الْخِطٰابِ﴾.(٣)

---

(١) ص: ٢١. (٢) ص: ٢٢. (٣) ص: ٢٣.

یەکیان ڕووی کردە حەزرەتی داوود و گوتی: قوربان ئەوە برای دینیمە نەوەد و نۆ مەڕی هەیە، من هەر مەڕێکم هەیە کە چی تەماعی دە مەڕەکەی من کردووە و دەڵێ دەبێ بیدەی بە من بە قسە و دەلیل و بەڵگەش نایوێرمێ.

حەزرەتی داوود ڕوی کردە ئەوی‌تر و فەرمووی: ڕاست دەکا؟ گوتی: بەڵێ:

﴿قٰالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤٰالِ نَعْجَتِكَ اِلَىٰ نِعٰاجِهِ﴾.(١)

حەزرەتی داوود ڕوی کردەوە زوڵم لێ کراوەکە و گوتی: بە ڕاستی زوڵمی لێ کردوی کە داوای مەڕەکەی تۆی کردوە.

﴿وَ اِنَّ كَثِيراً مِنَ الْخُلَطٰاءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلىٰ بَعْضٍ﴾.(٢)

فەرمووی بە ڕاستی زۆر لە دۆست و برادەرمان هەوڵ دەدەن زوڵم لە یەکتر بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا کە پێویستە ئینسافیان هەبێ، ئەو زوڵم کردنەش سروشتی زۆربەی خەڵکە، مەگەر ئەوانە نەبێ کە موسوڵمانن و کاری باش دەکەن.

﴿اِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَ عَمِلُوا الصّٰالِحٰاتِ وَ قَلِيلٌ مٰا هُمْ﴾.(٣)

ئەوانیش زۆر کەمن لە ناو کۆمەڵی ئادەمیزاددا.

ئنجا بە ڕیوایەتێک دەڵێن ئەو دوو نەفەرە هەستان خوا حافیزیان کرد و گوتیان: حەزرەتی داوود حوکمی بە سەر خوێدا کرد.

﴿وَ ظَنَّ دٰاوُدُ اَنَّمٰا فَتَنّٰاهُ فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَ خَرَّ رٰاكِعاً وَ اَنٰابَ﴾.(٤)

حەزرەتی داوود کە ئەو قسەی بیست بە برینی خۆی زانی و بۆی دەرکەوت کە ئەوانە بۆ تاقی کردنەوەی ئەو هاتون. دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە و بە سوجدەدا کەوت. داوای لێ بووردنی لە خوا دەکرد شەو و ڕۆژ وەک شێتان لە کێو و بیابان و دەشت و دۆڵ دەگەڕا و تەسبیحاتی خوای دەکرد و دەگریا، بە ئەمر و قودرەتی خوا تەواوی دار و بەرد و کێو و شاە و گوڵ و گیا و باڵندە لە گەڵی دەگریان و جوابیان دەدایەوە.

﴿اِنّٰا سَخَّرْنَا الْجِبٰالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْاِشْرٰاقِ﴾.(٥)

هەر وەک خواوەندی گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ:

---

(١) و (٢) و (٣) و (٤) ص: ٢٤. (٥) ص: ١٨.

ئێمە کێوەکانمان حاڵی کردن کە ئێوارە و بەیانی لەگەڵ حەزرەتی داوود تەسبیحات بکەن و جوابی دەنگە خوشەکەی بدەنەوە.

﴿وَالطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَهُ اَوّٰابٌ﴾.(١)

تەواوی تەیر و باڵندە لە دەورەی کۆ بونەوە و لە گەڵی دەگریان بە زمانی خۆیان. خوا دەفەرمووێ:

﴿فَغَفَرْنٰا لَهُ ذٰلِكَ وَ اِنَّ لَهُ عِنْدَنٰا لَزُلْفىٰ وَ حُسْنَ مَآبٍ﴾.(٢)

لە داوود خۆش بووین و لە لای ئێمە زۆر خۆشەویستە و جێگای بەهەشتە. جا موسوڵمانینە ئەگەر ئێمە بە وردی لە باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی داوود حاڵی بین دەزانین کە ئەو پێغەمبەرە نازدارە لای خواوەندی گەورە چەند گەورە بوە و خوا زۆری خۆش ویستووە.

زەبووری بۆ نازڵ کردوە، هەر وەک پێغەمبەر بووە پاشاش بووە، ئاسنی بۆ نەرم کردوە بە بێ کوتان لە بەر دەستی‌دا وەک مێو وا بوو زرێی لێ دروست دەکرد. دەنگ خۆشی‌یەکەی موعجیزەیەکی زۆر گەورە بوو، زمانی باڵندانی دەزانی، کوڕی وەک حەزرەتی سولەیمانی هەبوو.

بەڵام ئینسان نابێ بە ماڵ و سەروەت و کوڕ و ڕوتبە و مەقام بنازێ. حەزرەتی داوود لەگەڵ ئەوەشدا بێ خەفەت نەبوو، تووشی عیتابی خوا بوو، لە ترسی خوا شەو و ڕۆژ دەگریا.

لە بەرامبەر بێ ئەمری خوادا پێغەمبەر و شاو و گەدا وەک یەکن، هەموویان دەمرن و حیسابیان لەگەڵ دەکرێ. ئەو پێغەمبەرە کە پاشاش بوو کاتێک نۆرەی گەیشتە سەرێ هیچ مۆڵەت نەدرا. ئەو دەرکەوانەی کە هەموو شەوێک وەختی نووستنی دەرگای دادەخست و کلیلەکانی دەدا بە حەزرەتی داوود، ئەو شەوە دەرگای بارەگای حەزرەتی داوودی داخست، بەڵام تەماشای کرد زەلامێک لە ناو حەوشەدایە، بە توڕەیی‌یەوە گوتی: ئەرێ کابرا تۆ چ کەسەی بەو درەنگ وەختی‌یە هاتویە ئێرە؟ مەگەر نازانی ئێرە بارەگای

---

(١) ص: ١٩. (٢) ص: ٢٥.

حەزرەتی داوودە کەس ناتوانی بێ ئیجازە بێتە ئێرە؟ حەزرەتی داوود لە ژورەوە ڕاگوێی لەو دەنگە دەنگە بوو. فەرمووی: کێیە بی هێنە ژورەوە کە بردی‌یە ژورەوە فەرمووی: بۆ بە بێ ئیزن هاتویە ئێرە، کابرا لە وەلامدا گوتی: من تا ئێستا چوبمە هەر ماڵێک پرسم نەکردوە، حەزرەتی داوود فەرمووێ: بۆ خۆ حەزرەتی ئیزرائیل نی؟ گوتی: بەلێ هەوم. حەزرەتی داوود ڕەنگێکی هێنا و برد وگوتی: ئەی بۆ تا ئێستا ئاگادارت نەدەکردم تا خۆم ئامادە بکەم بۆ ئەو سەفەرە؟ فەرمووی: زۆر جارم پێ ڕاگەیاندی بە قسەت نەکردم و گوێت نەدامێ. گوتی: کەی پێت ڕاگەیاندوم. فەرمووی: ئەی حەزرەتی داوود باوکت مرد، دایکت مرد، برات مرد، برازات مرد، ژنت مرد، کوڕت مرد، دراوسێت مرد، نەت دەزانی نۆرەی تۆش دێ؟ ئەوەی گوت و لە شەوی شەممەی ۵۳۵ ساڵ دوا وەفاتی حەزرەتی مووسادا لە تەمەنی سەد ساڵیداگیانی کێشا و وەفاتی کرد وگۆڕی موبارەکی ئەوا لە شامە.

ئەوە بوو باسی بەسەرهاتی حەزرەتی داوودی نەغمەخوان و دەنگ خۆش، ئومێد دەکەم سودی لێ وەرگرن.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# ١

# حەزرەتی سولەیمان

## باسی «حەزرەتی سولەیمان» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلِینَ وَ عَلیٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِینَ.

موسوڵمانینە بە لە کۆڕ و مەجلیسی ئەو ڕۆماندا بچینە خزمەت سولەیمانی پێغەمبەر و بە ئەدەب دانیشین و گوێ ڕاگرین بۆ باسی ژیان و بەسەرهاتی و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین، حەزرەتی سولەیمان کوڕی حەزرەتی داوود بووە. هەر وەکو خوای گەورە لە سورەی «ص»دا فەرموویەتی:

﴿وَ وَهَبْنٰا لِدٰاوُدَ سُلَیْمٰانَ نِعْمَ الْعَبْدُ اِنَّهُ اَوّٰابٌ﴾.(١)

ئێمە دامان بە داوود و سولەیمان کە باشترین عەبد بو و زۆر لە خوا دەترسی، کاتێک حەزرەتی داوود وەفاتی کرد، حەزرەتی سولەیمان بوو بە جێنشین.

﴿وَ وَرِثَ سُلَیْمٰانُ دٰاوُدَ﴾.(٢)

---

(١) ص: ٣٠. (٢) النمل: ١٦.

حەزرەتی سولەیمان بوو بە واریس و جێ‌نشینی حەزرەتی داوودی باوکی لە پێغەمبەرایەتیدا و لە پاشایەتیدا.

ئەو ڕۆژەی لە سەر تەختی سەڵتەنەت دانیشت تەواوی وەزیر و وزەرا و پیاو ماقوڵ و زوربەی خەڵکی بانگ کرد و گوتی:

﴿وَ قٰالَ یٰا اَیُّهَا النّٰاسُ عُلِّمْنٰا مَنْطِقَ الطَّیْرِ وَ اُوتِیْنٰا مِنْ کُلِّ شَیْءٍ اِنَّ هٰذٰا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِیْنُ﴾.(١)

خەڵکینە سوپاس بۆ خوا زیاد لە ناز و نیعمەت و پێغەمبەری و پاشایی و ڕوتبە و مەقام و هەر شتێک پێغەمبەران و پاشایان و خەڵک هەیانە، خوا فێری زمانی باڵندانیشی کردم، کە بە ڕاستی ئەوەش لوتف و کەرەمێکی ئاشکرایە خوا دگەڵ منی کردوە. دەڵێن لە پاش ئەوەی حەزرەتی سولەیمان بو بە جێ‌نشینی باوکی هەروەکو لە سورەی «ص»دا دەفەرمووێ:

﴿قٰالَ رَبِّ اغْفِرْلِي وَهَبْ لِي مُلْكاً لٰا یَنْبَغِي لِاَحَدٍ مِنْ بَعْدِي اِنَّكَ اَنْتَ الْوَهّٰابُ﴾.(٢)

دووعای کرد و فەرمووی: ئەی خوای گەورە عەفووم کە و ڕوتبە و مەقامێکی وام بدەیە کە لە پاش من نەیدەی بە کەسی دی. خۆت بەخشندەی کەیفی خۆتە.

ئنجا خواوەندی گەورە دوعاکەی گیرا کرد و هەرچی ئارەزوی بو دایە و نگینی پێ عەتا کرد کە دەڵێن: تەواوی حوکم و سەڵتەنەتی حەزرەتی سولەیمان بە هۆی نەقیمی ئەو ئەنگوستیلەوە بووە.

خواوەندی گەورە ئەمری کرد بە با لە فەرمانی حەزرەتی سولەیمان دەر نەچی!

﴿فَسَخَّرْنٰا لَهُ الرِّیحَ تَجْرِي بِاَمْرِهِ رُخٰاءً حَیْثُ اَصٰابَ﴾.(٣)

واتە بە بامان گوت: لە فەرمانی حەزرەتی سولەیمان دەر نەچێ و نەرم بێ و بە قسەی بکا بۆ هەر جێگایەک حەزرەتی سولەیمان ویستی بچێ لە قسەی دەر نەچێ.

﴿وَالشَّیٰاطِینَ کُلَّ بَنّٰاءٍ وَ غَوّٰاصٍ﴾.(٤) ﴿وَ آخَرِینَ مُقَرَّنِینَ فِی الْاَصْفٰادِ﴾.(٥)

(١) النمل: ١٦. (٢) ص: ٣٥. (٣) ص: ٣٦.
(٤) ص: ٣٧. (٥) ص: ٣٨.

هەر وەها بە شەیاتینیانمان گوت: ئیتاعەی بکەن، هێندێک بینای بەرز و کۆشکی عالیی و بەرزیان بۆ دروست دەکرد. هەندێکیان لە ژێر دەریادا دوڕ و گەوهەر و مەرجانیان بۆ دێنایە دەرێ، ئەوەی کافر بوو لە شەیاتینیان زنجیری کردبوون.

﴿هٰذا عَطاؤُنا فَامْنُنْ اَوْ اَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسابٍ﴾.(١)

گوتمان: ئەوەیە عەتا و بەخششی ئێمە چی لێ دەبەخشی ببەخشە و نای بەخشی مەی بەخشە. پرسینەوەت لە سەر نیە ماڵی خۆتە.

هەروەها لە سورەی «سبأ»دا دەفەرمووێ: بامان لە ئیختیاری حەزرەتی سولیمان نابوو.

﴿وَ لِسُلَيْمانَ الرِّيحَ غُدُوُّها شَهْرٌ وَ رَواحُها شَهْرٌ وَ اَسَلْنا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ﴾.(٢)

بەیانیان مانگەرێیکی دەبرد و ئێواران مانگەرێیکی دەبرِی و دەی هێنایەوە، دوری دەخستەوە سەرچاوەی مسی تواوەمان بۆ لە ژێر ئەرز هێنایە دەرێ و دامانێ.

﴿وَ مِنَ الْجِنِّ مَنْ يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِاِذْنِ رَبِّهِ﴾.(٣)

هەزاران ئەجیننە لە ژێر فەرمانیدا بوون، کاری‌یان دەکرد بە ئەمری خوا بۆ حەزرەتی سولەیمان.

﴿وَ مَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ اَمْرِنا نُذِقْهُ مِنْ عَذابِ السَّعِيرِ﴾.(٤)

هەر کام لەوانیش لە ئەمری در بچوبایە و بە قسەی حەزرەتی سولەیمانی نەکردایە ئەوە بە ئاگری جەهەننەم عەزابی دەدەین.

﴿يَعْمَلُونَ لَهُ ما يَشاءُ مِن مَحارِيبَ وَ تَماثِيلَ وَ جِفانٍ كَالْجَوابِ وَ قُدُورٍ راسِياتٍ﴾.(٥)

هەرچی حەزرەتی سولەیمان ئارەزووی بکردایە بۆیان دروست دەکرد لە میحراب و خانو و قەسر و بینای چاک. لە وێنەی جوان و هەیکەڵی نایاب. لە جام و کاسەی گەورەی وەک حەوز، لە مەنجەڵ و دیزەی گەورەی واکە لە جێگای خۆیان نەدەبزێوران. ڕاوی دەڵێ ڕۆژێک حەزرەتی سولەیمان گوتی: ئەی خوای گەورە دەمهەوێ ڕۆژێک هەموو گیان لە بەران میوانداری بکەم.

---

(١) ص: ٣٩. (٢) و (٣) و (۴) سبأ: ١٢. (۵) سبأ: ١٣.

بانگ کرا کە ئەی سولەیمان ڕۆژی دەهندەی مەخلوقات هەر منم، بە تۆ نان نادرێن.

گوتی: ئەی خوای گەورە زۆرت داوە بە من و زۆر دەوڵەمەندم.

خوا ئیجازەی دا حەزرەتی سولەیمان ئەمری کرد دێوان لە قەراغ بەحر جێگایان خۆش کرد، لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژ ڕۆژ ئاوا و لە ڕۆژ ئاوا بۆ ڕۆژهەڵات خواردەمەنی یان کۆ کردەوە و سەد هەزار مەنجەڵی گەورەیان دروست کرد، تەواوی ئەجیننە و ئینسان و دیو و درنج و حەیوانات و باڵندە و مار و مێرویان بانگ هێشتن کرد.

حەزرەتی سولەیمان ئەمری کرد با تەختی سولەیمانی هەڵ گرت و بردی لە سەر بەحرێی ڕاگرت، لەو کاتەدا گیان لە بەرێک هات و گوتی: پاشا من برسیمە، فەرمووی: تۆزێک سەبر بگرە با میوانەکان کۆ وەبن، گوتی: ئاخر زۆرم برسی یە خۆم بۆ ڕاناگیرێ، فەرمووی: دە چەند دەخۆی بخۆ، کە دەستی کرد بە خواردن هەموو نان و چێشتەکەی خوارد و گوتی: تێرم نەخواردوە. گوتیان: جا خۆ هیچ نەماوە، گوتی: ئەگەر خەڵکت بۆ تێر ناکرێ بۆ خەڵک بانگ هێشتن دەکەی؟

حەزرەتی سولەیمان کە ئەوەی بیست بێ هۆش بوو، بە سوجدەدا کەوت و دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە و گوتی: ئەی خوای گەورە تۆبە عەفووم کە، هەر تۆ ڕۆژی دەهەندەی، من گەدای بارەگای تۆم.

﴿وَ حُشِرَ لِسُلَيْمٰانَ جُنُودُهُ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾.(١)

هەروەها لە سورەی «النمل»دا دەفەرمووێ: ڕۆژێک لشکری حەزرەتی سولەیمان بە ئەمری حەزرەتی سولەیمان کۆکرایەوە. کە بریتی بوو لە ئەجیننە و ئینسان و باڵندە، ڕێزیان بەست تا ئاخر نەفەریان هات ئنجا لشکر وەڕێ کەوت.

﴿حَتّٰىٓ اِذٰآ اَتَوْا عَلٰى وٰادِ النَّمْلِ قٰالَتْ نَمْلَةٌ يٰآ اَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسٰاكِنَكُمْ لٰا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمٰانُ وَ جُنُودُهُ وَ هُمْ لٰا يَشْعُرُونَ﴾.(٢)

تا گەیشتە نزیک شیوێک پڕ بوو لە شارە مێرو و شای مێروان کە چاوی بەو هەموو لشکر و سپایە کەوت، بە مێروەکانی گوت:

(١) النمل: ١٧. (٢) النمل: ١٨.

دەخیلتان بم زوو بچنەوە ناوکونەکانتانەوە تا حەزرەتی سولەیمان و سوپاکەی لە رووی بێ موبالاتی‌یەوە وەبەر پێ‌یان و نەدەن و لە بەینو نەبەن، حەزرەتی سولەیمان گوێی لەو قسەی شای مێرووان بوو؛

﴿فَتَبَسَّمَ ضَاحِكاً مِن قَوْلِهَا وَ قَالَ رَبِّ اَوْزِعْنِي اَنْ اَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي اَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَ عَلَىٰ وَالِدَيَّ وَ اَنْ اَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَاَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾.(١)

بە قسەی شای مێرووان زۆر پێ خۆشحاڵ بوو، قاقا پێ کەنی و فەرمووی:

ئەی خوای گەورە توانام بدەی شوکرانەی ئەو ناز و نیعمەتە بکەم کە داوتە بە خۆم و باوکم، هەروەها تا کاری باش بکەم تا خوام لێ ڕازی بێ و بم بە ڕێزی پیاو چاکانەوە.

ڕاوی دەڵێ: ئنجا حەزرەتی سولەیمان شای مێرووانی بانگ کرد و لە سەر بەری دەستی دانا و فەرمووی: ئەی شای مێرووان بۆ چی بە مێرووەکانت گوت: لە بەر سولەیمان هەڵێن؟ چ خەراپێکت لە من دیوە؟ گوتی: قوربان هیچی خەراپم لە جەنابت نەدیوە، بەڵام گوتم مەبادا وەبەر سمی ئەسپەکان بکەون، فەرمووی: بۆ ئەی شای مێرووان ئەوەندەت ئاگا لە مێرووەکان هەیە؟ گوتی: بەڵێ، تەنانەت ئەگەر مێروویەک لە دەرەوەی شارە مێرووەکە بمرێ و بزانم دەنێرم بی‌هێننەوە، شارە مێرووەکە.

فەرمووی: باشە پاشایەتی من گەورەترە یان ئی تۆ؟ گوتی: قوربان ئی من؛ چونکە با تەختەکەت هەڵدەگری و تەختەکەت فەرشەکەت هەڵدەگری و فرشەکە تۆی هەڵگرتووە و تۆش منت هەڵگرتووە.

حەزرەتی سولەیمان دەستی کرد بە پێکەنین و فەرمووی: ئەو زانیاریەت لە کوێ بوو؟ گوتی: قوربان خۆ زانیاری هەر ئەوە نیە تۆ دەی‌زانی! خوا بەشی ئێمەشی داوە.

ئنجا لە ساڵی چوارەمی پاشایەتیدا، لە مانگی ئەیاری ساڵی ٥٥٩ دوا وەفاتی حەزرەتی مووسا دەستی کرد بە چاک کردن و تەعمیری شاری «بیت المقدس» و مزگەوتی قودس.

هەزاران ئینسان و ئەجیننە و شەیاتینی ئیشیان تێدا دەکرد، تا لە ساڵی یازدەی سەڵتەنەتیدا، واتە لە ماوەی حەوت ساڵە تەواوی کردن. ئینجا ویستی بچی بۆ زیارەتی

---

(١) النمل: ١٩.

ماڵی بەیت، هەموو وەزیر و وزەرا و پیاو ماقووڵی بانگ کردن، هەزاران ئەجینە و شەیاتینی و حەیواانات و باڵندەی کۆ کردەوە، لشکرێکی زۆر گەورەی پێکەوە نا و بەرەو مەککە کەوتە ڕێ، هەزاران باڵدار سێبەری لە سەر سەر کردبوو تا گەیشتە ماڵی بەیت، حەج و تەوافی کرد و ماوەیەک لە بەیت ماوە.

ڕۆژێک ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ئێرە جێگای لە دایک بونی پێغەمبەریکی عەرەبی دەبێ، بە سەر کافر و دین دوژمندا سەر دەکەوێ، لە بەرامبەر حەقدا خزم و بێگانەی لا وەک یەک دەبێ. فەرمووی خۆزگەم بەوکەسە بە خزمەتی دەگا و ئیمانی پێ دێنێ.

ئنجا بەیانی‌یەک ئەمری کرد بەرەو وولاتی یەمەن کەوتنە ڕێ، ڕۆیشتن و نیوەڕۆ گەینە خاکی سەنعا، حەزرەتی سولەیمان زۆر دڵ گیری هاتە پێش چاو، ئەمری کرد و فەرمووی: با لێرە دابەزین ئیسراحەتێک بکەین و نان و ئاوێک بخۆین، بەڵام کاتێک بارو بارگەیان بە ئەرزێ دادا، تەماشایان کرد ئاوی لێ نیە.

﴿وَ تَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقٰالَ مٰالِيَ لاٰ اَرَى الْهُدْهُدَ اَمْ كٰانَ مِنَ الْغٰائِبِينَ﴾.(١)

هودهود کە پەپوسلێمانەیە تەماشا هەر جێگایەکی بکردایە دی زانی داخوا ئاوی تێدایە یان نا، دەشی زانی داخوا بە چەند مەتر ئاوەکەی سەردەکەوی.

ئنجا نیشانی دێو و عیفریت و شەیاتینیانی دەدا خێرا و هەڵیان دەکەند و ئاویان حازر دەکرد. حەزرەتی سولەیمان فەمووی: کوا هودهود بانگی کەن، گەڕان دیار نەبو، فەرمووی: بۆ هودهود نابێنم یا دەمێکە وونە؛

﴿لَأُعَذِّبَنَّهُ عَذٰاباً شَدِيداً اَوْ لَاَذْبَحَنَّهُ اَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطٰانٍ مُبِينٍ﴾.(٢)

ڕەقی هەستا فەرمووی: با بێتەوە یان توکی پێوە ناهێڵم، یان دەی‌خەمە قەفەسەوە، یان سەری دەبڕم، یان دەبێ هۆی وون بونەکەی بڵێ و دەلیلی بە قووەت بێنێتەوە.

﴿فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقٰالَ اَحَطْتُ بِمٰا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَ جِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾.(٣)

زۆری نەخایاند پەیدا بۆوە، پاڵی لە سەر ئەرزێ دانان و هاتە خزمەت حەزرەتی سولەیمان، حەزرەتی سولەیمان بە تووڕەییەوە فەرمووی: لە کوێ بوی؟ گوتی: قوربان توڕە مەبە کە جەنابت فەرمووی: لشکر دابەزی من گوتم با تەماشایەکی وولاتی یەمەن

(١) النمل: ٢٠. (٢) النمل: ٢١. (٣) النمل: ٢٢.

بکەم، چاوم بە باغ و باغاتێک کەوت زۆرم پێ جوان بوو، گوتم وە چاکە هەتا ئەوان بار و بارگە دەخەن بچم بزانم چۆنە، چومە شاری سەبا ئەوەی من دیومە تۆ تا ئێستا نەت دیوە و خەبەرێکی زۆر خۆشم بۆ هێناوی، فەرمووی: بڵێ بزانم ئەو خەبەرە خۆشە چیە؟ گوتی:

﴿اِنّي وَجَدْتُ امْرَاَةً تَمْلِكُهُمْ وَ اُوتِيَتْ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ وَ لَها عَرْشٌ عَظيمٌ﴾.(١)

قوربان چوومە شاری سەبا تەماشام کرد شاری سەبا زۆر خۆشە، ژنێک پاشایانە و زۆر دەوڵەمەندە.

هەرچی نەفس ئارەزوو بکا هەیەتی، بە تایبەتی تەختێکی هەیە تا ئێستا هیچ چاوێک شتی وای نەدیوە و بە زمان تەعریفی ناکرێ و بە قەڵەم نانوسرێ.

﴿وَجَدْتُها وَ قَوْمَها يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِنْ دُونِ اللّٰهِ وَ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطانُ اَعْمالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبيلِ فَهُمْ لا يَهْتَدُونَ﴾.(٢)

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوا ناناسن و ئیمانیان بە خوا نیە، بەڵکو ڕۆژپەرستن و شەیتان پەرستن و کردەوەی ناشیرینی لە پێش چاو شیرین کردوون و ڕێگای ڕاستی لێ گرتون و نایان هێڵی سوجدە بۆ خوا بەرن.

﴿قالَ سَنَنْظُرُ اَصَدَقْتَ اَمْ كُنْتَ مِنَ الْكاذِبينَ﴾.(٣)

حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: زۆر باشە با بزانین ڕاست دەکەی یان درۆ.

﴿اِذْهَبْ بِكِتابي هٰذا فَاَلْقِهْ اِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانْظُرْ ماذا يَرْجِعُونَ﴾.(٤)

جا بۆ ئەوەی ڕاستی قسەی هودهود دەرکەوێ نامەیەکی نووسی و دای بە هودهود و فەرمووی: ئەو نامە بەرە و بڕۆ هەر جۆرێک بێ وابکە بگاتە دەست ئەو ئافرەتە و لە پاشان خۆت مات کە و گوێ بگرە بزانە جوابی نامەکە چۆن دەدەنەوە؟

هودهود نامەی حەزرەتی سولەیمانی بە دەندوکەوە گرت و بەرە و شاری سەبا هەڵفڕی، ڕۆیی تا چۆ کۆشکی مەلەکەی شاری سەبا کە ئافرەتێک بوو ناوی بەڵقیس بوو.

هودهود کە لە کورەخانە و ڕۆژنەڕا ڕوانی، ئەوا بەڵقیس لە سەر گیزی پشت ڕاکشاوە، لە کونە ڕۆژنەڕا نامەکەی بەردایەوە سەر سنگی، لە خەو ڕاپەری تەماشای کرد نامەیەک لە

(١) النمل: ٢٣. (٢) النمل: ٢٤. (٣) النمل: ٢٧.
(٤) النمل: ٢٨.

غەیبەوە بەر بۆوە سەر سنگی زۆری لا سەیر بوو، کە خوێندی‌یەوە ئەوەندەی دی سەرسام بوو، هەستا چۆ بارەگا و کۆشکی پاشایەتی وەزیر و وزەرا و سەرلشکر و پیاو ماقوڵی بانگ کردن.

﴿قٰالَتْ يٰا اَيُّهَا الْملَؤُا اِنِي اُلْقِيَ اِلَيَّ كِتٰابٌ كَرِيمٌ﴾.(١)

گوتی: ئەی سەرداران و پیاو ماقوڵان نامەیەکی زۆر جوانم بۆ هاتووە ئەو نامەیە لە لایەن سولەیمان پاشاوە هاتووە لە ئەوەڵی نامەکەدا نووسراوە.

﴿اِنَّهُ مِنْ سُلَيْمٰانَ وَ اِنَّهُ بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾.(٢)

بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان و بگا بە دەست مەلەکەی سەبا.

﴿اَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسلِمِينَ﴾.(٣)

ئنجا نوسراوە کە خۆتان بە زل نەگرن و تەکەبورتان نەبێ و بێن ئیمان بە خوا بێنن و موسوڵمان بن و دەست لە ڕۆژپەرستی هەڵگرن.

﴿قٰالَتْ يٰا اَيُّهَا الْمَلَؤُا اَفْتُونِي فِي اَمْرِي مٰا كُنْتُ قٰاطِعَةً اَمْراً حَتّٰى تَشْهَدُونِ﴾.(٤)

ئنجا کە بەڵقیس کە نامەکەی خوێندەوە ڕووی کردە خەڵکەکە وگوتی: ئەی سەرلشکر و سەرداران جوابم بدەنەوە چۆن جوابی ئەو نامە بدەینەوە؛ من بێ پرسی ئێوە هیچ کارێک ناکەم.

﴿قٰالُوا نَحْنُ اُولُوا قُوَّةٍ وَ اُولُوا بَأْسٍ شَدِيدٍ وَالْاَمْرُ اِلَيْكِ فَانْظُرِي مٰاذٰا تَأْمُرِينَ﴾.(٥)

گوتیان: ئەی مەلەکە ئێمە لە ماڵ و سەروەت و دارایی و سەربازدا زۆر بە قوەتین و ئەسبابی شەڕمان تەواوە. ئنجا ئەمر ئەمری تۆیە چی بڵێی لە قسەت دەرناچین کەیفی خۆتە، شەڕ دەکەی، ڕێک دەکەوی لە گەلی. جا با لێرەدا خوا حافیزی لە حەزرەتی سولەیمان بکەین و تا سبەینێ ئەوکاتە هەموو لایەک بە خوا بسپێرین.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(١) النمل: ٢٩. (٢) النمل: ٣٠. (٣) النمل: ٣١.
(٤) النمل: ٣٢. (٥) النمل: ٣٣.

# ٢

# حەزرەتی سولەیمان

## باسی «حەزرەتی سولەیمان» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحينَ.

با بچینەوە خزمەت حەزرەتی سولەیمان و بزانین بەڵقیسای مەلەکەی سەبا و وەزیر و پیاو ماقوڵەکانی چیان لە جوابی نامەی حەزرەتی سولەیماندا نوسی‌یەوە و دوایی چی رووی دا و چۆن وەفاتی کرد؟

﴿قٰالَت اِنَّ الْمُلُوكَ اِذٰا دَخَلُوا قَرْيَةً اَفْسَدُوهٰا وَ جَعَلُوا اَعِزَّةَ اَهْلِهٰا اَذِلَّةً وَ كَذٰلِكَ يَفْعَلُونَ﴾.(١)

بەڵقیسا زانی کە خەڵکەکە دەیان هەوێ شەڕ بکەن، بەڵام ئەو زۆر عاقڵ بوو لە دڵی خۆیدا گوتی: جا خۆ سولەیمان داوای شتی خەراپی نەکردوە، دەڵێ لە باتی ڕۆژ خوا بپەرستن، ویستی بە بەڵگە پێیان بسەلمێنێ کە شەڕ کردن زۆر خەراپە. ڕووی کردە

---

(١) النمل: ٣٤.

خەڵکەکە و گوتی: ئاخر خەڵکینە عادەتی پاشایان وایە شەڕ لەگەڵ هەر کەس و هەر وولاتێکدا بکەن و بیگرن ئەو وولاتە وێران دەکەن و پیاو ماقووڵ و گەورەکانیان بێ حورمەت دەکەن. جا ئەگەر شەڕ بکەین و سولەیمانیش زاڵ بێ بە سەرماندا وولاتەکەمان کاول دەکا و خۆشمان بێ حورمەت دەکا.

﴿وَ اِنّي مُرْسِلَةٌ اِلَيْهِمْ بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ﴾.(١)

گوتی: جارێ من شەڕم پێ باش نیە دیاری‌یەکی گەورەیان بۆ دەنێرم بزانم پیاوەکانم کە گەڕانەوە چ دەگێڕنەوە؟ گوتی: ئەگەر سولەیمان پاشا بێ ئەوە بە دیاری‌یەکە زۆر دڵ خۆش دەبێ و بێ دەنگ دەبێ، بەڵام ئەگەر پێغەمبەر بێ ئەوە گوێ ناداتە دیاری و دەستمان لێ هەڵ ناگرێ تا ئیمانی پێ نەهێنین.

هات مەنزەری کوڕی عەمر کە پیاوێکی عاقڵ و بە ناوبانگ بوو لە یەمەندا لەگەڵ چەند کەسی دیدا بە نوێنەری ئامادەی کردن کە بیان نێرێ بۆ لای حەزرەتی سولەیمان، هێنای چل کوڕ و کچ کە هەموویان یەک تەمەنیان هەبوو یەک جۆرە لیباسی لە بەر کردن، پێنسەد خشتی زێڕ و پێنسەدی زیوی لەگەڵ چەند دووڕو وگەوهەر و لەعل و مەرجاندا بار کرد، دوڕێکی کون نەکراوی لەگەڵ یاقوتێکی کون کراوی خوار و خێچ خستە ناو صندوقێکەوە قفڵی دا و سەری مۆر کرد. نامەیەکیشی نوسی و لە نامەکەدا نوسی ئەی سولەیمان ئەگەر زانیت لەو هەشتا کەسە چەندیان کوڕن و چەندیان کچن و پێش ئەوەی ئەو سندوقە هەڵپچڕی زانیت چی تێدایە و ئەوەی کون نەکراوە کونی بکەیت و ئەوەی کون کراوە هەودایەکی تێ ڕاکەی ئەوە دەزانم پێغەمبەری و ئیمانت پێ دێنین، دەنا هەرچی لە دەستت دێ خۆت موختار بە.

بە مەنزەریشی گوت: ئەگەر گەیشتی‌یە لای سولەیمان و توڕە بوو هیچ لێی مەترسە ئەوە پاشایە، ئەگەر ڕوو خۆشیش بوو ئەوە بزانە پێغەمبەرە و گوێی بۆ ڕاگرە. قافڵەکەی نوێنەرەکانی بەڵقیس کەوتە ڕێ و هودهود هەڵفڕی و هاتەوە تەواوی گفتوگۆی بەڵقیسی بۆ حەزرەتی سولەیمان گێرایەوە.

---

(١) النمل: ٣٥.

حەزرەتی سولەیمان کە ئەوەی زانی تەواوی ئەجیننە و بنیادەم و شەیاتینی بانگ کردن وگوتی: دەم هەویَ بارەگایەکم بۆ دروست بکەن هەر خشتیَکی لە زێڕی بیَ و خشتیَکی لە زیوی. مەیدانیَکیش پڕ فەرش بکەن بە خشتی زێو. ئەجیننە و شەیاتینی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا تەواویان کرد فەرمووی: تەواوی ئەجیننە و ئینسان و شەیاتینی و حەیوانات بە سەف ڕاوەستن. فەرمووی: چ حەیواناتیَک هەیە زۆر عەجایب بیَ؟ گوتیان: حەیوانیَک و گیان لەبەرێک لە فلاَن بەحرەدا هەیە زۆر عەجایبە. ئەمری کرد شەیاتینی چون هیَنایان فەرمووی: لە دەورەی شورەی مەیدانەکە زنجیریان بکەن، ئنجا خۆی چوو لە سەر تەختی سەڵتەنەت دانیشت و باڵندان سیَبەریان لە سەر سەری کرد.

کاتیَک پیاوەکانی بەڵقیسا نزیک بونەوە و چاویان بەو دەزگایەکەوت سەرسام بوون و زۆر ترسان.

بە ڕیوایەتیَک دەڵیَن بارە دیارییەکەیان لەویَ هەڵەڕشتن و گوتیان: مەبادا بڵیَن دزیوتانن. گەورەی شەیاتینیەکان زانی کە دەترسن خەریکن وەگەڕیَن، چۆ پیَشەوە و گوتی: مەترسن وەرن بڕۆن بۆ خزمەت حەزرەتی سولەیمان. چوونە خزمەتی و سەلامیان کرد، حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: چۆنە هاتوون؟ مەنزەر چۆنیەتی هاتنەکەی بۆ گیرایەوە و کاغەزەکەی مەلەکەی سەبای دایە. کە کاغەزەکەی خویَندەوە فەرمووی: کوا سندوقەکە؟ چون هیَنایان. لەو کاتەدا حەزرەتی جوبرەئیل بە فەرمانی خوا هات و گوتی: فلاَن شت و فلاَن شتی تیدایە، گوتیان: ڕاست دەکەی، بەلاَم گەوهەرەکە کون بکەی بە بیَ ئەوەی دەستی بنیادەمانی تیدا بیَ و بە ئاسن و ئەڵماسیش کون نەکریَ! دەبیَ دەزویەکیش لە لەعلە کون کراوەکە ڕاکەی. دەبیَ بزانی لەو هەشتا نەفەرەش کامیان کوڕە و کامیان کچە! بانگی مۆرانەیان کرد تا دەڵیَی یەک و دوو گەوهەرەکەی سمی. کرمیَکی سپی شیان بانگ کرد تاڵە دەزوویەکی بە دەمەوە گرت و لەم سەر خۆی بە کونی لەعلەکەدا کرد و لەو سەر هاتەدەریَ. ئەمریشی کرد تەشتیَکی زۆر گەورەیان هیَنا و پڕیان کرد لە ئاو و فەرمووی: ئەو هەشتا کەسە یەک یەک هاتن دەم و چاویان لە ئاوی تەشتەکەدا شت. هەرچی کوڕ بوو بە هەردوو دەستان ئاوەکەی هەڵدەگرت و بە چاوانیەوە دەدا، بەلاَم ئەوەی کچ بوو بە

دەستێک ئاوەکەی هەڵ دێنجا و بە دەم و چاوی هەڵ دەپرژاندو بەو هۆیەوە ئەوانیشی لێک جیا کردەوە.

﴿فَلَمّٰا جٰاءَ سُلَيْمٰانَ قٰالَ اَتُمِدُّونَنِ بِمٰالٍ فَمٰا آتٰانِيَ اللّٰهُ خَيْرٌ مِمّٰا آتٰاكُمْ بَلْ اَنْتُمْ بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴾.(١)

ئنجا حەزرەتی سولەیمان رووی کردە پیاوەکانی بەڵقیسا و فەرمووی: ئێوە دیاری بۆ من دێنن؟ من زۆر دەوڵەمەندم، ئەوەی خوا داویەتی بە من زۆر زۆرتر و باشترە لە ئی ئێوە، من پێغەمبەرم و پاشای ئەجیننە و ئینسان و شەیاتینی و حەیوانات و باڵندە و بام لە ژێر فەرمان دایە. ئێوە بە ماڵی دنیا دڵخۆشن لای من هیچ نیە.

﴿اِرْجِعْ اِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُمْ بِجُنُودٍ لٰا قِبَلَ لَهُمْ بِهٰا وَ لَنُخْرِجَنَّهُمْ مِنْهٰا اَذِلَّةً وَ هُمْ صٰاغِرُونَ﴾.(٢)

ڕووی کردە گەورە پیاوەکانی بەڵقیس و گوتی: بچۆوە بۆ لای مەلەکە و سەردارەکان و دیاریەکەیان بۆ بەرەوە و چیت چاو پێ کەوتووە بۆیان وەگێڕە و پێیان بڵێ: سولەیمان دەیگوت: ئەگەر بە خۆشی دێن و موسوڵمان دەبن ئەوە باشە. دەنا سوێند بە خوا لشکریکی وایان سەر دەگێڕم عەرز هەڵی نەگری و خۆی بۆ ڕانەگرن. ئەوکاتە لە شاری سەبا و وولاتی یەمەنیشیان دەر دەکەم و ئەسیریان دەکەم، پیاوەکانی بەڵقیس گەڕانەوە چیان دی‌بوو چیان چاو پێ کەوتبو چی‌یان لە حەزرەتی سولەیمان بیستبو هەمویان بۆ گێڕانەوە بەڵقیس بە تەواوی بۆی مەعلووم بوو کە حەزرەتی سولەیمان هەر پاشا نیە و پێغەمبەریشە، ڕووی کردە سەرداران و پیاو ماقووڵان و گوتی: هیچ چارمان نیە دەبێ بە قسەی بکەین، ئنجا خۆیی و چەند سەرلشکر و پیاو ماقووڵ و دەست و پێوەندی لەگەڵ خۆی بردن و بەرەو فەلەستین کەوتنە ڕێ.

حەزرەتی سولەیمان کە هەواڵی هاتنی ئەوانی زانی بۆ ئەوەی موعجیزەی گەورە و دەسەڵاتی خۆی نیشانی بەڵقیسا بدا ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی:

﴿قٰالَ يٰا اَيُّهَا الْمَلَأُ اَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهٰا قَبْلَ اَنْ يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ﴾.(٣)

---

(١) النمل: ٣٦. (٢) النمل: ٣٧. (٣) النمل: ٣٨.

ئەی کومەڵی دانیشتوان کێ دەتوانی تەختی بەڵقیسم بۆ بێنی لە پێش ئەوەی‌دا بگاتە لای من و موسوڵمان ببێ؟

﴿قَالَ عِفْرِيتٌ مِنَ الْجِنِّ اَنَاْ آتِيكَ بِهِ قَبْلَ اَنْ تَقُومَ مِنْ مَقَامِكَ وَ اِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ اَمِينٌ﴾.(١)

عیفریتێک لە ئەجینەکان ڕاست بۆو و گوتی: من دەچم بۆت دێنم لە پێش ئەوەی لە جێگای خۆت هەڵستی، زۆریش بە تاقەتم دەتوانم بە تەنێ هەڵی‌گرم و خەیانەتی‌شی لێ ناکەم.

﴿قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الْكِتَابِ اَنَاْ آتِيكَ بِهِ قَبْلَ اَنْ يَرْتَدَّ اِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾.(٢)

یەکی دی لەوانەی عیلمی غەیبی و ئیسمی ئەعزەمیان دەزانی کە زوربەی زانایان دەڵێن ئاسەفی وەزیر بووە، گوتی: بۆت دێنم لە پێش ئەوەی‌دا تەماشای شتێک بکەی و چاو لە سەرێک نێیەوە.

﴿فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرّاً عِنْدَهُ قَالَ هٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي اَاَشْكُرُ اَمْ اَكْفُرُ﴾.(٣)

حەزرەتی سولەیمان کە چاوی بە تەختی بەڵقیس کەوت لەو دوورەڕا، لەو ماوەکەمەدا لە لای دانراوە زۆر دڵخۆش بوو و گوتی: ئەوە لە گەورەیی خواوەیە و بۆ تاقی کردنەوەی منە، داخوا شوکرانەی نیعمەتی خوا دەکەم یان نا؟ فەرمووی: خوایە زۆر شاکیرم، کەسێک شوکرانەی نیعمەتی تۆ بکا بۆ خۆی قازانجە و ئەوەی نەی‌کا خۆی زەرد دەکا.

﴿قَالَ نَكِّرُوا لَهَا عَرْشَهَا نَنْظُرْ اَتَهْتَدِي اَمْ تَكُونُ مِنَ الَّذِينَ لاٰ يَهْتَدُونَ﴾.(٤)

ڕاوی دەڵێ ئەجینیان زۆریان پێ ناخۆش بوو بەڵقیسا موسوڵمان ببێ و ببێتە ژنی حەزرەتی سولەیمان، زۆریان غەیبەتی بەڵقیس کردبوو. دەیان گوت: زۆر بێ عەقڵە و زۆر توکاوی‌یە و مووی زۆرن. جا بۆ تاقی کردنەوەی، حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: تەختەکەی لێ بگۆڕن و گەوهەرەکانی بە پێچەوانە لێ‌نێنەوە و سەرە و بنی کەن بزانین دەی‌ناسیتەوە؟

﴿فَلَمَّا جَاءَتْ قِيلَ اَهٰكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ كَاَنَّهُ هُوَ وَ اُوتِينَا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِهَا وَ كُنَّا مُسْلِمِينَ﴾.(٥)

---

(١) النمل: ٣٩. (٢) و (٣) النمل: ٤٠. (٤) النمل: ٤١.
(٥) النمل: ٤٢.

کاتێک گەیشتە خزمەت حەزرەتی سولەیمان بەخێر هاتنیان کرد، گوتیان: ئەرێ ئەوە تەختەکەی تۆ نیە؟ تەماشای کرد و تۆزێک ڕاما و زانی کە ئەوە، بەڵام گوتی: دەڵێی هەوە! ئەی حەزرەتی سولەیمان لە پێش ئەو موعجیزەش زانیومە خواگەورەیە و تۆ پێغەمبەری و موسوڵمان بووم. هەروەها دەڵێن حەزرەتی سولەیمان بۆ ئەوەی بزانێ داخوا ئەجینە ڕاست دەکەن کە دەڵێن بەدەنی بەڵقیسا تووکنە ئەمری کردبوو خانوێکی زۆر بێ وێنەیان بۆ دروست کرد، تەواوی حەوشەکەیان بە شوشەی سپی دانا بوو، لە بنەوەش بە ئەندازەی مەترێک ئاوی تێدا بوو، پڕ بوو لە ماسی، بۆ خۆی ڕۆژێک چوو لە سەرەوەی حەوشەکە کورسی دانا و لە سەری دانیشت، فەرمووی بەڵقیسم بۆ بانگ کەن. کە مەلەکە بەڵقیس هات گوتیان:

﴿قِيْلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ﴾.(١)

فەرموو بچۆرە ژوورەوە.

﴿فَلَمَّا رَاَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَ كَشَفَتْ عَنْ سَاقَيْهَا﴾.(٢)

کە لە دەروازە چۆ ژوورەوە وای زانی حەوشەکە پڕە لە ئاو، دەلینگی هەڵکردن و بەلەکی دەرکەوتن.

﴿قَالَ اِنَّهُ صَرْحٌ مُمَرَّدٌ مِنْ قَوَارِيرَ﴾.(٣)

حەزرەتی سولەیمان بە ئاوات گەیشت و گوتی: ئەوە ئاو نیە مەترسە وەرە ژوورەوە ئەوە شوشەی سپی یە. بەڵقیسا چوو لە لای حەزرەتی سولەیمان دانیشتو و؛

﴿قَالَتْ رَبِّ اِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَ اَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ﴾.(٤)

بەڵقیسا کە ئەو موعجیزە گەورانەی دی و چاوی بەو هەموو سەروەت و ماڵە و گەورەیی یە کەوت و ئەو حورمەتەی دی گوتی: ئەی خوای گەورە من تا ئێستا زوڵمم لە نەفسی خۆم کردوە کە تۆم نەپەرستووە ئەوا ئیمانم پێ هێنای و چوومە سەر دینی حەزرەتی سولەیمان بە ئاشکرایی.

ئنجا حەزرەتی سولەیمان بەڵقیسی مارەکرد و لە پاش ماوەیەک ناردی‌یەوە بۆ یەمەن و

(١) و (٢) و (٣) و (٤) النمل: ٤٤.

زوو زوو سەری دەدا، دەڵێن: هەوەڵ حەمامێک لە سەر دونیا دروست کرا ئەو حەمامە بوو کە حەزرەتی سولەیمان بۆ بەڵقیسی دروست کرد.

﴿وَ لَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمٰانَ وَ اَلْقَيْنٰا عَلىٰ كُرْسِيِّهِ جَسَداً ثُمَّ اَنٰابَ﴾.(١)

زانایان لە سەر ئەو ئایاتە زۆریان قسە کردوە، هێندێک گوتویانە: ئەو فیتنەیە نەخۆشی بوو تووشی بوو. بەعزێک دەڵێن چۆ لای چەند ژنی و گوتی: هەموانیان کوڕیان دەبێ و لە گەڵم سوارد دەبن نەیگوت: ئینشاالله. ئاخری کوڕیکی سەقەتی بوو، بە ڕیوایەتێک و بە حەدیسێک دەڵێن: حەزرەتی سولەیمان چوو شاری سەیدونی لە جەزائر گرت و کچی پاشای ئەسیر کرد و مارەی کرد، زۆری خۆش دەویست. بەڵام کچەکە زۆری پەرۆشی باوکی بوو، شەو و ڕۆژ هەر دەگریا.

حەزرەتی سولەیمان زۆری خۆش دەویست ڕۆژێک پرسیاری لێ کرد کە بۆ ئەوەندە دەگری؟ گوتی: بۆ باوکم دەگریم، ئەگەر وێنەیەکی باوکم دروست بکەی و چاوم لێ بێ سێبوریم پێ دی.

ئەمری کرد شەیاتینیان وێنەیەکی باوکیان بۆ دروست کرد. ئێوارە و بەیانیان کچەکە لەگەڵ قەرەواشەکانی سوجدەیان بۆ دەبرد.

تا چل شەو و ڕۆژ. ڕۆژێک ئاسەفی وەزیر بەو خەبەرەی زانی عەرزی حەزرەتی سولەیمانی کرد قوربان ئەگەر ئیجازە بفەرمووی ئامۆژگاری‌یەکی ئەو خەڵکە بکەم خۆم تەقاعود دەکەم، حەزرەتی سولەیمان ئەمری کرد خەڵکەکە هەمووی کۆ بۆوە، ئاسەفی وەزیر ڕووی کردە خەڵکەکە و حەمد و سەنای خوای کرد و باسی هەموو پێغەمبەرانی کرد و هاتە سەر باسی حەزرەتی سولەیمان و گوتی: بەڵام حەزرەتی سولەیمان تا ئێستا زۆر باش بوو، حەزرەتی سولەیمان زۆری پێ ناخۆش بوو کە گوتی تا ئێستا. بانگی کرد و گوتی: بۆچی گوتت تا ئێستا بۆ ئێستا خەراپم؟ گوتی: بەڵێ مەگەر جەنابت نازانی ئەوە چل ڕۆژە لەماڵی تۆدا بتپەرستی دەکرێ!؟ حەزرەتی سولەیمان چو وێنەی خێزانەکەی شکاند و بەو هۆیەوە تووشی ئەو بەسەرهاتە بوو کە ئێستا بۆتان دەگێڕمەوە.

---

(١) ص: ٣٤.

سەڵتەنەتی حەزرەتی سولەیمان بە هۆی ئەنگوستیلەکەیەوە بوو، عادەتی وا بوو کە دەچۆ حەمام دەی‌دا بە ئەمینە ناوێک تا لە حەمام دەهاتەوە. ڕۆژێک سەخری جینی خۆی بردە سەر شکڵی حەزرەتی سولەیمان و چوو ئەنگوستیلەکەی لە ئەمینە وەرگرت و لە سەر تەختی حەزرەتی سولەیمان دانیشتو و دەستی کرد بە حوکمات. حەزرەتی سولەیمانیش کە هاتە دەرێ و زانی سەخری جینی ئەو کارەی کردووە و تازە خەڵک باوەڕی پێ ناکا ناچار بوو شاری بە جێ هێشتو و چۆ لە لای کابرایەکی ماسی‌گر دامەزرا. ڕۆژی بە دوو ماسی.ئێوارە یەکی دەفرۆشت و یەکیشی دەبرژاند.

ڕۆژێک ئاسەفی وەزیر خەڵکەکەی کۆ کردەوە و گوتی: ئێوە دەزانن ڕەنگ و ڕوخسار و حوکمی سولەیمان گۆڕاوە؟ لام وایە ئەوە حەزرەتی سولەیمان نیە! خەڵکەکە گوتیان: ڕاست دەکەی بە کۆمەڵ هەستان چوون بۆ بارەگای حەزرەتی سولەیمان.

سەخری جینی کە چاوی بە خەڵکەکە کەوت زۆر ترسا لە ترسان ڕای کرد و لە سەر بەحر ئەنگوستیلەکەی لێ بەر بۆوە و ماسی‌یەک قوتی دا. حەزرەتی سولەیمان کە دوو ماسی‌یەکەی وەرگرتن یەکیانی فرۆشت و ئەوی دی هەڵدڕی، تەماشای کرد ئەنگوستیلەکەی لە ناو سگی ماسی‌یەکەدایە،کردی‌یەوە دەستی بۆوە بە پاشا و حەزرەتی سولەیمانی جاران. ئنجا تۆبە و ئیستیغفاریکی زۆر بە دڵی کرد و هاتەوە سەر تەختی سەڵتەنەت.

جا لە پاش ئەوە بوو دەستی کرد بە دروست کردنی مزگەوتی «بیت المقدس» و ئەجیننەی دنیا لە دروست کردنی مزگەوتی «بیت المقدس»دا کاریان دەکرد و لای بنیادەمیان دەیان گوت: ئێمە عیلمی غەیبمان هەیە! تا حەزرەتی سولەیمان وەفاتی کرد.

﴿فَلَمّا قَضَيْنا عَلَيْهِ الْمَوْتَ ما دَلَّهُمْ عَلىٰ مَوْتِهِ إِلّا دابَّةُ الْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنْسَأَتَهُ فَلَمّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ الْجِنُّ أَنْ لَوْ كانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ ما لَبِثُوا فِي الْعَذابِ الْمُهِينِ﴾.(١)

ئنجا چۆنیەتی وەفاتی حەزرەتی سولەیمان بە تەواوی ڕووناک نیە و لە تەفسیری ئەو ئایەتەشدا زانایان چەند بیر و ڕایان هەیە. کۆمەڵێک دەڵێن وەفاتی کرد و نێژرا و ئەجیننە تا

---

(١) سبأ: ١٤.

مزگەوتی «بیت المقدس»یان تەواو کرد نەیانزانی! هێندێک دەڵێن حەزرەتی سولەیمان وەک عادەتی جارانی چوو بۆ میحرابەکەی بۆ عیبادەت. گەیشتە ژوری مزگەوتەکەی حەزرەتی ئیزرائیل سەلامی لێ کرد و لە پاش جوابی سەلامەکەی حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: بۆ مولاقات هاتووی یان بۆ گیان کێشان؟ گوتی: بۆ گیان کێشان!

فەرمووی: مۆڵەتم بدە قومیک ئاو وەخۆم. گوتی: ئیجازە نیە. حەزرەتی سولەیمان خۆی هاویشتە سەر عەساکەی و گیانی کێشا! تا پاش ساڵێک مۆرانە عەساکەی نەخوارد نەیانزانی کە وەفاتی کردووە.

جا ئەوەیە کە خوای گەورە لەو ئایەتەدا دەفەرمووێ: کاتێک ئەجەل بوو بە میوانی حەزرەتی سولەیمان، وەفاتی کرد نەیانزانی تا مۆرانە عەساکەی نەخوارد و بەلادا نەهات، جا ئەو کاتە ئەجینان بۆیان ئاشکرا بوو ئەگەر عیلمی غەیبیان بزانیایە ئەو ساڵە لە عەزابی کار کردندا نەدەمانەوە.

حەزرەتی سولەیمان لە تەمەنی پەنجا و سێ ساڵیدا وەفاتی کرد و لە فەلەستین، واتە لە «بیت المقدس»دا نێژرا.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# حەزرەتی ئیلیاس و ئیلیەسەع

## باسی «ئیلیاس و ئیلیەسەع» سەلامی خودایان لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

موسوڵمانینە هەر چەند حەزرەتی هارۆن و حەزرەتی زیلکەفل لە قورئاندا بە پێغەمبەر ناو براون، بەڵام لە بەر ئەوەی قورئان زۆر بە کورتی باسی کردوون ئێمە ناتوانین بە درێژی باسیان بکەین. جا با بچینە سەر باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی ئیلیاس و حەزرەتی ئیلیەسەع و بە گوێرەی خۆیان پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین. خـواوەنـدی گـەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەی «الصافات»دا فەرموویەتی: ﴿وَاِنَّ اِلْيٰاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾.(١) واتە بە ڕاستی ئیلیاس یـەکـێک بـوو لە پـێغـەمبەران و لە ئـەولادی حـەزرەتی هـارۆنـی پێغەمبەر، برای حەزرەتی ئیبراهیمی خلیل‌الله.(٢) خواوەندی گەورە کردی بە پێغەمبەر و

---

(١) الصّافّات: ١٢٣.

(٢) دوو هارون بوون یەکیان برای حەزرەتی ئیبراهیم و ئەوی‌تر برای حەزرەتی مووسایە.

ڕوانەی کرد بۆ سەر خەڵکی شاری بەعلەبەک کە لەو کاتەدا بوتێکیان دەپەرست بە ناوی بەعل و لەو کاتەوە بەو شارە دەڵێن: شاری بەعلەبەک.

﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَلَا تَتَّقُونَ﴾.(١)

خوای گەورە لە قورئاندا بە پێغەمبەر دەفەرمووێ: ئەی محمد تۆ یادی حەزرەتی ئیلیاس بکەوە کە ڕووی کردە قەومەکەی و گوتی: بۆ لە خوا ناترسن و تەقوای خوا ناکەن؟ نازانن کە خوا غەزەبی زورە!

﴿أَتَدْعُونَ بَعْلاً وَ تَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ﴾.(٢)

فەرمووی: بۆ هاواری ئەو بتە دەکەن کە ناوتان ناوە بەعل و دەیپەرستن؟ بۆ عیبادەت بۆ ئەو خوایە ناکەن کە عالەمی لە سەر جوانترین یاسا و نیزام دروست کردووە؟

﴿اللَّهَ رَبَّكُمْ وَ رَبَّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ﴾.(٣)

ئەو خوایە شایانی عیبادەت و پەرستشە کە خوای ئێوە و باب و باپیرانتانیشە.

﴿فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾.(٤) ﴿إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾.(٥)

بەڵام خەڵکەکە زۆر لە خۆیان بایی ببون، بە ماڵی دنیا زۆر مەغرور ببوون، خوایان نەدەناسی، لە باتی باوەڕ پێ کردن حەزرەتی ئیلیاس‌یان بە درۆ دەخستەوە، بەو هۆیەوە دەچنە جەهەننەم، ئەوانەیان نەبێ کە بە ڕاستی ئیمانیان هێنا بو و عەبدی خوا بوون.

ڕاوی دەڵێ: کە حەزرەتی ئیلیاس دەستی کرد بە بانگ کردنی خەڵکی شاری بەعلەبەک بۆ خوا پەرستی لەو کاتەدا پاشایەکیان هەبوو بە ناوی لاجب ئیمانی بە حەزرەتی ئیلیاس هێنا. پاشا زۆر خاوەن دەسەڵات بوو، ژنێکی هەبوو زۆر لە خۆی بە دەسەڵاتتر بوو، پاشا زۆری لێ دەترسا. هەر کاتێک پاشا بچوبایە بۆ سەفەرێک ژنەکەی دەبوو بە جێ‌نشینی، ژنی پاشا کاتبی هەبوو بە دزی ئیمانی بە حەزرەتی ئیلیاس هێنابوو، ئەو کاتبە باغێکی زۆر جوان و دڵگیر و خۆشی بوو، لە تەنیشت کۆشکی پاشاوە بوو، ژنی پاشا زۆر دڵی چوبۆ سەر باغەکە. زۆر لەگەڵ کاتبەکەی خەریک بوو و پێی نەفرۆشتن، ژنی پاشا غەرەزی لێ هەڵگرتو و چاوەڕوانی هەل و فرسەتێکی دەکرد وەک مار بە کاتبەکەیەوە

---

(١) الصّافّات: ١٢٤. (٢) الصّافّات: ١٢٥. (٣) الصّافّات: ١٢٦.
(٤) الصّافّات: ١٢٧. (٥) الصّافّات: ١٢٨.

بدا، پاشا چۆ سەفەر و ژنی پاشا شاهیدی بە درۆی ئامادە کرد و لای بەرێوەبەری دادگا شاهیدی‌یان دا کە کاتب جنێوی بە پاشا داون.

یاسا و قانوونی ئەو کاتەش وا بوو کە هەر کەسێک جنێو بە پاشا بدا دەبێ بکوژرێ. نووسەریان کوشت و ژنی پاشا باغەکەی داگیر کرد.

پاشا لە سەفەر گەڕایەوە شاژن کارەساتی بۆ گێڕایەوە. پاشا زۆری پێ ناخۆش بوو، زۆر بەسەر شاژندا هات و خۆی لێ تووڕە کرد و گوتی: تازە ئێمە خۆشی لە خۆمان نابینین، شاژن گوتی: لە بەر خاتری تۆم کوشت، چونکە جنێوی بە تۆدا؛ تازە لە سەری مەڕۆ ئەوەی کرا کرا.

خواوەندی گەورە وەحی کرد بۆ لای حەزرەتی ئیلیاس و فەرمووی: بچۆ با پاشا بڵێ: ئەگەر تۆبە نەکەن و باغەکە نەدەنەوە بە واریس و میراتگری نووسەرەکە، خوا غەزەبتان لێ دەگرێ و لە ناو باغەکەدا بە ناشیرینی دەمرن.

حەزرەتی ئیلیاس ئەو وەحی‌یەی بە پاشا ڕاگەیاند. پاشا زۆر تیک چوو، زۆر توڕە بوو، خۆی کافر کردەوە و گوتی: ئەی ئیلیاس دیارە هەرچی دەڵێی درۆ دەکەی! خوا چۆن غەزەب لە ئێمە دەگرێ. فڵان پاشا و فڵان مەلیک هەر بت‌پەرست بوون هیچیشیان بەسەر نەهات و خوا غەزەبی لێ نەگرتن.

ئاخری پاشا خەریک بوو حەزرەتی ئیلیاس بکوژێ. حەزرەتی ئیلیاس بە ناچاری لە شار ڕای کرد و چۆ لە شاخ و لە ناو ئەشکەوت حەشاری گرت. تا ماوەی حەوت ساڵ لە گژ و گیا و بەری داران خۆی تێر دەکرد.

کافرەکان شەو و رۆژ هەر لێی دەگەڕان بەڵام خواوەندی گەورە ئاگاداری کرد و پاراستی. لە پاش حەوت ساڵ مانەوە لە کێو وئەشکەوتاندا زۆر مەحزوون بوو، زۆر ناڕەحەت بوو، ڕۆژێک خواوەندی گەورە وەحی کرد و فەرمووی:

یا ئیلیاس ئەوە بۆ ئەوەندە غەمبار و ناڕەحەتی؟ چی داوا دەکەی داوا بکە تا بۆت جێ‌بەجێ بکەم. من خاوەن ڕەحم و کەرەمم.

حەزرەتی ئیلیاس فەرمووی:

ئەی خوای گەورە داوا دەکەم هەر ئێستا گیانم بکێشی و بمرم و بچمە ڕیزی باب و باپیرانم، خوا فەرمووی: یا ئیلیاس ئەو ڕۆ ڕۆژی مردنی تۆ نیە دنیا بە هۆی چەند کەسی وەک تۆوە ڕاوەستاوە، مردن نەبێ چی داوا دەکەی بیکە، حەزرەتی ئیلیاس فەرمووی: داوا دەکەم کە حەوت ساڵان هەور و باران بدەیە دەست من. بە دووعای من نەبێ هەور نەیێتە سەر خاکی بەعلەبەک و بە شەفاعەتی منیش نەبێ باران نەباری، خوا فەرمووی: یا ئیلیاس من زۆر بە ڕەحمم دەرحەق بە گیان لەبەران. حەوت زۆرن، بەڵام ئەوا تا سێ ساڵ هەور و بارانم دایە دەست تۆ. خولاسەی کەلام سێ ساڵ نە هەور هاتە سەر شاری بەعلەبەک نە باران باری، خەڵک تینیان بۆ هات، گرانی و قات و قریان کەوتە ناو، مەڕ و ماڵاتیان قڕی کرد، لە پاش سێ ساڵ ڕۆژێک حەزرەتی ئیلیاس چۆ ماڵی پیرێژنێک و فەرمووی:

هیچ خواردەمەنیت لایە؟ گوتی: بەڵێ هێندێک ئارد و بەعزێکم ڕۆن هەیە. فەرمووی: بیانهێنە پیرێژن هێنانیە پێشەوە و حەزرەتی ئیلیاس دووعای بەسەردا خوێندن و جەواڵەکەی پڕ بوو لە ئارد و دیزەکەی پڕ بوو لە ڕۆن. خەڵک بەو خەبەرەیان زانی و پیرێژن باسی میوانەکە و دووعاکەی بۆ بەیان کردن. خەڵکەکە زانیان کە ئەوە حەزرەتی ئیلیاس بووە.

ڕۆژێکی دی حەزرەتی ئیلیاس چۆ ماڵی ژنێک ژنەکە زۆر بەخێر هاتنی کرد و حەشاریدا. ئەو ژنە کوڕێکی هەبوو نەخۆش و دەردە دار. حەزرەتی ئیلیاس دووعایێکی بەسەردا خوێند فەوری خوا شیفای دا. کوڕەکە ناوی ئیلیەسەع بوو، ئیمانی بە حەزرەتی ئیلیاس هێنا و دوای کەوت.

حەزرەتی ئیلیاس پیر ببوو بەڵام ئیلیەسەع تازە دەگەیشێ و گەنج بوو، خواوەندی گەورە وەحی کرد بۆ لای حەزرەتی ئیلیاس فەرمووی وەختێ کە خۆت ئاشکرا بکەی، حەزرەتی ئیلیاس چو بۆ شاری بەعلەبەک و خەڵکەکەی کۆ کردەوە و گوتی: خەڵکینە، ئەوە چەند ساڵە لە ناڕەحەتی دان؛ خۆتان و ماڵاتان بە هیلاک چوو؛ ئێستاش وەرن با پەیمانێک ببەستین؛ ئێوە هەموو بتەکانتان بێنن و دەچینە ئەو دەشتە، لە بەریان وەپاڕێن. ئەگەر جوابیان دانەوە و بارانیان بۆ باراندن ئەوە باشە. دەنا دیارە لە سەر بەتاڵن. منیش لە بەر خوای خۆم دەپاڕێمەوە، ئەگەر دووعای گیرا کردم و باران باری، ئیمانم پێ بێنن،

گوتیان زۆر باشە! چوونە سەحرا، هەر چەند لە بەر بتەکانیان پاڕانەوە هیچ فائیدەی نەبوو، بەڵام کە حەزرەتی ئیلیاس دوو رکات نویژی کرد و لە بەر خوا پاڕایەوە بە ئەمری خوا هەورێک هات هەموو ئاسمانی داگیر کرد. دەسی کرد بە باران و بەراو و دێمەکاری پاراو کرد و خۆشی و شادی کەوتەوە ناو خەڵک. بەڵام ئەگەرکەسێک خوا ڕێگای لێ گۆڕی بە هیچ ئیمان ناهێنی، ئەوانیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خەراپتر دەبوون. حەزرەتی ئیلیاس کە زانی تازە ئیمانی پێ ناهێنن. دووعای کرد و فەرمووی:

ئەی خوای گەورە لە ناو ئەو میللەتە نەجاتم بدە! خواوەندی گەورە وەحی کرد و فەرمووی: فلان ڕۆژ لە فلان جێگا ڕاوەستە هەرچی هات سواری بەو دەنگە مەکە.

لە کاتی دیاری کراودا چۆ جێگایەکە ئەسپی پەیدا بوو هاتە پێش حەزرەتی ئیلیاس ڕاوەستا.

سوار بوو، ئەسپ بەرەو بیابان کەوتە ڕێ. ئیلیەسەع کە لە خزمەتیدا بوو، هاواری کرد و گوتی: بۆ کوێ دەچی؟ بۆ بە جێم دێڵی؟ حەزرەتی ئیلیاس عەباکەی بۆ هاویشت و گوتی: تۆ خەلیفەی من بە لە سەر بەنی ئیسرائیلیان. لەو کاتەوە تا ئێستا حەزرەتی ئیلیاس بێ سەر و شوێنە.

زۆر لە زانایان دەڵێن: هەر ماوە و تا ڕۆژی قیامەت هەر دەمێنێ، هەموو ساڵێک ڕەمەزان لە «بیت المقدس» دەبێ و هەموو ساڵێک لە حەج لەگەڵ حەزرەتی خدر وێک دەکەون و یەکتر دەبینن، خواوەندی گەورەش دوژمنێکی زۆر بە قووەتی نارده سەر لاجب و قەومەکەی و لە ناو باغە غەسب کراوەکەدا بە خۆی و بە ژنەکەیەوە سەریان بڕین و لە ناو باغەکەدا بۆگەنیان کرد و تۆپین. ئنجا خواوەندی گەورە ئیلیەسەعی کردە پێغەمبەریان و خەڵکەکە ئیمانیان پێ هێنا تا وەفاتی کرد. ئەوە بوو بە کورتی باسی ئەو پێغەمبەرە.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# حەزرەتی زەکەریا

## باسی «حەزرەتی زەکەریا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِیْنَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلِیْنَ وَ عَلیٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِیْنَ.

گوێگرینە با بچینە خزمەت حەزرەتی زەکەریای پێغەمبەر و گوێ ڕاگرین بۆ باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە زوڵم لێ کراوە و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

خواوەندی گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە هەشت ئایەتدا ناوی حەزرەتی زەکەریای بردووە و باسی کردووە. بۆ نموونە لە سورەی «مریم»دا خوا دەفەرموێ:

﴿ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا﴾.(١)

واتە ئەو نوسراوە و ئەو خوێندراوەیە یان ئەو سورەتە باسی ڕەحمەت و بەرەکەتی خوای تۆیە کە دای بە عەبد و بەندەی خۆی حەزرەتی زەکەریا «عَلیٰ نَبِیِّنٰا وَ عَلَیْهِ الصَّلٰاةُ وَالسَّلٰامُ».

---

(١) مریم: ٢.

حەزرەتی زەکەریا پێغەمبەر لە ئەولادی حەزرەتی سولەیمانی کوڕی حەزرەتی داوودە. خواوەندی گەورە کردی بە پێغەمبەر لە سەر بەنی ئیسرائیلیەکان و بە تەوڕات و دین و شەریعەتی حەزرەتی مووسا ئامۆژگاری خەڵکەکەی دەکرد و بانگی دەکردن بۆ خواپەرستی.

بە هۆی دار تاشیشەوە خۆی دەژیاند. خوشکی دایکی حەزرەتی مەریەمە ناوی ئیساع بوو ژنی بوو، کە دەبێتە پوری حەزرەتی مەریەمی دایکی حەزرەتی عیسا دروودی خوای لە سەر بێ.

تا حەزرەتی زەکەریا عومری گەیشتە نزیکەی نەوەد ساڵ نە ئەو لە ئیساع ئەولادی بوو، نە عیمران لە حنەی خوشکی ئیساع کوڕی بوو. ڕۆژی یەک دوو ساعەت دەچۆ دوکانەکەی و دارتاشی دەکرد و باقیەکەی دەچۆ مزگەوتی «بیت المقدس» خزمەتی هەیکەلی دەکرد و عیبادەتی خوای دەکرد و شەو درەنگانێ دەچۆوە ماڵەوە لای خێزانەکەی. تا حەزرەتی مەریەم حامیلە بوو بە حەزرەتی عیسا و حەزرەتی زەکەریا بوو بە کەفیلی، وەکو لە باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی عیسادا ئینشاالله بە تەواوی باسی دەکەین.

ڕۆژێک کە حەزرەتی زەکەریا چۆ بۆ لای حەزرەتی مەریەمە تەماشای کرد خوا لە غەیبەوە رزقی بۆ ناردووە و خوا هەرچی ئارەزوو بکا دەیکا و بیری لەوەش کردەوە کە ئەو پیر بووە وەجاخ کوێرە و لە پاش مردنی ئەو کەس نیە ئامۆژگاری خەڵکەکە بکا.

دستی کرد بە گریان و ڕووی کردە ئاسمان و دەگریا و لە بەر خوا دەپاڕایەوە.

هەر وەکو خوا دەفەرمووێ:

﴿إِذْ نَادىٰ رَبَّهُ نِدٰاءً خَفِيّاً﴾.(١)

واتە ئەی پێغەمبەر ئەوە ڕەحمەتی خوا بوو کە لەگەڵ زەکەریای دا کرد. لەو کاتەدا دووعای کرد و بە نەهێنی لە بەر خوا پاڕایەوە.

﴿قٰالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْباً وَ لَمْ أَكُنْ بِدُعٰائِكَ رَبِّ شَقِيّاً﴾.(٢)

---

(١) مریم: ٣. (٢) مریم: ۴.

گوتی: ئەی خوای گەورە خۆت زانا و ئاگاداری کە من پیر بووم، ئێسقانەکانم سست بوون، سەرم سپی بووە و قەتیش لە دوعا کردندا نائومێدت نەکردووم هەر دوعایەک تا ئێستا کردبێتم گیرا بووە.

﴿وَ اِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِنْ وَرَائِي وَ كَانَتِ امْرَاَتِي عَاقِراً فَهَبْ لِي مِنْ لَدُنكَ وَلِيّاً﴾.(١)

هەروەها فەرمووی: ئەی خوای گەورە من کە لە بەرت دەپاڕێمەوە و دووعا دەکەم بۆ ماڵی دونیا ناپاڕێمەوە.

تەنها بۆ ئەوەش ناپاڕێمەوە کە ئەولادم ببێ وەجاخ کوێر نەبم، بەڵکو من لەوە دەترسم لە پاش مردنی من یەکێکی نائەهل ببێتە گەورە بە سەر خەڵکەکەوە لە دین لایاندا، هەر چەند خێزانەکەشم نەزۆکە و منداڵی نابن، بەڵام داوا دەکەم بە کەرەم و ڕەحمی خۆت کوڕێکمان بدەیتێ.

﴿يَرِثُنِي وَ يَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيّاً﴾.(٢)

لە عیلم و زانیاری و دین و دیانەتدا میراتگری خۆم بێ و لە ملک داریشدا جێگری ئەولادی حەزرەتی یەعقوب بێ. فەرمووی: ئەی خوای گەورە داوا دەکەم ئەولادێکی وابێ خۆت لە قسە و کردەوەی ڕازی بی.

زۆری نەخایاند خوای گەورە وەک هەموو جارەکان دووعای گیرا کرد، حەزرەتی جوبرەئیل لەگەڵ چەند مەلائیکەدا هاتن و فەرموویان:

﴿يَا زَكَرِيَّا اِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيىٰ لَمْ نَجْعَلْ لَهُ مِنْ قَبْلُ سَمِيّاً﴾.(٣)

ئەی زەکەریا ئێمە لە لایەن خواوە هاتووین مـوژدەت بـدەینـی کـە لێرە بـە دواوە لە ئیساعی خێزانت کوڕێکتان دەبێ و خواش ناوی ناوە یەحیا کە تا ئێستا کەس ئەو ناوەی نەبووە و نەبیستراوە. حەزرەتی زەکەریا کە ئەو دەنگەی بیست زۆر پێ خۆشحاڵ بوو لە خۆشیان.

---

(١) مریم: ٥. (٢) مریم: ٦. (٣) مریم: ٧.

﴿قٰالَ رَبِّ اَنّي يَكُونُ لِي غُلٰامٌ وَ كٰانَتِ امْرَاَتي عٰاقِراً وَ قَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيّاً﴾.(١)

فەرمووی: ئەی خوای گەورە جا کوا تازە من کوڕم دەبێ کە ژنەکەم نەزۆکە و منداڵی هەر نەبووە و خۆشم لە بەر پیریان پەکم کەوتووە؟

﴿قٰالَ كَذٰلِكَ قٰالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَ قَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ قَبْلُ وَ لَمْ تَكُ شَيْئاً﴾.(٢)

مەلائیکەتەکان گوتیان: خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەوە لای من ئاسانە، ئەی بۆ بیر لە حاڵی خۆت ناکەیەوە خۆ تۆش لە پێشدا نەبووی دروستم کردی.

﴿قٰالَ رَبِّ اجْعَلْ لي آيَةً قٰالَ آيَتُكَ اَلّٰا تُكَلِّمَ النّٰاسَ ثَلاٰثَ لَيٰالٍ سَوِيّاً﴾.(٣)

ئنجا حەزرەتی زەکەریا لە بەر خوا پارایەوە عەلامەت و نیشانەیەکی بۆ دیاری بکا بۆ کاتی نزیک بوونەوەی منداڵەکەیان.

خوای گەورە فەرمووی: ئەی جوبرەئیل پێی بڵێ عەلامەت و نیشانەی منداڵ بوونەکەیان ئەوەیە کە سێ شەو و ڕۆژ لە سەر یەک زمانت لاڵ دەبێ بە ئیشارەی دەست و چاو و سەر نەبێ جوابی خەڵکت پێ نادرێتەوە، بەڵام بە قودرەتی خوا بۆ تەوڕات خوێندن و زکر کردن و دووعا و عیبادەت زمانی هەر وەک جاران فەسیح و ڕەوان بوو.

﴿فَخَرَجَ عَلىٰ قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرٰابِ فَاَوْحىٰ اِلَيْهِمْ اَنْ سَبِّحُوا بُكْرَةً وَ عَشِيّاً﴾.(٤)

ڕۆژی لە میحرابی مزگەوت هاتە دەرێ بە ئەمری خوا زمانی لاڵ بوو بە ئیشارە بە خەڵکەکەی گوت: ئێوارە و بەیانیان نوێژ بکەن و عیبادەت و زکری خوا بکەن. جا کە ئەو حاڵەتەی دی زانی خێزانەکەی بە سەری پیری و نەخۆشی لە عومری سەد و بیستساڵیدا منداڵیان دەبێ.

لە پاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ واتە بە شەش مانگ پێش لە دایک بوونی حەزرەتی عیسا «علی نبینا و علیه الصلاة و السلام» حەزرەتی یەحیا لە دایک بوو.

لە کاتی لە دایک بوونی حەزرەتی عیسا و حەزرەتی یەحیادا جولەکەکان دەستیان کرد بە بەد ئەخلاقی. هەر چەند حەزرەتی زەکەریا ئامۆژگاری دەکردن فائیدەی نەبوو.

---

(١) مریم: ٨. (٢) مریم: ٩. (٣) مریم: ١٠.
(٤) مریم: ١١.

ئنجا کاتێک خواوەندی گەورە ئیرادەی کرد بەسەرهاتێکی سەیر و دوا ڕۆژێکی چاوەڕوان نەکراو نیشانی حەزرەتی زەکریا بدا ئەمری کرد بە حەزرەتی جوبرەئیل کە بچێ فویەک لە سەر و چاو و دەمی حەزرەتی مەریەمە بکا. فەرمووی:

حەزرەتی جوبرەئیل بە فەرمانی ڕەببی جەلیل هات و فوی کردە ناو دەمی حەزرەتی مەریەم و حامیلە بوو بە حەزرەتی عیسا و پاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ لە دایک بوو.

بەڵام لە بەر ئەوەی حەزرەتی زەکەریا ئاگاداری حەزرەتی مەریەمی دەکرد و ئەو نەبێ کەس مافی ئەوەی نەبوو هات و چۆی بکات جوولەکەکان بوختانیان بۆ حەزرەتی زەکەریا دروست کرد و لە ناو خۆیاندا دەیان گوت: چۆن ئافرەت پیاوی نەچێتە لا منداڵی دەبێ؟ ئاخری بڕیاریان دا کە بچن حەزرەتی زەکەریا بکوژن، حەزرەتی زەکەریاش کە خەبەری زانی هەموویان قسەیان گەیوەتە یەک بۆ کوشتنی، ڕای کرد. جوولەکەکان هەواڵیان زانی ڕای کردووە و دوای کەوتن تا گەیشتە بن دارێک بە ئەمری خوا دارەکە وەدەنگ هات و گوتی: وەرە ناوم، ڕاوی دەڵێ: دارەکە لە نکاوێک لێک بۆوەوە حەزرەتی زەکریا چووە ناوی و وێک کەوتەوە، خەڵکەکە زۆری لێ گەڕان نەیاندیوە، شەیتان خۆی بردە سەر شکڵی پیرەمێردێک و گوتی: ئەوە نازانن زەکەریا ساحرە بە سیحر چووەتە ناو ئەو دارەوە خۆی شاردوەتەوە؟ موشارێک بێنن بۆ درۆ و ڕاستیان دارەکە داهێنن بۆتان ئاشکرا دەبێ داخوا ڕاست دەکەم یان درۆ؟ چۆن موشاریان هێنا و دارەکەیان داهێنا، کاتێک دەدانەی موشارەکە گەیشتنە سەر سەری هەناسەیێکی هەڵکێشا و هاواری کرد. لەو کاتەدا بە ئەمری خوای گەورە حەزرەتی جوبرەئیل نازڵ بوو فەرمووی: ئەی زەکەریا خواوەندی گەورە دەفەرمووێ: قەسەم بە گەورەیی خۆم ئەگەر هەناسەیێکی دی هەڵکێشێ و هاواری‌کی دی بکا ناوی لە دیوانی پێغەمبەراندا ڕەش دەکەمەوە. بۆ ئەو نەی دەزانی کە من پەنا دەهەندەی هەموو عالەمم؟ بۆ پەنای بۆ ئەو دارە برد کە هیچی بە دەست نیە؟..

حەزرەتی زەکریا کە ئەو نیدایەی بیست دانی بە خۆیداگرت تا لەگەڵ دارەکە بە موشار دوو لەتیان نەکرد و دایان نەهێنا نەیگوت: وەی.

ئنجا لە عومری سەد و سی ساڵیدا بە ڕیوایەتێک عومری درێژی دا بە حازریان و

وەفاتی فەرموو. ئەوە بوو باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی زەکەریا ئومێد دەکەم پەندی لێ وەرگرن تا لە دونیا و قیامەت خوا لە بەڵا و موسیبەت لاتان دا.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

# حەزرەتی یەحیا

## باسی «حەزرەتی یەحیا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِينَ.

موسوڵمانینە با گوێ ڕاگرین بۆ باسی ژیانی حەزرەتی یەحیا و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

لە باسی ژیانی حەزرەتی زەکریا دا گوتمان: کە حەزرەتی زەکەریا تەمەنی گەیشتبوو سەد و بیستساڵ ئەولادیان نەبو بو، وەجاخ کوێر بوون، زۆری پێ ناخۆش بوو کە لە پاش وەفاتی، گەلەکەی بێ سەرپەرست وەمێنی و ڕو بکەنە بێ دینی و بەد ئەخلاق بن. ئەوە بۆ دوعای کرد و لە بەر خوا پاڕایەوە بۆ ئەولاد هەر وەکو خوای گەورە لە سورەی «مریم»دا باسی دەکا دەفەرمووی: زەکریا لە دوعاکەی‌دا گوتی:

﴿فَهَبْ لِي مِنْ لَدُنكَ وَلِيّاً﴾.[1] ﴿يَرِثُنِي وَ يَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيّاً﴾.[2]

ئەی خوای گەورە کوڕێکم پێ ببەخشە بە گەورەیی خۆت کە ببێتە جێ‌نشینی من لە پێغەمبەرایەتی‌دا و لە بەدینی‌دا جێ‌گری ئەولادی حەزرەتی یەعقوبیش بێ لە مڵک و دارایی‌دا، ئەوەندە باش بێ خۆت لێ‌ی ڕازی بی. خواوەندی گەورە دوعا و پاڕانەوەکەی گیرا کرد. هەر وەکو لە سورەی «آل عمران»دا دەفەرمووی:

﴿فَنٰادَتْهُ الْمَلٰائِكَةُ وَ هُوَ قٰائِمٌ يُصَلّي فِي الْمِحْرٰابِ اَنَّ اللّٰهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْييٰ مُصَدِّقاً بِكَلِمَةٍ مِنَ اللّٰهِ وَ سَيِّداً وَ حَصُوراً وَ نَبِيّاً مِنَ الصّٰالِحينَ﴾.(١)

لە کاتێکدا کە حەزرەتی زەکریا لە میحرابدا نوێژی دەکرد، حەزرەتی جوبرەئیل هات بۆ لای و بانگی کرد و فەرمووی: خواوەندی گەورە دەفەرمووێ: موژدە بدە بە زەکریا کە خوا دوعاکەی گیرا کرد، کوڕێکی دەبێ بە ناوی یەحیا و ئیمان دێنێ بە حەزرەتی عیسا کەلیم‌الله و دەبێتە گەورەی گەلەکەی و خۆی لە شەهوەت و ئارەزووی نەفس دەپارێزی و دەبێتە پێغەمبەر و زۆر پیاوی چاک دەبێ. بە ڕیوایەتێک دەڵێن: ئەوەندە پیاوی چاک و ساڵح بووە پێغەمبەری ئێمە حەزرەتی موحەممەدی موستەفا سەلات و سەلامی خوای لە سەر بێ لە حەدیسێکدا فەرمووبەتی:

«مٰا مِنْ نَبِيٍّ اِلّا وَ قَدْ عَصيٰ اَوْ هَمَّ بِمَعْصِيَةٍ غَيْرَ يَحْييٰ فَاِنَّهُ لَمْ يَعْصِ وَ لَمْ يَهُمَّ».

هیچ پێغەمبەرێک نەبووە کە یان گوناحی نەکردبێ، یان ئەگەر گوناحیشی نەکردبێ خەیاڵی گوناحی کردووە، حەزرەتی یەحیا نەبێ کە قەت گوناحی بە خەیاڵیشدا نەهاتووە.

ئیمام فەخری ڕازی خوای لێ بێ ڕازی دەفەرمووی: ڕۆژێک دایکی حەزرەتی یەحیا تووشی حەزرەتی مەریەم بوو لەو کاتەدا کە حەزرەتی مەریەم حامیلە بوو بە حەزرەتی عیساوە. گوتی: یا مەریەم تۆ دەزانی منداڵم لە سگی دایە و کوڕە و هەست دەکەم کە سوجدە دەبا بۆ حەمڵەکەی تۆ؟ چونکە دایکی مژدەی لە مەلائیکە وەرگرتبوو کە حەمڵەکەی ناوی یەحیایە و ئیمان بە حەزرەتی عیسا دێنێ. ئنجا کە حەزرەتی یەحیا لە دایک بوو هاتە سەر و بەندی بلوغ بوونی، زۆر ڕوخۆش و خوێن‌گەرم و عاقڵ و تێگەیشتوو بوو، خواوەندی گەورە کردی بە پێغەمبەر هەر وەک لە سورەی «مریم»دا دەفەرمووێ:

(١) آل عمران: ٤٦.

﴿يٰا يَحْيىٰ خُذِ الْكِتٰابَ بِقُوَّةٍ وَ آتَيْنٰاهُ الْحُكْمَ صَبِيّاً﴾.(١)

یا یەحیا ئەوا تۆمان کردە پێغەمبەر ئەو کتێبە کە تەوراتە، یان کتێبێکی تایبەتیە هەڵگرە و بی‌خوێنەوە و عەمەڵی پێ بکە و زۆر بە دیقەت لە مەعناکەی فکرە و بیزانە.

خوای گەورە هەر لەو ئایەتەدا دەفەرمووێ: هەر بە منداڵی قووەت و قودرەت و توانا و فەهم و زەکاوەت و حیکمەتمان دا بە یەحیا بۆ ئەوەی مەعنای ئەو کتێبە بزانێ و زوو شارەزای دین بێ.

﴿وَ حَنٰاناً مِنْ لَدُنّٰا وَ زَكوٰةً وَ كٰانَ تَقِيّاً﴾.(٢)

هەروەها دەفەرمووێ: ئێمە بە ڕەحمی خۆمان دڵێکی پڕ لە ڕەحم و میهرەبانیمان دایە، پاک بوو لە هەموو کردەوەیەکی خەراپ و زۆر پەرهێزگار بوو.

﴿وَ بَرّاً بِوٰالِدَيْهِ وَ لَمْ يَكُنْ جَبّٰاراً عَصِيّاً﴾.(٣)

لەگەڵ دایک و بابی زۆر باش بوو، قەت بێ ئەمری نەدەکردن و دڵی نەدەهێشاندن و خۆی بە زل نەدەزانی، فیز و دەمار و تەکەبووری نەبوو، بە حەیاتی گوناحی بە خەیاڵدا نەدەهات. زۆر ڕوو خۆش و زمان شیرین و دەم بە پێکەنین بوو، شەو و ڕۆژ خەریکی عیبادەت و ئامۆژگاری خەڵک بوو بە تەواوی مەعنا ئاگای لە تەوڕات و دینی حەزرەتی مووسا بوو.

﴿وَ سَلاٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَ يَوْمَ يَمُوتُ وَ يَوْمَ يُبْعَثُ حَيّاً﴾.(٤)

ئەوەندە لای خوا مەرتەبەی بەرز بوو خوا ئەوەندەی خۆش دەویست کە هەر لە سگی دایکی‌ڕا تا ڕۆژی لە دایک بوونی و تا ڕۆژی مردنی و تا ڕۆژی زیندو کردنەوەی بۆ مەیدانی مەحشەر و موحاسەبە خواوەندی گەورە لە شەڕی شەیتانی پاراست و لە دونیا تووشی بێ ئەمری خوا نەبوو، لە قەبر و قیامەتیشدا تووشی ناخۆشی نابێ.

خواوەندی گەورە لەو چەند ئایەتەدا نۆ سیفەتی باس کردوون کە دەلالەت دەکەن لە سەر گەورەیی حەزرەتی یەحیا یەکەم سیفەت ئەوەیە حەزرەتی یەحیا گەیبۆ ئەو دەرەجە خوا قسەی لەگەڵ کرد و فەرمووی: ئەی یەحیا ئەو کتیبە بگرە.

---

(١) مریم: ١٢. (٢) مریم: ١٣. (٣) مریم: ١٤.
(٤) مریم: ١٥.

دووەم: هەر لە منداڵیدا خوا عەقڵ و بیر و هۆشی دایە بۆ ئەوەی لە دین حاڵی بێ و بە خەڵکی ڕاگەیەنی و عەمەڵی پێ بکا.

سێیەم: خوا تەعریفی دەکا و دەفەرمووێ: زۆر بە ڕەحم بووە.

چوارەم: زۆر پاک و خاوێن بووە لە هەموو کردەوەیەکی خەراپ.

پێنجەم: زۆر پەرهیزگار بووە کە زۆر سیفەتێکی گەورەیە، نە بێ ئەمری خوای کردووە نە گوناهی کردووە.

شەشەم: قەت بێ دڵی دایک و بابی نەکردووە.

حەوتەم: خوی بە زل نەزانیوە.

هەشتەم: قەت گوناهی بە خەیاڵیشدا نەهاتۆوە.

نۆیەم: خوا دەفەرموێ: سەلام لە سەر یەحیا لە ڕۆژی لە دایک بوونیدا و لە ڕۆژی وەفاتیدا و لە ڕۆژی زیندوو کردنەوەیدا، کە لام وایە ئەوەیان لە هەموان گەورەترە، چونکە ئینسان و نەفسی ئینسانی لەو سێ ڕۆژو سێ کاتەدا زۆر غەریبە و زۆر دەترسی. لە ناو مەنزڵی سگی گەرم و نەرمی دایکڕا دێتە سەر دنیا. کە لە دنیادا کاتی تەواو بوو مرد دەکەوێتە ناو عالەمێکی کەوە، کە زیندو کرایەوە دەکەوێتە بازاڕێکی کەوە، کە بە ڕاستی ئەو سێ گۆڕانە زۆر گرنگن و زۆر جێگای مەترسین.

بەڵام خوا دەفەرمووێ: ئێمە یەحیامان لە ترسی ئەو سێ جێگایە پاراست جا بۆیە پێغەمبەر لە حەدیسەکەدا فەرمووی: یەحیا بە خەیاڵیش گوناهی نەکردووە.

حەزرەتی یەحیا لە دوا شەهید بوونی باوکی زیاتر دەستی کرد بە عیبادەت و خواپەرستی و ئامۆژگاری خەڵکەکە.

حاکم و پاشای جولەکەکان کە ناوی هیرودس بوو، عاشقی هیرودیای برازای خۆی ببو، زۆری حەز لێ دەکرد و خەریک بوو مارەی کا.

حەزرەتی یەحیا کە ئەو خەبەرەی زانی لە ناو خەڵکا بڵاوی کردەوە کە بە شەرع برازا لە مام مارە ناکرێ، کچە و دایکی کچەکە قسەی حەزرەتی یەحیایان بیستەوە، زۆریان پێ ناخۆش بوو، ڕقیان لە حەزرەتی یەحیا لە دڵ گرت، ڕۆژێک دایکی کچەکەی بە ئەنواعی لیباسی جوان و زێڕ و زێو ڕازاندەوە و چوون بۆ لای پاشا، پاشا کە چاوی بە هیرودیای

برازای کەوت وەخت بۆ لە خۆشیان شێت بێ، دوا گفتوگۆ و پێکەنین پاشا گوتی: هەر داوا و ئارەزویەکت هەیە بڵێ تا بە چاوان بۆت جێ‌بەجێ بکەم، کچەکە گوتی: تەنیا ئارەزووی من ئەوەیە ئەمر بکەی کە یەحیا سەر ببڕن، چونکە تۆ ئاگات لێ‌نیە بە جارێک ئابڕوی بردوین، لە هەمو کوڕ و مەجلیسێکدا باسمان دەکا و دەڵێ دروست نیە هیرودیا لە مامی مارە بکرێ، پاشا ئەمری کرد و چوون حەزرەتی یەحیایان سەر بڕی و سەرەکەیان هێنا بۆ مەجلیسی پاشا.

لەو کاتەدا مەلائیکەی ئەرز و ئاسمان دەسیان کرد بە گریان و عەرزی بارەگای ئەقدەسیان کرد ئەی خوای گەورە حەزرەتی یەحیا، چ گوناهێکی کردبوو سەریان بڕی؟ خوا فەرمووی: ئەی مەلائیکە من یەحیام خۆش دەوێ، گوتیان: ئەی خوای گەورە بۆ هەر کەسێکت خۆش ویست ئاوای دەکوژێ؟ خواوەندی گەورە فەرمووی:

ئەی مەلائیکە وا دیارە ئێوە من وەک بنیادەمان تەماشا دەکەن کە دوژمنی خۆیان دەکوژن و دۆستان ئاگاداری دەکەن! بۆ ئەوەی لە دەست دوژمن زەرەر نەبینن و لا دۆستانیش چاکەیان دەست کەوێ، فەرمووی: من کە خوام دۆستان دەکوژم و دوژمنان پەروەردە دەکەم، تا هەموو عالەم بزانێ کە من نە لە دۆستان قازانجم دەست دەکەوی و نە لە دوژمنان زەرەرم پێ دەگا.

بە ڕیوایەتێک دەڵێن: کە حەزرەتی یەحیایان سەربڕی و سەرەکەیان هێنایە مەجلیسی پاشا سەرەکەی دەی فەرموو: ئەی بێ دین مارەکردنی دروست نیە، مارەی نەکەی.

خواوەندی گەورە لە تۆڵەی خوێنی حەزرەتی یەحیا پاشایەکی ئاگرپەرستی ناردە سەریان حەفتا هەزار کەسی لێ کوشتن و سەری بڕین. بەو جۆرە حەزرەتی یەحیا شەهید کرا. ئێستا سەری موبارەکی لە جامیعی ئەمەوی لە شامە و بەدەنیشی لە بێروتە. ئەگەر بە وردی بیر لە ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی زەکریا و حەزرەتی یەحیای کوڕی بکەینەوە پەند و دەرسی لێ وەر دەگرین.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلين.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

١

# حەزرەتی عیسا

## باسی «حەزرەتی عیسا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلینَ وَ عَلیٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحینَ.

موسوڵمانینە با لە مەجلیسی ئەو ڕۆماندا بچینە خزمەت حەزرەتی عیسا و بە ئەدەب دانیشین و گوێ ڕاگرین بۆ باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

عیمرانی باوکی حەزرەتی مەریەم پیاوێکی زۆر گەورە و بە ناوبانگ بوو، ژنەکەی کە خوشکی ژنی حەزرەتی زەکریا بوو منداڵی نەدەبوون، زۆری ئارەزو لە منداڵ بوو، ڕۆژێک چاوی لە باڵندەیەک بوو بێچووەکەی لە بن خۆ نابوو، گەرمی داپۆشی بوو، ئەوەندەی دیش ئارەزووی منداڵی کرد و بەزەیی بە خۆیدا هاتەوە. هەستا چۆ مزگەوتی «بیت المقدس» و دەستی کرد بە دوعا و پاڕانەوە لە بەر خوا بۆ ئەوەی ئەولادێکی بداتێ.

لە پاش ماوەیەک هەستی کرد کە منداڵی وەسگی کەوتووە لە خۆشیان ڕووی کردە ئاسمان و گوتی:

﴿رَبِّ اِنّي نَذَرْتُ لَكَ ما في بَطْني مُحَرَّراً فَتَقَبَّلْ اِنَّكَ اَنْتَ السَّميعُ الْعَليمُ﴾.(١)

ئەی خوای گەورە ئەوا من ئەو منداڵەی لە سگم دایە نەزرم کرد هیچی پێ نەکەم و بیکەمە خزمەتچی مزگەوتی «بیت المقدس»، گوتی: خوای گەورە نەزرەکەم قبوڵ کە خۆت بینا و زانای بە هەموو بیر و کردەوەیەکی ئادەمیزاد.

لە کاتێکدا خێزانی عیمرانی چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کوڕیان ببێ و لەگەڵ عیمرانی مێردی چاویان بە دیداری کوڕەکەیان بکەوێ و دڵیان بگەشێتەوە. عیمران عەمری درێژی دا بە حازریان و قەزا و قەدەر خەفەتێکی تازەی خستە دڵی دایکی حەزرەتی مەریەمەوە، کە نۆ مانگ و نۆ ڕۆژەی تەواو بوو؛

﴿فَلَمّا وَضَعَتْها قالَتْ رَبِّ اِنّي وَضَعْتُها اُنْثیٰ وَاللّٰهُ اَعْلَمُ بِما وَضَعَتْ وَ لَيْسَ الذَّكَرُ كَالْاُنْثیٰ وَ اِنّي سَمَّيْتُها مَرْيَمَ وَ اِنّي اُعيذُها بِكَ وَ ذُرِّيَّتَها مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيمِ﴾.(٢)

لە باتی کوڕ کچی بوو، کە زانی کچە گوتی: ئەی خوای گەورە خۆ من کچم بوو؛ ئەی خوای گەورە خۆت دەزانی کە کچ بۆ خزمەتی عیبادەتگا وەک کوڕ نیە! ئەوا ناویشم نا مەریەم و داوا دەکەم کە خۆی و ئەولادی لە مەکری شەیتان بپارێزی.

﴿فَتَقَبَّلَها رَبُّها بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَ اَنْبَتَها نَباتاً حَسَناً وَ كَفَّلَها زَكَرِيّا كُلَّما دَخَلَ عَلَيْها زَكَرِيَّا الْمِحْرابَ وَجَدَ عِنْدَها رِزْقاً قالَ يا مَرْيَمُ اَنّیٰ لَكِ هٰذا قالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللّٰهِ اِنَّ اللّٰهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشاءُ بِغَيْرِ حِسابٍ﴾.(٣)

خوای گەورە نەزرەکەی لێ قبوڵ کرد و بە جوانی پێی گەیاند کاتێک چلوی چوو منداڵەکەی لە باوەشێ گرت و بردی‌یە مزگەوتی «بیت المقدس» و لای راهیب و کاهین و ئەوانەی کە خزمەتی هەیکەل‌یان دەکرد دای‌نا و گوتی: من ئەو منداڵەم نەزر کردووە بیکەمە خزمەتچی مزگەوت ئەوا تەسلیم بە ئێوەی دەکەم ئەوانیش کە زانیان ئەوە ژنی عیمرانە و ئەو منداڵەش منداڵی ئەوە، چونکە عیمران گەورەیان بوو، زۆری پیاوەتی لەگەڵ کردبوون، هەرکەس لە بەر خۆیەوە دەیگوت: خۆم بەخێوی دەکەم، ئاخری قورعەیان کێشا و پشکیان هاویشت بە ناوی حەزرەتی زەکەریا هاتە دەرێ.

---

(١) آل عمران: ٣٥. (٢) آل عمران: ٣٦. (٣) آل عمران: ٣٧.

بە ڕیوایەتێک دەڵێن: تەشتێکی گەورەیان هێنا و پریان کرد لە ئاو و هەر کەس قەڵەمە ئاسنەکەی هاویشتە ناو ئاوەکە وگوتیان: قەڵەمی کێ لە سەر ئاوەکە ڕاوەستا و قوم نەبوو ئەو بی‌باتەوە قەڵەمی حەزرەتی زەکەریا نەبێ هەموویان بن ئاو بوون، حەزرەتی زەکەریا مەریەمەی ناردەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای خێزانەکەی کە پووری مەریەمە بوو، تا حەوت ساڵان لە ماڵەوە بەخێویان کرد. ئنجا حەزرەتی زەکەریا میحراب و حوجرەیەکی لە گۆشەیەکی مزگەوتا بۆ دروست کرد و بردی‌یە وێ تا تاعەت و عیبادەتی خوا بکا.

شەو و ڕۆژ مەریەم لەو حوجرە عیبادەتی خوای دەکرد.

هەر کاتێ حەزرەتی زەکەریا دەچۆ حوجرەکەی تەماشای دەکرد میوەی هاوینی لە زستاندا لایە و ئی زستانی لە هاویندا لایە. زۆری لا عەجایب بوو، فەرمووی: ئەی مەریەم ئەو میوەت لە کۆی بۆ دێ؟

گوتی: لە لایەن خواوە، ئەگەر ئارەزوو بکا بە بێ حیساب رزق دەدا بە هەر کەسێک کە خۆی مەیلی بێ.

با بچینە سەر باسی لە دایک بوونی حەزرەتی عیسا. هەر وەکو خواوەندی گەورە لە سورەی «مریم»دا بە تەواوی باسی دەکا و دەفەرمووێ:

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انْتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَاناً شَرْقِيّاً﴾.(١)

ئەی پێغەمبەر تۆ بە هۆی قورئانەوە باسی مەریەم و لە دایک بوونی حەزرەتی عیسا بۆ گەلەکەت وەگێڕە کە چۆن حەزرەتی عیسای بووە، لەکاتێکداکە حەزرەتی مەریەمە لە لای ڕۆژهەڵاتی «بیت المقدس» لە خەڵوەتی‌یەکەیدا بوو، خۆی دوورەپەرێز گرتبوو لە خزم و کەس وکار و خەڵک.

﴿فَاتَّخَذَتْ مِنْ دُونِهِمْ حِجَاباً فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيّاً﴾.(٢)

خۆی شاردبۆوە لە خەڵک؛ ئێمە حەزرەتی جوبرەئیلمان نارد بۆ لای لە سەر سورەتی ئینسانیکی تەواو، بۆ ئەوەی مەریەم لێی نەترسێ و لە ترسانی ڕانەکا.

حەزرەتی مەریەم کە چاوی بەو پیاوە بێگانە کەوت وەی زانی پیاو خەراپە و خەیاڵی خەراپی هەیە؛

---

(١) مریم: ١٦. (٢) مریم: ١٧.

﴿قٰالَتْ اِنّي اَعُوذُ بِالرَّحْمٰنِ مِنْكَ اِنْ كُنْتَ تَقِيّاً﴾.(١)

گوتی: پەنا دەگرم بە خوا لە شەڕی تۆ ئەگەر بە دینی و تەقوات هەیە هەستە بڕۆ و دوور کەوە.

حەزرەتی جوبرەئیل کە زانی زۆر دەترسێ خۆی ئاشکرا کرد و فەرمووی:

﴿قٰالَ اِنَّمٰا اَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِاَهَبَ لَكِ غُلٰاماً زَكِيّاً﴾.(٢)

ئەی مەریەم مەترسە من بەشەر نیم مەلائیکەم، فرستادەی خوام هاتووم کوڕێکی پاکت بدەمێ.

مەریەم کە ئەو خەبەرەی بیست زۆری لا عەجایب بوو، ڕەنگێکی هێنا و برد و بە سەرسامی‌یەوە گوتی:

﴿قٰالَتْ اَنّىٰ يَكُونُ لي غُلٰامٌ وَ لَمْ يَمْسَسْني بَشَرٌ وَ لَمْ اَكُ بَغِيّاً﴾.(٣)

جا چۆن من منداڵم دەبێ خۆ من شوم نەکردووە و بە حەڵاڵی کەس دەستی لە دەستی نەداوم و خوا خۆی دەزانی خەراپیشم نەکردوە؟ حەزرەتی جوبرەئیل جوابی دایەوە و فەرمووی:

﴿قٰالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنّٰاسِ وَ رَحْمَةً مِنّٰا وَكٰانَ اَمْراً مَقْضِيّاً﴾.(٤)

ئەی مەریەم وەک تۆ دەڵێی وایە، بەڵام خوا دەفەرمووێ:

منداڵ بوونی بێ باب لای من ئاسانە و هیچ عەجایب نیە، بە تایبەتی بۆ ئەوەی بەڵگە و دەلیل بێ لە سەر قودرەتی خوا لای خەڵک و هەروەها ڕەحمەتێک بێ تا خەڵک دوای کەون و ڕێگای ڕاست بگرن.

فەرمووی: تازە قەڵەمی پێدا هاتووە ڕەد نابێتەوە و هەر دەبێ.

﴿فَحَمَلَتْهُ فَانْتَبَذَتْ بِهِ مَكٰاناً قَصِيّاً﴾.(٥)

حەزرەتی جوبرەئیل بە ئەمری خوا فوی کرد بە سەر و چاوی حەزرەتی مەریەمدا و حامیلە بوو بە حەزرەتی عیسا.

---

(١) مریم: ١٨. (٢) مریم: ١٩. (٣) مریم: ٢٠.
(٤) مریم: ٢١. (٥) مریم: ٢٢.

حەزرەتی مەریەم کە هەستی کرد بە منداڵ دەستی کرد بە گریان و ئـەوەندەی دیش خۆی لە خەڵک شاردەوە و شەو و ڕۆژ دەگریا و دەی گوت: ئەی خوای گەورە جا خـۆ کەس باوەڕم پێ ناکا، ئەی خاک بە سەرم کەس لە دنیادا وەک من خەجاڵەت و ڕیسـوا نەبووە.

﴿فَاَجٰاءَهَا الْمَخٰاضُ اِلىٰ جِذْعِ النَّخْلَةِ قٰالَتْ يٰا لَيْتَنى مِتُّ قَبْلَ هٰذٰا وَكُنْتَ نَسْياً مَنْسِيّاً﴾.(١)

کاتێک وەختی منداڵ بوونی هات و دەستی کرد بە ژانان زۆر ناڕەحەت بوو؛ لە بەر خەجاڵەتیان ئاوایی بە جێ هێشت و ڕووی کردە سەحرا و بیابان؛ ئێش و ئازاری مـنداڵ بوون تینی بۆ هێنا، ڕۆی‌ی تاگەیشتە بن دار خورمایەک، بەڵام دارەکە وشک ببوو، گەڵای پێوە نەبوو، ناچار بوو لە بەر ناڕەحەتی و سەرمای زستان چـۆ بـن دارەکـە و پـاڵیـدا بـە دارەکەوە و دەگریا و دەی گوت: ئەی خوای گەورە فریام کەوە، چۆنم لێ قەوما.

نە مامان هەیە پاڵی پێوە دەم، نە کەس هەیە چۆڕێکم ئاو داتێ، نە خزمێکم لایە، ڕووی کردە ئاسمان و لە کاتێکداکە خەریکی وەزعی حەملی بوو، دەگریا و دەی‌گوت: سەد بریا بمردمایە و ئەو حاڵەم چاو پێ نەکەوتایە.

لەو قسانەدا بووکوڕێکی زۆر جوان و پاکی بوو، هەر چەندی زۆری دڵ بە کۆرپەکەی خۆش بوو، بەڵام دەیگوت: جاکێ باوەڕم پێ دەکا وکێ دەڵێ داوێن پاکە؟ چۆن ئافرەت بێ مێرد منداڵی دەبێ؟...

زۆر غەمبار و ناڕەحەت بوو، زۆری بەزەیی بە خۆیدا دەهـاتەوە، زۆری تـینوو بـوو، بەڵام حەمد و سەنا بۆ خوا زۆر جار زوو فریای عەبد و بەندەگانی خۆی دەکـەوێ و لە تەنگانە ڕزگاریان دەکا.

﴿فَنٰادٰاهٰا مِنْ تَحْتِهٰا اَلّٰا تَحْزَنى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيّاً﴾.(٢)

حەزرەتی جوبرەئیلی نارد و بانگی کرد ئەی مەریەم غەم مـەخۆ خـوا لە بـەر دەمـتا ئاوێکی جاری و شیرین پەیدا دەکا و؛

(١) مریم: ٢٣. (٢) مریم: ٢٤.

﴿وَ هُزِّي اِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسٰاقِطْ عَلَيْكِ رُطَباً جَنِيّاً﴾.(١)

هەستە ئەو دار خورمایەش ڕاوەشێنە خورمای فەریک و تازە دەر دەکا.

﴿فَكُلي وَاشْرَبي وَ قَرّي عَيْناً فَاِمّٰا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ اَحَداً فَقُولى اِنّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمٰنِ صَوْماً فَلَنْ اُكَلِّمَ الْيَوْمَ اِنْسِيّاً﴾.(٢)

لە خورماکە تێر بخۆو لە ئاوەکەش تێر وەخۆ و دڵت ئاسودە بێ، ئەگەر تووشی کەسێکیش بووی و گوتی: ئەو منداڵە چی‌یە؟ بڵێ من نەزرم کردوە قسە ناکەم.

کە هەستا دار خورماکەی ڕاوەشاند بە قودرەتی خواگەڵای شیینی دەرکرد و خورمای گرت و هەڵوەرینە بەردەمی، کە ڕوانی لە خوار خۆشی‌یەوە ئاوێک هەڵقوڵی‌وە و ئاو جاری بووە، تۆزێک سێ بۆری هات و فەرامۆشی شکا، جا لەو کاتەوە دەڵێن ئافرەت کە منداڵی بوو خورما بخوا زۆر باشە.

﴿فَاَتَتْ بِهِ قَوْمَهٰا تَحْمِلُهُ قٰالُوا يٰا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئاً فَرِيّاً﴾.(٣)

ئنجا بە غەمباری وگریانەوە هەستا و منداڵەکەی لە باوەشێ کرد و بەرەو ماڵ گەڕایەوە.

خەڵک کە زانیان منداڵی بووە دستیان کرد بە لۆمە کردن و قسە پێ گوتنی، دەیانگوت: ئەو منداڵەت چۆن بووە؟ بە ڕاستی وەزعێکی سەیرت بە سەردا هاتووە و شتێکی عەجایب لە تۆ ڕوی داوە، چۆن ئافرەت مێردێ نەکردبێ منداڵی دەبێ؟

﴿يٰا اُخْتَ هٰارُونَ مٰا كٰانَ اَبُوكِ امْرَاَ سَوْءٍ وَ مٰا كٰانَتْ اُمُّكِ بَغِيّاً﴾.(٤)

دەیانگوت: ئەی خوشکی هارون خۆ باوکت پیاوێکی خەراپ نەبوو دایکیشت قەت خەراپە وکاری خەراپی نەدەکرد. ئەی تۆ ئەو منداڵەت لە کوێ بووە؟

﴿فَاَشٰارَتْ اِلَيْهِ قٰالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَنْ كٰانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيّاً﴾.(٥)

حەزرەتی مەریەم لە بەرامبەر ئەو هەموو قسە و باسەدا بە ئامۆژگاری حەزرەتی جوبرەئیلی کرد و قسەی نەکرد.

بەڵام ئیشارەی کرد بۆ لای منداڵەکەی و بە ئیشارە گوتی: جوابیان بدە وگوتی: لەو

---

(١) مریم: ٢٥. (٢) مریم: ٢٦. (٣) مریم: ٢٧.
(٤) مریم: ٢٨. (٥) مریم: ٢٩.

کوڕە پرسن جوابتان دەداتەوە. خەڵکەکە ئەوەندەی دیش ڕقیان هەستا و توڕە بوون و گوتیان: تۆ گاڵتەمان پێ دەکەی چۆن منداڵی سەرلانکە قسە دەکا؟

لەو کاتەدا بە ئەمری خوا حەزرەتی عیسا وەدەنگ هات و گوتی:

﴿قٰالَ اِنّي عَبْدُاللّٰهِ آتٰانِيَ الْكِتٰابَ وَ جَعَلَني نَبِيّاً﴾.(١)

ئەی خەڵکینە من عەبد و بەندەی خوام کتێبم بۆ دەنێری و دەمکا بە پێغەمبەر و گوتی:

﴿وَ جَعَلْني مُبٰارَكاً اَيْنَ مٰا كُنْتُ وَ اَوْصٰاني بِالصَّلوٰةِ وَالزَّكوٰةِ مٰا دُمْتُ حَيّاً﴾.(٢)

لە هەر جیگایەک بم پیت و بەرەکەتی دەکەویتێ و خوا ئەمرم پێ دەکا بە نوێژ کردن و زەکاتدان تا زیندو بم.

﴿وَ بَرّاً بِوٰالِدَتي وَ لَمْ يَجْعَلْني جَبّٰاراً شَقِيّاً﴾.(٣)

گوتی: خوا وای کردوە لەگەڵ دایکم چاک بم خۆم بە زل نەزانم گوناح نەکەم.

﴿وَ السَّلٰامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُّ وَ يَوْمَ اَمُوتُ وَ يَوْمَ اُبْعَثُ حَيّاً﴾.(٤)

فەرمووی: لە ڕۆژی لە دایک بوونمڕا تا دەچمە ناو گۆڕ و زیندوو دەکرێمەوە بۆ موحاسەبە خوا لە مەکری شەیتان و خەراپە مەحفوزی کردم و ئاگاداریم دەکا.

کە حەزرەتی عیسا لە لانکەدا ئەو قسانەی کرد خەڵکەکە واقیان وڕ ما و سەرسام بوون و بۆیان ئاشکرا بوو کە حەزرەتی مەریەم بێ گوناحە و ئەو خوایەی کە منداڵ لە لانکەدا وەدەنگ بێنێ دەشتوانێ بێباب بەوە لە دی بێنێ.

جا با لێرەدا تا سبەینێ هەموو لایەک بە خوا بسپێرین و ئەگەر عومر وەفای کرد، بەیانی دەچینەوە خزمەتیان.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(١) مريم: ٣٠. (٢) مريم: ٣١. (٣) مريم: ٣٢.

٢

# حەزرەتی عیسا

## باسی «حەزرەتی عیسا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِیْنَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلِیْنَ وَ عَلیٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحِیْنَ.

موسوڵمانینە با لە مەجلیسی ئەو ڕۆماندا بچینەوە خزمەت حەزرەتی عیسا و بزانین ئەو پێغەمبەرە نازدارە چۆن ژیاوە و چی لێ بەسەر هات و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

حەزرەتی عیسا وەکو هەموو منداڵێک گەورە بوو، بەڵام لە بیر و باوەر و عەقڵ و شعور و خو و ڕەوشتدا لە هەموو منداڵێک جیاواز بوو، لە سەر پشتی لانکەدا قسەی دەکرد، لە تەمەنی منداڵیدا موعجیزەی دەنواند.

خواوەندی گەورە بە ئیلهام خستییە دڵی دایکییەوە کە شام و فەلەستین بە جێ بێڵێ و بڕوا بۆ میسر دەنا «هیرودس» کوڕەکەی دەکوژێ.

حەزرەتی مەریەم بە دزی خەڵک ڕۆیشت بۆ میسر لە پاش دوازدە ساڵ کە خەبەری زانی «هیرودس» مردوە گەڕانەوە بۆ وڵاتی شام و چوونە شاری ناسیرە و تا تەمەنی

حەزرەتی عیسا بوو بە سی ساڵ هەر لەوی مانەوە، هەر بەو بۆنەشەوەیە بە پەیرەوەکانی دەڵێن نەسرانی.

ئنجا لە تەمەنی سی ساڵیدا خواوەندی گەورە ئینجیلی بۆ ناردە خوارێ و دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنی خەڵک.

هەر وەکو خوای گەورە لە سورەی «المائدة»دا دەفەرمووێ:

﴿وَ آتَیْناهُ الْإِنْجِیلَ فِیهِ هُدیً وَ نُورٌ وَ مُصَدِّقاً لِما بَیْنَ یَدَیْهِ مِنَ التَّوْراةِ وَ هُدیً وَ مَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِینَ﴾.(١)

واتە ئێمە ئینجیلمان بۆ عیسا نارد کە ڕێنموونی تێدایە بۆ نوری ئیمان و پەیرەوی لە تەورات دەکا و پڕە لە ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی لە خوا بترسن.

حەزرەتی عیسا لە تەمەنی سی ساڵیدا کە ئینجیلی بۆ هاتە خوارێ دەستی کرد بە ئامۆژگاری خەڵک. هەر وەکو خوای گەورە لە سورەی «الصّف»دا باسی دەکا و دەفەرمووێ:

﴿وَ إِذْ قالَ عِیسَی ابْنُ مَرْیَمَ یا بَنِي إِسْرائِیلَ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَیْکُمْ مَصَدِّقاً لِما بَیْنَ یَدَيَّ مِنَ التَّوْراةِ وَ مُبَشِّراً بِرَسُولٍ یَأْتِي مِنْ بَعْدِی اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾.(٢)

کاتێک عیسای کوڕی مەریەم گوتی: ئەی ئەولادی ئیسرائیل من فرستادەی خوام بۆ لای ئێوە و باوەڕم بە تەورات هەیە و مژدەی ئەو پێغەمبەرەشم پێیە کە لە دوا من دەبێتە پێغەمبەر و ناوی ئەحمەدە؛ واتە موحەممەدی موستەفا درودی خوای لە سەر بێ.

﴿فَلَمّا جاءَهُمْ بِالْبَیِّناتِ قالُوا هٰذا سِحْرٌ مُبِینٌ﴾.(٣)

بەڵام کە حەزرەتی عیسا ئینجیلی بۆ خوێندنەوە و موعجیزەی نیشان دان، لە باتی ئەوەی ئیمانی پێ بێنن دەیانگوت: بە ڕاستی عیسا ساحرێکی زۆر گەورەیە و ئەوەی دەیکا سیحرێکی ئاشکرایە.

حەزرەتی عیسا دەیفەرموو:

---

(١) المائدة: ٤٦. (٢) و (٣) الصّف: ٦.

﴿اَنّي اَخْلُقُ لَكُمْ مِنَ الطّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَاَنْفُخُ فيهِ فَيَكُونُ طَيْراً بِاِذْنِ اللّٰهِ وَ اُبْرِىءُ الْاَكْمَهَ وَ الْاَبْرَصَ وَ اُحْيِ الْمَوْتىٰ بِاِذْنِ اللّٰهِ وَ اُنَبِّئُكُمْ بِما تَأْكُلُونَ وَ ما تَدَّخِرُونَ في بُيُوتِكُمْ اِنَّ في ذٰلِكَ لَآيَةً لَكُمْ اِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنينَ﴾.(١)

من لە قوڕ تەیر دروست دەکەم فوی پێدا دەکەم بە ئەمری خوا روحی وەبەر دێ و دەفڕێ، کەڕ و لاڵ و بەلەک چاک دەکەمەوە و مردو زیندو دەکەمەوە بە ئیزنی خوا و چیتان خوارد بێ و بخۆن دەزانم و ئیمان بێنن زۆرتان قازانجە و دەلیل و بەڵگە لەو موعجیزانە گەورەتر نابن لە سەر پێغەمبەرایەتی من.

خواوەندی گەورە موعجیزەی واگەورەی دا بوو بە حەزرەتی عیسا کە زمان لە بەرامبەریاندا لاڵە. کۆمەڵێک ئیمانیان پێ هێنا، بە تایبەتی دوازدە کەس کە ناو دەبرێن بە حەواریین شەو و ڕۆژ لە خزمەتیدا بوون، حەزرەتی عیسا بۆ هەر شار و دێیەک بچویایە لە گەڵی دەچوون، لە سەفەرێکدا تووشی چۆڵ و بیابانێک بوون، زۆریان برسی بوو، لە تینوان زمانیان نەدەگەڕا و گەروویان وشک ببوو، لە کاتێکدا ئەوان لەو حاڵەدا بوون و حەزرەتی عیسا دڵخۆشی دەدانەوە، ڕوویان کردە حەزرەتی عیسا و گوتیان:

﴿يا عيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطيعُ رَبُّكَ اَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنا مائِدَةً مِنَ السَّماءِ قالَ اتَّقُوا اللّٰهَ اِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنينَ﴾.(٢)

ئەی عیسای کوڕی مەریەم خوا دەتوانی لە ئاسمانڕا و لە غەیبەوە سفرەیکمان بۆ نازڵ بکا؟ هەر وەک موعجیزەی ئەرزیت نیشان داوین موعجیزەیەکی ئاسمانیشمان نیشان بدەی؟ حەزرەتی عیسا ئەو پرسیارەی زۆر پێ ناخۆش بوو فەرمووی: لە خوا بترسن و داوای شتی وا مەکەن، ئەگەر موسوڵمانن. گوتیان:

﴿قالُوا نُريدُ اَنْ نَأْكُلَ مِنْها وَ تَطْمَئِنَّ قُلُوبُنا وَ نَعْلَمَ اَنْ قَدْ صَدَقْتَنا وَ نَكُونَ عَلَيْها مِنَ الشّاهِدينَ﴾.(٣)

قوربان، برسیمانە دەمان هەوێ لێی تێر بخوێن و ئیمانمان پتەوتر بێ و شاهیدیش بین بۆ خەڵکی وەگێرین تا زیاتر ئیمان بێنن. بە هەر جۆرێک بوو خۆیان گەیاندە قەراغ شاری «بيت المقدس».

---

(١) آل عمران: ٤٩. (٢) المائدة: ١١٢. (٣) المائدة: ١١٣.

﴿قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنْزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ تَكُونُ لَنَا عِيداً لِأَوَّلِنَا وَ آخِرِنَا وَ آيَةً مِنْكَ وَارْزُقْنَا وَ أَنْتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾.(١)

حەزرەتی عیسا کە زانی بە ڕاستیانە و درۆ ناکەن، ڕوی کردە ئاسمان و گوتی: ئەی خوای گەورە سفرەیەکمان لە ئاسمان و لە غەیبەوە بۆ بنێرە تا بیکەینە جەژن و ببێتە بەڵگەیێکی گەورەش لە سەر پێغەمبەری من و رزقمان بۆ بنێرە تۆ چاکترین رازقی.

﴿قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَنْ كَفَرَ بَعْدُ مِنْكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَاباً لَا أُعَذِّبُهُ أَحَداً مِنَ الْعَالَمِينَ﴾.(٢)

خوا فەرمووی: من ئەو سفرەتان بۆ نازڵ دەکەم بەڵام هەر کەسێک چاوی پێ کەوتوو ئیمانی پێ نەهێنا و کافر بوو ئەوە تووشی عەزابیکی وای دەکەم کە کەسم وا عەزاب نەدابێ.

ڕاوی دەڵێ هەموو فەسڵ فەسڵی خوان ڕۆژی یەک شەممە بوو، لە بەینی دوو پەلە هەوردا سفرەیێک لە ئاسمانیرا هاتە خوارێ.

حەزرەتی عیسا کە چاوی پێ کەوت دەستی کرد بە گریان و فەرمووی: ئەی خوای گەورە، بیگێرێ بە هۆی پیت و بەرەکەت و نەبێتە هۆی عەزاب. لە کاتی نازڵ بونیدا خەڵکەکە بونێکی ئەوەندە خۆشیان بە سەردا دەهات کە قەت بۆنی وایان نەکردبوو حەزرەتی عیسا و حەواری‌یەکان سوجدەی شوکریان برد و زۆر پێ خۆشحاڵ بوون.

لەوکاتەدا جولەکەکان خەبەریان زانی بە پەلە هاتن چاویان بە شتێکی عەجایب کەوت: سفرەیەک دانراوە سەرپۆشێکی جوانی بە سەر هەڵکێشراوە.

حەزرەتی عیسا ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: کێ هەمان زیاتر لە خوا دەترسی با هەستی ئەو سەر پۆشە لە سەر ئەو سفرە لا بەری تا بزانین چی تێدایە و دەست کەین بە خواردن. حەواری‌یەکان گوتیان:

قوربان لە تۆمان گەورەتر و بە دین‌تر و باشتر تیدا نیە. خۆت پەردەی لە سەر لابە، حەزرەتی عیسا هەستا ناوی خوای هێنا و سەرپۆشی لە سەر لا برد. تەماشایان کرد

---

(١) المائدة: ١١٤. (٢) المائدة: ١١٥.

ئەنواعی خواردەمەنی لە سەرە و هەرچی نەفس ئارەزووی بکا ریز کراوە. بە ڕیوایەتێک دەڵێن حەزرەتی عیسا و حەواری‌یەکان و زۆر خەڵکی‌تریش دەستیان کرد بە خواردن و تا چل ڕۆژ ڕۆژی جارێک ئەو سفرە لە غەیبەوە دەهات هەر فەقیرێک لە تەعامی ئەو سفرەی بخواردایە دەوڵەمەند دەبوو، هەر گول و کەچەڵ و بەڵەک و شەل و نەخۆشێک دوو پاروی بخواردنایە چاک دەبوونەوە.

بەو موعجیزە گەورە خەڵک زۆر ئیمانیان هێنا. بەڵام کۆمەڵێک لە جولەکەکان لە روی خوورەوشتێکی کە لە قەدیمەوە هەر بوو یا نە و لە کەللەیان دەرناچێ گوتیان: چۆن لە لایەن خواوە سفرە نازڵ دەبێ؟

خوای گەورە وەحی کرد بۆ لای حەزرەتی عیسا و فەرمووی: من وەعدەم داوە کە هەر کەس لەو سفرە بخوا و ئیمانی پێ نەبێ تووشی غەزەب و عەزابیکی وایان دەکەم کەس عەزابی وای نەدی بێ. بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە سێ سەد و سی کەسیان بوون بە بەراز و لە ماڵەکانیان وەدەرکەوتن و بە کۆڵانانەوە دەگەڕان و داوێنی حەزرەتی عیسایان ماچ دەکرد، حەزرەتی عیسا دووعای کرد و فەرمووی: با چیدی زەلیل نەبن، خوا دوعاکەی گیرا کرد و مردن.

ئاخری کاهین و مالم و زاناکانیان کە زانیان زوربەی خەڵک دوای دەکەوێ و بازاری وان کەساد دەبێ دەستیان کرد بە غەیبەت کردنی و لای خەڵک دەیانگوت: عیسا ساحیرێکی زۆر گەورەیە، لەوانەیە ئەگەر فریا خۆمان نەکەوین دینەکەمان لە بەین بەری، چونکە تا ئێستا هەر پێغەمبەرێک هاتبێ دینی حەزرەتی مووسای بەتاڵ نەکردۆتەوە، کە چی ئەو کوڕە بێ بابە بە بەتاڵی دادەنێ.

ڕۆژێک زوربەی عالمەکانیان خۆیان گەیاندە لای پاشای ڕۆمان گوتیان: قوربان ئەگەر باوەڕمان پێ دەکەی ئێمە بە ڕمل و ئوستورلاب چاومان پێ کەوتووە ئەگەر ئەو کوڕە بێ بابە نەکوژی تەخت و بەختت لە بەین دەبا، پاشا کاغەزی نووسی و پیاوی نارد بۆ لای حاکمی فەلەستین کە فەوری عیسا بگرە و لە داری بدە!

حەزرەتی عیسا خەبەری زانی بوو کە بە دوای‌دا دەگەڕێن، خۆی شاردبۆوە نەیان‌دەزانی لە کوێ‌یە؟!

لەکاتێکدا تەواوی ماڵم وکاهین و زوربەی جولەکەکان لە مزگەوتی «بیت المقدس»کۆ ببونەوە یەکێک لەوانەی بە زاهیر ئیمانی بە حەزرەتی عیسا هێنا بوو، بەڵام مونافیق بوو، بە درۆ موسوڵمان بوو وەژور کەوت و گوتی: من دەزانم عیسا لەکوێ خۆی شاردۆتەوە!

حەواری‌یەکان کە ئەو خەبەرەیان زانی ئەوانیش ڕایان کرد. پیاوی هیرودس لەگەڵ کابرای مونافق هاتن بۆ ئەو جێگایە کە حەزرەتی عیسای لێ بوو، کە چوونە ژورەوە خوا حەزرەتی عیسای هەڵکێشا و بەرزی کردەوە وکابرای مونافیقی بردە سەر شکڵ و شێوەی حەزرەتی عیسا. پیاوەکانی حاکم وایان زانی عیسایە، دەست و قاچیان بەست و لە داریان دا وکوشتیان.

لە پاشان زانیان کە حەزرەتی عیسا نەبووە بەڵام چ فائیدە، هەر وەکو خوای گەورە لە سورەی «النساء»دا دەفەرمووێ:

﴿وَ مٰا قَتَلُوهُ وَ مٰا صَلَبُوهُ وَ لٰكِنْ شُبِّهَ لَهُمْ﴾.(١)

عیسایان نەکوشت و لە داریان نەدا!.. بەڵام مونافقەکەیان لە دار دا وەیان زانی عیسایە.

﴿بَلْ رَفَعَهُ اللّٰهُ اِلَيْهِ﴾.(٢)

بەڵکو خوا حەزرەتی عیسای نەجات دا بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی.

ئەوە بوو باسی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی عیسا ئومێد دەکەم پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن و ئیمانتان پتەوتر بێ تا خوا لە دنیا و قیامەت ڕەحمتان پێ بکا.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

---

(١) النساء: ١٥٧. (٢) النساء: ١٥٨.

١

# حەزرەتی موحەممەدی موستەفا

## باسی «حەزرەتی موحەممەدی موستەفا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ مَنْ تَبِعَهُمْ بِاِحْسٰانٍ اِلىٰ يَوْمِ الدِّينِ.

موسوڵمانینە با لە کۆڕ و مەجلیسی ئەو ڕۆماندا بچینە خزمەت خاتەمی پێغەمبەران و شافیعی گوناهکاران و پێغەمبەری ئاخر زەمان حەزرەتی محمدی موستەفا سەلات و سەلامی خوای لە سەر بێ و بە ئەدەب دانیشین وگوێ ڕاگرین بۆ باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەو زاتە خاوەن کەرەم و خو و ڕەوشتە بەرزە و پەند و ئامۆژگاری بە نرخی لێ وەرگرین:

پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی «محمد المصطفیٰ» درودی خوای لە سەر بێ لە حەدیسێکدا فەرموویەتی:

ئەووەڵ شتێک خوا دروستی کرد نوری من بوو، پشت بە پشت و ڕەحەم بە ڕەحەم هات تاگەیشتە عبداللهی باوکم و ئامێنە خاتوونی دایکم.

ڕاوی دەڵێ: «عبدالمطلب» نەزری کردبوو کە ئەگەر خوا دە کوڕی بداتێ یەکیان بکا بە قوربانی.

کاتێک خوا دە کوڕەکەی دایە، ئاخر کوڕیان عبداللە بوو، لە هەمووان جوانتر و لاوچاکتر و ڕوو خۆشتر بوو، باوکی خەیاڵی کرد وەفا بە نەزرەکەی بکا، زانا و دانای بانگ کردن و کارەساتی بۆ گێڕانەوە، گوتیان: وەفا بە نەزر واجبە دەبێ قورعە ڕاکێشی بە ناوی هەر کام لە کوڕەکان هاتە دەرەوە سەری بڕی.

بەڵام لە بەر ئەوەی نووری نوبووەت و ریسالەت لە ناو چاوانی عبداللەدا شوعلەی دەدا باب و دایک و خزم و کەس و کار هەموو قورەیشیەکان عبداللەیان لە هەمو کوڕەکان خۆشتر دەویست، کە چی بە ئەمری خوا تا دە جار لە سەر یەک قورعەیان ڕاکێشا هەر بە ناوی ئەوەوە دەهاتە دەر.

ئاخری زاناکان گوتیان: ئەگەر دە وشتر سەر ببڕی و ئاگرێک لە غەیبەوە بێ بیان سوتێنێ نەزرەکەت لە سەر لا دەچێ و عبداللە ڕزگاری دەبێ. دە جار جاری دە حوشتری سەر دەبڕی تا سەد حوشتری سەر بڕی. ئنجا ئاگرەکە پەیدا بوو هەموویان سووتان و عبداللە نەجاتی بوو، جا ئەوەیە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: ئەمن کوڕی دوو سەر بڕاوانم، واتە حەزرەتی ئیسماعیل و عبداللەی باوکی.

«عبدالمطلب» تەمەنی گەییبۆ حەفتا و چەند ساڵ عبداللەش لە تەمەنی بیست و چوار ساڵیدا بوو، گوتی: وە چاکە تا خۆم ماوم ژنێکی جوان و خانەدان بۆ عبداللە بێنم، چوو داخوازی «ئامینە کچی وەهەبی» بۆ کرد و دایانێ و بە شایی و زەماوند بۆیان گواستەوە. هەر لەو سەر و بەندەشدا «هالە»ی کچی مامی ئامینەی بۆ خۆی خواست.

زۆری نەخایاند ئامینە خاتوون حامیلە بوو بە پێغەمبەر و هالەش لە عبدالمطلب حامیلە بوو بە حەزرەتی «حمزە». ڕۆژێک عبدالمطلب بە عبداللەی گوت: نزیکە خێزانت منداڵی ببێ، لەگەڵ کاروان بڕۆ بۆ شام بۆ تەدارەکی گوێزەبانە، چونکە لەو زەمانە عادەتیان وا بوو ئەگەر کوڕیان بوایە دەبوو شایی و گوێزەباتێکی زۆری بۆ بکەن.

عبدالمطلبیش دەیزانی ئامینە کوڕی دەبێ، چونکە شەوێک لە خەودا بە ئامینە

دەڵێن: موژدە بێ کوڕێکت دەبێ دەبێتە سەردار و گەورەی هەموو عالەم و ناوی محمد دەبێ.

ئەویش خەونەکە بۆ خەزوری دەگێڕێتەوە، دەڵێ ئەی ئامینە لای کەس مەی درکێنە.

عبدالله چوو بۆ شام و هەرچی پێویست بوو کڕی و لەگەڵ قافڵە گەڕایەوە بەرە و مەککە، بەڵام قەزای ڕەببانی لە گەڕانەوەدا لە نزیک شاری مەدینە نەخۆش کەوت و ناچار لای دایە ماڵی خاڵانی و وەفاتی کرد. لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا.

کاروان چی هاتنەوە خەبەری نەخۆش کەوتنی عبداللهیان گێڕایەوە؛ عبدالمطلب حارسی کوڕە گەورەی نارد بۆ مەدینە بەڵام تا حارس گەیشتە مەدینە عبدالله وەفاتی کردبوو، بە خاکیشیان سپارد بوو، حارس گەڕایەوە و هەواڵی مردنی عبداللهی برای بە هەموان ڕاگەیاند، تەواوی قورەیشی‌یان دەستیان کرد بە شین و گریان بە تایبەتی ئامینە خاتوونی دڵ پەرێشان، دەگریا و دەی لاواندەوە و بەو پارچە شیعرە و قەسیدەدا بە عبداللهی هەڵڵا دەگوت و دەی‌گوت:

فەلەک بۆ چ وات لەگەڵ من کرد لە دنیا
لە یاری خۆم جودا کردم بە تاڵی
بە عبدالله دڵم خۆش بوو لە دنیا
لە پێش چاوانی ون کردم جەماڵی
جەماڵی گەر وونە ئەمما بە مەعنی
لە بۆ من مونیسە فکر و خەیاڵی
جەوانا نامرادا بۆ چی وا زوو
ویداعت کرد لە نێو ئەهل و عەیاڵی
لە دنیادا ئەگەر لێتر جودا بوین
لە جەننەت پێم کەرەم کا حەق وساڵی
قەدی بەرزی نەمامی پڕ سەمەر بوو
حەیات و عەیشی من بوو خەت و خاڵی

دوو ئەبرۆ و چاوی مەستی خەم ڕەوێن بوون
بە جێی هێشتم لە ماڵی چۆڵ و خاڵی
کە ڕۆیشتی لە لام ڕۆحی ڕەوانم
منت سووتاند لە تاوان وەک زوخاڵی
زەلیل و بێ کەسم جەرگم بڕاوە
ژیان و عومری شیرین بوون بە تاڵی
شەو و ڕۆژی لە تاوی ڕووی جەماڵت
دڵ و گیانم وەکو نەی هەر دەناڵی
فغان و شین و واوەیلا لە دوریت
هەتیو ماوە حەبیبی زولجەلالی
درێغا بۆ جەماڵی ماهی تابان
بە بێ بابی چلۆن بێ ژین و حاڵی
نەمێنم بۆ تۆ ئەی بابێ «محمد»
لە پاش تۆ من چ لێبکەم عومر و ماڵی
لە دوری تۆ نەما عبدالمطلب
دڵی من چۆن نەسووتێتن بە حاڵی
خودا فەرمووی منم حەق دارو و غەمخوار
منم تەرتیب دەری عەقڵ و کەماڵی

خوولاسە دوو مانگ دوا مردنی عبداللە، لە وەرزی بەهاردا، لە بەیانی ڕۆژی دووشەممەی دوازدەی مانگی «ربیع الاول» و بیستی مانگی نیسانی ساڵی ٥٧١ی زاینی، دوا لە دایک بوونی حەزرەتی عیسا پێغەمبەری ئێمە لە دایک بوو.

عبدالمطلب کۆرپەی کردە مەلۆتکە و بردی تەوافی ماڵی بەیتی پێ کرد و لە ڕۆژی حەوتی لە دایک بوونی چەند سەر وشتریان سەر بڕی و تەواوی خەڵکی مەککەیان بانگ هێشتن کرد و دوای نان خواردن ناویان نا محمد. خەڵکەکە تا ئەو کاتە ئەو ناوەیان

نەبیستبو، گوتیان: ئەی عبدالمطلب ئەو ناوە چی‌یە لێت ناوە؟ بۆ لە ناوی باب و باپیرانی خۆت لات داوە؟ گوتی: بۆ ئەوەی ئەو کوڕە سپاس کراو بێ لە ئەرز و ئاسمان.

دوا ژەک پێدان و شیری دایکی ئەووەڵ ئافرەتێک شیریدا، بە پێغـەمبەر سـوویبەی کەنیزەکی ئەبولەهەب بووە، ئنجا لە بەر ئەوەی یاسا و باوی پیاوەگەورەکانی قورەیش وا بوو بۆ ئەوەی کوڕەکانیان هەوای ئازادی دەشت و دەر هەڵمژن و فێری زمانی عـەرەبی پەتی ببن، دەیان دان بە دایەن و دەیان ناردن بۆ ناو خێڵەکان، تا عومریان نەگەیشتایە شەش حەوت ساڵ نەیان دەهێناوە.

ژنانی لادێیی بۆ وەرگرتنی منداڵانی ساوا دەچوون بۆ شاری مەککە. حەلیمەی ژنی حاریسی کوڕی «عبدالعزی» دەڵێ: ئەو ساڵە زۆر گرانی بوو، باران نەباری بوو، ئێمـەش هیچمان نەبوو لەگەڵ حاریسی مێردم بڕیارماندا کە لەگەڵ ژنانی بـەنی‌ساعد بـچین بـۆ مەککە و منداڵی دەوڵەمەندێک وەرگرین، بـەڵکـو کـەس و کـاری شـتێکـمان بـدەنێ و دەستگیری‌یەکمان بکەن.

وشترێکی پیری مێمان بوو کەم‌شیر بوو، خۆشم شیرم کەم تێدا بوو، کوڕەکەی خۆم هەڵگرت و سواری حوشترەکە بووم و حاریس هەوساری ڕاکێشا و بەرەو مەککە کەوتینە ڕێ.

کە گەیشتینە شاری مەککە ژنانی بەنی‌سەعد هەر کوڕێک زانیان باوکی دەوڵەمەندە گورجێک دەیان گرت، هیچ بۆ من نەمایەوە هەتیوێک نەبێ کە ناوی محمد بـوو، دەڵێ بەڵام بە قودرەتی خوا کە چاوم پێ کەوت ڕەحم پەڕی‌یە سەر و زۆرم خۆش‌ویست، بـە مێردەکەم گوت با لە بەر ئەوەی بە دەستی بەتاڵەوە نەچینەوە ئەو هەتیوە بەرینەوە، خـۆ هیچ نەبێ لە قورەشی‌یانە، مێردەکەم بە قسەی کردم و وەرمان گرت و لە باوەشم کرد و چوینەوە مەنزڵێ.

دەڵێ لەو کاتدا مەمکەکانم پڕ بوون لە شیر، زۆرم لا سەیر بوو، مەمکی ڕاستم دایـە پێ‌ی تێری خوارد، هەر چەند کردم مەمکی چەپی نەگرت هێشتی‌یەوە بۆ کوڕەکەی خۆم، دەڵێ وەخت بۆ لە خۆشیانی گەشکە بگرم.

زانیم ئەو کوڕە دەبێتە هۆی خێر و بێر بۆمـان، دەڵێ لەوەش عـەجایبتر ئـەوە بـوو مێردەکەم چوو بە لای حوشترەکەوە بیدۆشێ بەڵکو چورە شیرێکی تێدا بێ بۆ خۆمان بیخوێن، تەماشا دەکا ئەواگوانی پڕن لە شیر، جاران چۆڕێکی تێدا دەبوو بەڵام ئەو کەڕەتە ئەوەندەی تێدا بوو پێمان تێر خواردو و لە بەریشمان مایەوە.

مێردەکەم گوتی: حەلیمە ئەو کوڕە زۆر بە خێر و سـەر بـە رزقـە. بـەیانی زوو وەڕێ کەوتین بەرەوماڵ. لە ڕێگادا وەپێش هەموو کاروانییەکان دەکەوتین، خەڵکەکە زۆریان لا سەیر بوو، گوتیان: ئەوە حوشترەکەی دوێنی نیە؟ ئەی دوێنێ بۆ هەر وەدوا دەکەوت؟

گوتمان بەڵێ ئەوە.

گوتیان بە ڕاستی زور عەجایبە، دەبێ شتێکی زۆر گرنگ ڕوی دابی یان ڕو بدا.

حەلیمە دەڵێ چوینەوە هۆزی بەنیسەعد خوا وەت حەسێنی لە سایەی مـحمدەوە شەو و ڕۆژ خێر و بەرەکەتمان بە سەردا دەڕژا، خەڵک حەسودی پێ دەبردین.

محمدیش لە نۆ مانگێرا کەوتە قسەکردن، بە منداڵی قەت خۆی پیس نەدەکرد، قەت بیانو و گڕوی نەدەگرت وەک منداڵان، زۆر ڕوخۆش و خوێن گەرم بوو، دوا پێنج سـاڵ حەلیمە دەیباتەوە بۆ مەککە بۆ لای دایکی، دایکی کە چاوی پێ دەکەوێ لە خۆشیانی گەش دەبێتەوە لە باوەشێی دەگرێ و بە خۆیەوە دەگوشی و تا تێر دەبێ ماچی دەکا.

ئنجا بە پێی توانا پاداشت دەدا بە حەلیمە و خواحافیزی لێک دەکەن. یەکێک لەو شتە عەجایبانەی کە دەلالەتیان دەکرد، لە سەر گەورەیی پێغـەمبەر ئـەوە بـوو، نـاوی بـاوکی «عـبدالله» بوو دەلالەتی دەکرد لە سەر بـەندەگـی و تـەوحید، نـاوی دایکـی ئـامینە بـوو دەلالەتی دەکرد لە سەر ئەمینی، ناوی سوبیە کە شیری دایە دەلالەتـی دەکـرد لە سـەر سەواب، ناوی حەلیمە دەلالەتی دەکرد لە سەر حیلم: ئومو ئەیمەن کە بەخێوی دەکـرد دەلالەتی دەکرد لە سەر یۆمن و بەرەکەت.

ئنجا پـێغـەمبەر لە تـەمەنی شـەش سـاڵیـدا بـوو کـە ئـامینە خـاتونی دایکـی لەگـەڵ ئوموئەیمەن بردنی بۆ مەدینە بۆ ئەوەی دیدەنی خاڵەکانی عبدالمطلب بکەن و بچنە سەر گۆڕی عبداللهی جوانەمەرگ و پێغەمبەر چاوی بە گۆڕی باوکی بکەوێ، بێ ئەوەی ئاگایان

لەوەبێ کە شاری مەدینە دەبێتە گۆڕستانی ئەمانیش، بەڵام عبداللە بۆتە پێشەنگی قافڵەیەکی گەورە و قەزا و قەدەر بە قەڵەمی قودرەت نەخشەیەکی سەر سوڕهێنەری کێشاوە.

لە پاش مانگێک مانەوە لە مەدینە بەرەو مەککە گەڕانەوە، لە ڕێگەدا لە ئاوایی ئەبواء کە کەوتبۆ بەینی مەککە و مەدینە ئامینە خاتوونی دایکی نەخۆش کەوت و کۆچی دوایی کرد و لەوێ تەسلیم بە خاک کرا، دووبارە پێغەمبەر بێ ناز بۆوە، ئومومئەیمەن پێغەمبەری هێنایەوە بۆ مەککە.

عبدالمطلب کەوتە لاواندنەوەی لە هەموو کوڕەکانی خۆشتر دەویست، لەگەڵ خۆی دەنواند، لەگەڵ ئەوی نان دەخوارد، لە تەنیشت خۆی دای دەنا، زۆر جار دەی‌گوت بە خوا ئەم کوڕەم زۆر خۆش دەوێ، چونکە وا دیارە پاشە ڕۆژێکی زۆر ڕوونی دەبێ.

قەزا و قەدەر جارێکی دیش پێغەمبەریان بێ ناز کرد و لە پاش دوو ساڵ باپیریشی کۆچی کرد.

ئنجا ئەبوتالیب پێغەمبەری بردە لای خۆی و سەرپەرستی دەکرد و زۆری خۆش دەویست، پێغەمبەر لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا بوو کە ئەبوتالبی مامی لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ وولاتی سوری‌یە و شام، ڕۆیشتن تا گەینە نزیک شاری بەسرا لە خوارووی شامەوە کە ئێستا بەو شارە دەڵێن شاری حۆران. لە بن داریک باریان خست و ئالیکیان بۆ وڵاغان تێ کرد و خەریکی ئیسراحەت بوون لە بەرامبەر ئەو دارە کلیسا و ئەشکەوتێک بوو بووحەیرای راهیب چەند ساڵ بوو لەوێ خواپەرستی دەکرد.

لە کتێبی خۆیاندا دی‌بووی کە لە فلان ساڵدا ئەو پێغەمبەرەی کە لە مەککە پەیدا دەبێ ڕێگای دەکەوێتە بن ئەو دارە، هاتبو دەی ڕوانی، کە تەماشای کرد ئەوا کاروانێک لە لای مەککە ڕاهات و باری‌یان داخست، بە ئەمری خوا هەورێک سێبەری کرد لە سەریان و لەنگەری گرت.

بوحەیرا زانی کە پێغەمبەری ئاخر زەمان لەگەڵ ئەو کاروانەیە پیاوێکی نارد و گوتی عەرزیان بکە من خەڵکی مەککەم زۆر خۆش دەوێ، دەبێ میوانی من بن. گوتیانْ باشە.

ئەبو تالیب پێغەمبەر و نۆکەرێکی لای بار و حوشترەکان بە جێ هێشت و چوون بۆ لای بوحەیرا.

بوحەیڕا پێشوازی‌یەکی گەرمی لێ کردن و زۆری بە خێرهاتن کردن.

نان دانرا و دەست کرا بە نان خواردن بوحەیرا هەر سەرنجی دەدان و چاوی دەگێڕا، بەڵام ئەوەی دەی‌ویست وە بەر چاوانی نەدەکەوت.

هاتە دەرەوە تەماشای کرد هەورەکە هەر لە سەر دارەکە لەنگەری گرتووە، هاتە ژور و گوتی: ئەرێ کەستان لای بارەکان بە جێ هێشتووە؟ گوتیان: بەڵێ، کوڕێک و نۆکەرێکمان بە جێ هێشتوون، گوتی: دەبێ بانگیان کەی ئەوانیش بێن نان بخۆن، چوون بانگیان کردن بوحەیڕا کەوتە سەرنج‌دان و لێ ورد بوونەوە لە پێغەمبەر، ئەو ناو نیشانانەی کە لە کتێبەکانی خۆیاندا هەڵدرا بوون لەویدا چاوی پێ کەوتن.

ڕووی کردە ئەبوتالیب و گوتی: ئەو کوڕە چیتە وا دیارە باوک و دایکی نەماون، گوتی: بەڵێ برازامە و باوک و دایکی مردون، بوحەیڕا گوتی: ڕاست دەکەی، بەڵام ئەی ئەبوتالیب ئامۆژگاریت دەکەم بە قسەم بکە ئەو کوڕە مەبە بۆ شام، چونکە جوولەکە دوژمنی ئەو کوڕەن ئەگەر چاویان پێ بکەوێ و بیناسن هەوڵی لە بەین بردنی دەدەن.

ئەو کوڕە دەبێتە پێغەمبەر. ئەبوتالیب بە قسەی کرد و لە شاری حۆران شت و مەکی کڕی و گەڕایەوە.

پێغەمبەری ئێمە وەکو زوربەی پێغەمبەران دەردی سەری دیوە و شوانیشی کردووە و مەڕ و ماڵاتی لەوەڕاندووە، هەروەکو ئەبوهورەیرە دەڵێ پێغەمبەر فەرمووی: هیچ پێغەمبەریک نەبووە شوانی نەکردبێ و مەری نەلەوەڕاندبێ، ئەسحاب عەرزیان کرد قوربان جەنابیشت؟ فەرمووی: بەڵێ منیش مەڕم لەوەڕاندوە.

لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا لەگەڵ زوبەیری مامی چوو بۆووڵاتی یەمەن.

لە تەمەنی پازدە بیست ساڵیدا بوو کە شەڕی مەشهور بە شەڕی «فیجار» لە بەینی قوڕەیشی‌یەکان و قەبیلەی «قەیس» ڕوی‌دا و پێغەمبەریش بەشداری دەو شەڕەدا کرد.

جا ئەوە بوو کە لە پاش شەڕی فیجار قوڕەیشی‌یەکان لە ماڵی عبداللەی کوڕی جودعاندا کۆ بوونەوەیەکیان کرد و پەیمانی «حەلەفول فزولیان» بەست و بڕیاریان دا کە دادگەری بڵاو بکەنەوە و نەهێڵن کەس زوڵمی لێ بکرێ.

پێغەمبەریش بەشداری ئەو پەیمانەی کرد و بە تایبەتی گەنج و لاوەکانی قوڕەیش بە سەرکردایەتی پێغەمبەر سپایەکیان ڕێک خست.

چوون ماڵی بەیتیان بە ئاوی زەمزەم شت و ئاوەکەیان خواردەوە کە جێگای سوێندیان بوو، بڕیاریاندا کە دادی هەموو مەزڵومێک بپرسن.

جارێک ئەبوجەهل کاڵایی لە بازرگانێکی خارخی کڕی پارەکەی نەدەدایە. پێغەمبەر خەبەری زانی چۆ سەر ئەبوجەهل و گوتی: هەر ئێستا پارەی ئەو بازرگانە بدە ئەبوجەهل خۆی بۆ ڕانەگیرا و پارەکەی دایە کابرا.

بە سپاو لشکری «حلف‌الفضول» پێغەمبەر گۆڕانێکی گەورەی لە مەککەدا پەیدا کرد.

لە پێش ئەوەشدا خەڵک زۆریان خۆش دەویست. سەر ڕاست بوو بە عەهد و وەفا بوو، درۆزن نەبوو، ڕوو خوش بوو، لە بەری ئەوەی خەیانەتی نەدەکرد ناویان نابو «محمد امین».

تا تەمەنی گەییە بیست و پێنج ساڵی، بەکرێ پارەی قەیسی کوڕی زەیدی دەگێڕا. ڕۆژێک ئەبوتالیب بانگی کرد گوتی: ئەی برازای خۆشەویستم من دەست کورت و خێزان دارم پارەی قەیس بەشمان ناکا! خەدیجە ناوبانگی ڕاستی و ئەمینی تۆی زانی‌وە وەڵامی ناردووە و گوتویەتی: ئەگەر محمد سەرپەرستی کاروانم بۆ بکا دوو قاتی خەڵکی پارەی دەدەمێ.

دەڵێی چی بچم بۆ لای و بڵێم باشە؟

پێغەمبەر فەرمووی: ئەی مامی خۆشەویست زۆر باشە.

جا با لێرەدا هەموو لایەک بە خوا بسپێرین و ئەگەر ماین سبەینێ دەچینەوە خزمەتیان.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

## ٤

# حەزرەتی موحەممەدی موستەفا

## باسی «حەزرەتی موحەممەدی موستەفا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ مَنْ تَبِعَهُمْ بِاِحْسٰانٍ اِلىٰ يَوْمِ الدِّينِ.

موسوڵمانینە با بچینەوە سەر باسی بەسەرهاتی پێغەمبەر و پەند و ئامۆژگاری لێ وەر گرین. گوتمان ئەبوتالیب بە پێغەمبەری گوت خەدیجە وەڵامی ناردوە ئەگەر بە قسەم بکەی دەچم دەڵێم باشە و پێغەمبەر فەرمووی: چی بڵێی بە قسەت دەکەم.

ئەبوتالیب هەستا چوو بۆ لای خەدیجە و قەوڵ و قەراریان کرد. خەدیجە چەند حوشتری بار کردن و خوزەیمەی برازای و نۆکەرێکی بە ناوی مەیسەرە دەگەڵ خست و کاروانەکەی تەسلیم بە پێغەمبەر کرد و لەگەڵ قافڵەی قورەیشی یان بەرەو سوری یە کەوتنە ڕێ.. کاروان بە سەلامەتی چۆ شام و کاڵای خۆیان فرۆشت و شتی هەرزانیان کڕی و گەڕانەوە.

لەو سەفەرەدا سودو وقازانجێکی زۆری بۆ خەدیجە هێنایەوە خەدیجە بە دڵ عاشقی جەماڵی محمد بوو، مەیسەرەی بانگ کرد ئەحواڵی پێغەمبەری لێ پرسی. مەیسەرە گوتی: پیاوەتی و ڕاستی و ئەمینی محمد بە زمان بەیان ناکرێ؛ خەدیجە ئەوەندەی دیش عاشقی بوو. خەدیجە دوو مێردی دەوڵەمەندی کردبوو، میراتی زۆری دەست کەوتبوو، پیاو ماقووڵی قورەیشی زۆریان تەماع دە سەروەتەکەی کردبوو، زۆریان داوا دەکرد شوی پێ نەدەکردن، تەمەنی گەیبۆ چل ساڵە کە عاشقی جەماڵی پێغەمبەر بوو، تەمەنی حەزرت بیست و پێنج ساڵ بوو. ڕۆژێک بە مەیسەری نۆکەری گوت: بچۆ محمد بدوێنە داخوا ژن ناهێنی؟..

مەیسەرە چوو بە پێغەمبەری گوت ئەوە بۆ ژن ناهێنی؟ فەرمووی: ئاخر مامم دەست کورتە دەبێ یارمەتی بدەم: ئەگەر ژن بێنم یارمتیم بۆ نادری. مەیسەرە گوتی: دەزانی خەدیجە عاشقت بووە و دەیهەوێ شوت پێ بکا؟

فەرمووی: جا چۆن خەدیجە مێرد بە من دەکا. تا ئێستا ئەو هەمو بازرگانانە ناردویانەتە سەر جوابی نەداوەتەوە؟ مەیسەرە چۆوە ئەو گفتوگۆیەی بۆ خەدیجە گێڕایەوە.

دوبارە خەدیجە خۆی بۆ ڕانەگیرا و ئافرەتێکی بە ناوی نفیسە وە نارد بۆ لای و ئافرەتەکە گوتی: ئەی محمد بۆ چی ژن ناهێنی؟...

فەرمووی: دەستم ناڕوا ژن بێنم، گوتی: ئەگەر ژنێکی دەوڵەمەند حەزت لێ بکا مارەی دەکەی؟.. فەرمووی: جا ژنی دەوڵەمەند چۆن حەز لە پیاوی فەقیر دەکا؟.. گوتی دەنا خەدیجە زۆرت حەز لێ دەکا و زۆری پێ خۆشە مارەی کەی، فەرمووی: ئەگەر وابێ منیش حەز دەکەم. نەفیسە هاتەوە و قسەکانی بۆ خەدیجە گێڕانەوە و کارەساتیان بە ئەبو تالیب ڕاگەیاند و هەستا چوو بۆ لای عەمری کوڕی ئەسەدکە مامی خدیجە بوو خوازێنی لێ کرد و خواستیان و پێنج سەد درهەمیان کردە مارەیی و مارەیان کرد، بە ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم و شاییکی زۆر خۆشیان کرد و پێغەمبەر چۆ سەر ماڵی خەدیجە.

تا خەدیجە لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا وەفاتی کرد زۆر خۆشیان ڕابوارد و تا ئەو وەفاتی نەکرد ژنی‌تری نەهێنا لە خەدیجە دوو کوڕ و چوار کچی بووە کە بریتی بوون لە قاسم و عبدالله و زەینەب روقیە ئومکەلسوم فاتمە.

دەڵێن ئاگرێک لە مەککە کەوتەوە و کەعبەی سووتاند، لافاوێکی گەورەش هەستا و دیوارەکانی ڕوخاند؛ هەر دە تائیفەکەی قورەیشی کۆ بونەوە، بڕیاریاندا ماڵی بەیت چاک بکەنەوە. لەو کاتەدا بازرگانێکی ڕۆمـی لە ئـەستەنبووڵەوە بـەرەو یـەمەن کـەوتبۆ ڕێ. لە بەندەری جەددە کەشتی‌یەکەی لە قوڕێ چەقیو لەنگەری گرت. سەرنشینەکان خـۆیـان گەیاندە مەککە و ئەو خەبەرەیان بڵاو کردەوە. کەشتی‌یەکەش پڕ بوو لە بەردی مەڕمەڕ و خشتی کـاشی و داری بـاش. دەیـان بـردن بـۆ یـەمەن کـلیسایان پـێ دروست بکـەن و وەستایەکی زۆر باشیشیان لەگەڵ بوو.

قوڕەیشی‌یەکان چوون بۆ لای خـاوەنی کـەشتی‌یەکـە و گـوتیان: خـۆ تـازە نـاتوانـی کەشتی‌یەکە وەگەڕ بخەی. ئەگەر هەر واش وەمێنی غەرقتر دەبێ، ئەو دار و بەردە بە مە بفرۆشە با ماڵی بـەیتیان پـێ دروست بکـەینەوە. وەسـتاکـەشت بـۆمـان دانـێ، هـەموو ئەسبابەکەیان کڕی و وەستاکەیان برد دەستیان کرد بە دیوار نان، تاگەیشتە ڕاستی جێگای بەردی «الحجرالاسود» لە سەر دانانی لێیان بو بە ناخۆشی هەر تائیفەی دەیگوت: بۆ خۆم دای دەنێم، تا ئەبوئومەییەی کوڕی موغەیرە کە لە هەموان ڕیشی سپی‌تر بووگوتی: بڕیار بدەن کە یەکەم کەس لە لای سەفاوە هاتە ژورەوە بیکەن بە حەکەم و بە قسەی ڕازی بن، گوتیان: باشە ئەوا بڕیارماندا.

بە ئەمری خوا یەکەم کەس کە هاتە مزگەوت پێغەمبەر بوو، هەمووانیان گوتیان: لەوە باشتر و ئەمین‌ترمان دەست ناکەوێ فەرمووی: جاجمێکم بۆ بێنن. هـێـنـایان پـێغـەمبەر جاجمەکەی ڕاخست و بەردی حەجەرول ئەسوەدی لە ناوە ڕاستێدا دانا و بانگی دە پیاو ماقوڵی لە هەر دە تائیفە کرد و هاتن و فـەرمووی: هـەر کـەس لە لایـەک گـۆشـەیەکـی جاجمەکە بگرێ و گرتیان و فەرمووی: بەرزی کەنەوە! بەرزیان کردەوە تا گەییە ڕاسـتی جێگای بەردی «حجرالاسود» پێغەمبەر دەستی بـرد و لە جـێگـای جـارانـی دانـایەوە و کۆتایی بە ناکۆکی‌یەکەیان هێنا و ئەو ئاگرەی کوژاندەوە.

زۆر لە پیاو ماقوولەکانی قوڕەیشی ساڵی مانگێ کیان تەرخان دەکـرد و دەچـوون لە جێگایەکی چۆڵ دەمانەوە.

پێغەمبەریش هەموو ساڵێک لە مانگی ڕەمەزاندا دەچۆ ئەشکەوتی حیرا لە سەرکێوی نور و بیری لە کەون و کائنات دەکردەوە وە دەستی کرد بە خەو بینین و هەر خەونێک دەیدی، وەک ڕۆژ وەڕاست دەگەڕا تا شەوێک کە لە تەمەنی چل ساڵیدا بوو، لە غاری حەڕادا، لە بەینی خەو و بێداریدا بوو، لە نکاو یەکێک توروند بە خۆیەوە گوشی و پارچەیەکی نیشان دا و گوتی: وەخوێنە، دەفەرمووێ: منیش گوتم: ئاخر خوێندەوار نیم؟ دووبارە ڕای گوشیمەوە و گوتی: بخوێنەوە هەر گوتم ئاخر نەخوێندەوارم چ بکەم؟ بۆ جاری سێیەم توندتر گوشیمی و زۆر ترسام ئەو ئایەتەی بۆ خوێندمەوە کە خوا لە قورئاندا دەفەرمووێ:

﴿اِقْرأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذي خَلَقَ﴾. ﴿خَلَقَ الْاِنْسانَ مِنْ عَلَقٍ﴾. ﴿اِقْرَأْ وَ رَبُّكَ الْاَكْرَمُ﴾. ﴿اَلَّذي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ﴾. ﴿عَلَّمَ الْاِنْسانَ مالَمْ يَعْلَمْ﴾.(١)

دەفەرمووێ: بە ئەمری خوا وەک نەقش لە دڵمدا جێ‌گیر بوون و هاتنە بەرم.

ئنجا پیاوەکە گوتی: من جوبرەئیلم موژدە بێ خوا تۆی کرد بە پێغەمبەری ئاخر زەمان.

ئەوەی گوت و لە پێش چاوانم وون بوو، دەفەرمووێ: منیش زۆر ترسام و نۆبەتێ دایگرتم و گەڕامەوە بۆ ماڵ.

حەزرەتی خەدیجە دەفەرمووێ: کە هاتەوە زۆر تێک چووبوو، فەرمووی: نۆبەتیم هاتۆتێ دام پۆشن. دەڵێ منیش دامپۆشی تا هاتەوە سەرخۆ تەواوی بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە و فەرمووی: زۆر دەترسم، دەڵێ منیش گوتم: مەترسە خوا تووشی خەراپەت ناکا چونکە چاکە و پیاوەتیت زۆرە، بەڵام وەرە لەگەڵم با بچین بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفلی ئامۆزام بۆی وەگێڕە. ئەو پیاوێکی زانایە و شارەزای ئینجیلی عیسای پێغەمبەرە. بزانین دەڵێ چی؟

دەڵێ هەستاین چوین بۆ لای لە ماڵەوە، پیر و کوێر ببوو، بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، وەرەقە گوتی: ئەی محمد موژدە بێ ئەو پیاوە ئەو مەلائیکە بووە کە موژدەی داوە بە پێغەمبەران.

(١) العلق: ١ ـ ٥.

گوتی: خۆزگە لەو کاتەدا کە تۆ داوای پێغەمبەری دەکەی و خزمەکانت دەرت دەکەن من گەنج بومایە و لە سەرم بکردی‌یایەوە.

پێغەمبەر فەرمووی: بۆچی دەرم دەکەن؟ گوتی: بەڵێ! هیچ پێغەمبەرێک نەبووە داوای پێغەمبەری کردبێ و دوژمنایەتیان نەکردبێ.

ئنجا زۆر بە دڵخۆشی گەڕاینەوە زۆربەی شەوان بۆ بیر کردنەوە دەچۆ ئەشکەوتی حەڕا بەڵام مەلائیکەتەکەی نەدەهاتەوە لا بەوە زۆر ناڕەحەت بوو، تا شەوێک لە غاری حەڕادا بەرماڵکەی بە خۆدا دەدا و ڕادەکشێ، بەڵام خەوی لێ ناکەوێ. گوێی لە دەنگی حەزرەتی جوبرەئیل بوو فەرمووی: تۆ پێغەمبەری و من جوبرەئیلم بۆ بەیانی زۆر بەڕوو خۆشی هاتەوە و بە دزی دەستی کرد بە بانگ کردن بۆ خواپەرستی.

تا لە ساڵی ٦١٠ زایینیڕا تا ساڵی ٦١٣ واتە بە سێ ساڵ حەزرەتی خەدیجەی خێزانی و حەزرەتی عەلی و زەیدی کوڕی حارسە و لە پاشان حەزرەتی ئەبوبەکر موسوڵمان بوون...

خەبەری داواکردنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر بڵاو بۆوە و خەڵک زانیان بەڵام زۆریان مەتڵەب نەبوو. بە ڕیوایەتێک تا چل ڕۆژ و بە قسەی هێندێکیان دە مانگ و بە قەولی زوربەی مێژونوسان تا سێ ساڵ وەحی بۆ پێغەمبەر نەهات و هیچ ئایەت نازڵ نەبوو کافرەکان دەیان گوت: خوا لە محمد ڕووی وەرگێڕاوە.

تا ڕۆژێک حەزرەتی جوبرەئیل سورەی «والضحىٰ»ی بۆ هێنا و وەحی دەستی پێ کردەوە و پێغەمبەر گەشایەوە. حەزرەتی ئەبوبەکر کە موسوڵمان بوو دەستی کرد بە بانگ کردنی خەڵک بۆ سەر دینی ئیسلام، ئەوانەی کە بە قسەی حەزرەتی ئەبوبەکر هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر و موسوڵمان بوون بریتی بوون لە عوسمانی کوڕی عەفان و زوبەیری کوڕی عەوام و عبدالرحمن کوڕی عەوف و سەعد کوڕی ئەبیوەقاس و تەلحە کوڕی عبیداللە.

تا ماوەی دوو سێ ساڵ هەر بە نهێنی ئاینی‌یان بڵاو دەکردەوە تا خواوەندی گەورە ئەو ئایەتەی سورەی «الشعراء»ی ناردە خوارەوە بە حەزرەتی جوبرەئیلدا کە دەفەرمووێ:

﴿وَ اَنْذِرْ عَشیرَتَكَ الْاَقْرَبینَ﴾.(١)

واتە خزمە نزیکەکانت بانگ بکە بۆ سەر ئایینی ئیسلام و بیان ترسێنە لە غەزەبی خوا. پێغەمبەر زوو حەزرەتی عەلی بانگ کرد فەرمووی: ئەی عەلی بانگ هێشتێکی مام و ئامۆزاکان و خزمەکان بکە و نان و چێشت حازر بکە، نان و چێشت لێ نرا و هەموویان بانگ هێشتنەوە کردن. نان خورا و پێغەمبەر هەستا و فەرمووی: ئەی خزمینە داواتان لێ دەکەم وەرنە سەر دینی ئیسلام و بترسن لە عەزابی خوا، ئەبولەهەبی مامی بە توڕەییەوە ڕاست بۆوە و گوتی: داماوی بۆ تو ئەی محمد، هەر بۆ ئەوەت کۆ کردوینەوە؟.. پێغەمبەر بە هەڕەشە و توڕەبونی مامی زۆر دڵ تەنگ بوو، بەڵام خوای گەورە لە باتی ئەو جوابی دایەوە و فەرمووی:

﴿تَبَّتْ یَدٰا اَبی لَهَبٍ وَ تَبَّ﴾.(٢)

یا خوا دوو دەستەکەی ئەبولەهەب بە هیلاک بچن و داماو بێ، ئەو ڕۆژە بڵاوەیان کرد، ڕۆژێکی دی پێغەمبەر لە حەوشی کەعبەدا بە دەنگی بەرز فەرمووی: خەڵکینە بەیانی هەمووتان لە کێوی سەفا کۆ وەبن، شتێکی گرنگتان بۆ باس دەکەم.

بۆ بەیانی تەواوی خەڵکی مەککە لە کێوی سەفا کۆبوونەوە، ڕوی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ئەگەر باسی شتێکتان بۆ بکەم باوەڕم پێ دەکەن؟ زۆربەیان گوتیان بەڵێ، چونکە تا ئێستا درۆمان بە تۆوە نەدیوە. فەرمووی: بزانن خواوەندی گەورە منی کردوە بە پێغەمبەر تا بانگتان کەم بۆ سەر ئایینی ئیسلام. دوبارە ئەبولەهەبی مامی ڕاست بۆوە ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: کەس باوەڕی پێ نەکا. عەقڵی لە سەر خۆ نەماوە خەڵکەکە لە ترسی ئەبولەهەب بڵاوەیان لێ کرد، حەزرەتی عەلی و زەیدی کوڕی حارسە نەبێ کەسی لانەما.

ئنجا قوڕەیشی‌یەکان کە زانیان دینی ئیسلام پەرەدەستێنێ و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خەڵک زیاتر و زۆرتر موسوڵمان دەبن. دەستیان کرد بە ئازاردانی پێغەمبەر و موسوڵمانەکان بەرد بارانیان دەکردن، لێیان دەدان، جنێویان پێ دەدان، بە تایبەتی خزمەکانی ئەوەندەیان

---

(١) الشعراء: ٢١٤. (٢) المسد: ١.

پێغەمبەر نارەحەت دەکرد. ڕۆژێک ڕووی کردە ئاسمان و فەرمووی: ئەی خوای گەورە خۆت دەزانی خزمەکانم دەستم لێ هەڵ ناگرن و ئیمان ناهێنن.

حەزرەتی جوبرەئیل هات و ئەو ئایەتەی سورەی «الحجری» بۆ هێناکە خوا دەفەرمووێ:

﴿فَاصْدَعْ بِمٰا تُؤْمَرُ وَ اَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ﴾.(١)

ئەوەی لە لای خواوە پێ دەکرێ ئاشکرای بکە و گوێ مەدە ئازاری کافرەکان.

﴿اِنّٰا كَفَيْنٰاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ﴾.(٢)

ئەوانەی نارەحەتت دەکەن حەواڵە بە ئێمەیان بکە.

﴿وَ لَقَدْ نَعْلَمُ اَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمٰا يَقُولُونَ﴾.(٣)

بە ڕاستی ئێمە دەزانین سینگی تۆ بە قسەی وان وەتەنگ هاتووە.

﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتّٰى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾.(٤)

تا ماوی لە دنیادا وەزیفەی خۆت بە جێ بێنە و دەست هەڵ مەگرە و گوێ مەدە کەس، بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کافرەکان زیاتریان ئەزیەت دەدا. ڕۆژێک ئەبوجەهل گوتی: ئەی محمد لەو ڕۆ بە دواوە نابێ بە بێ ئیجازەی من بێتەماڵی بەیت و نوێژ بکەی! پێغەمبەر فەرمووی: ماڵی بەیت ماڵی خوایە و ئیجازەی کەسی ناوێ، ڕۆژی دوایی پێغەمبەر چۆ ماڵی بەیت دەستی کرد بە نوێژ و ئەبوجەهل بەردێکی زلی هەڵگرت خەریک بوو بە سەری دادا. بەڵام خوا ترسی خستە دڵەوە و نەوێرا. جارێک لە نوێژدا چەرمە خاویان بە سەردا دەدا، کەڕەتێک بەرماڵی‌یان دەمل کرد و بایاندا خەریک بوون بی‌خنکێنن.

بەڵام پێغەمبەر خۆی بۆ ئەو هەموو سزا و ئازارە ڕادەگرت. روقیە و ئوموکەلسومی دابوو بە عەتبە و عوتەیبەی کوڕی ئەبولەهەب مامی. ئەبولەهەب هەردووکی پێ تەڵاق دان و ناردنیەوە بۆ ماڵی پێغەمبەر.

جارێکی دی ئەبوجەهل کافرێکی نارد ورگە حوشترێکیان هێنا؛ پێغەمبەر لە سوجدەدا بوو هاویشتی‌یە سەر پێغەمبەر، کەس لە ترسی ئەبوجەهل نەوێرا لە سەری لابا.

---

(١) الحجر: ٩٤. (٢) الحجر: ٩٥. (٣) الحجر: ٩٧.
(٤) الحجر: ٩٩.

تا فاتمەی کچی هات لە سەری لا برد، ئازار دانی ئەسحابەکانیشی وە نەبێ لە ئی خۆی کەمتر بوبێ، بە تایبەتی ئی حەزرەتی ئەبوبەکر و بیلالی حەبەشی و یاسر و عەمماری کوڕی و سمیەی خێزانی یاسەر. لێیان دەدان، دەم و چاویان داغ دەکردن، لە بەر گەرمای نیوەڕۆ سەنگە و بەردی‌یان دەکردن.

بۆ ئەوەی دەست لە دینی ئیسلام هەڵگرن، بەڵام دینی ئیسلام دڵی ڕوناک کردبونەوە دەربەست بە کوشتنیش نەبوون. ئەبوجەهل سمیەی کەنیزەکی کە خێزانی یاسەر بوو بردە ماڵی بەیت و لە پێش چاوی خەڵک کوشتی، یاسەری مێردیشی لە ژێر داردا مرد.

ئەووەڵ پیاوێک کە لە ڕێی ئیسلامدا شەهید کرا حارسی کوڕی حەزرەتی خەدیجە بوو لە مێردەکەی پیشووی، کافرەکان لە ماڵی بەیت لە سوجدەدا کوشتیان.

ڕۆژێک پێغەمبەر لە کێوی سەفا بوو؛ ئەبوجەهل چوو زۆری جنێو پێ دان. پێغەمبەر دەنگی نەکرد. ئەبوجەهل هاتەوە «نادی» بۆ کافرەکانی گێڕایەوە لەو کاتەدا حەمزەی مامی پێغەمبەر لە ڕاو هاتەوە چوو بە دەوری کەعبەدا گەڕا، تووشی ئافرەتێک بوو گوتی: ئەی حەمزە ئەگەر ئاگات لە محمدی برازات دەبوو کە ئەبوجەهل چ جنێوێکی پێ دەدان؟.. حەزرەتی حەمزە ڕقی هەستا و چۆ سەر ئەبوجەهل و کەوانێکی بە سەر سەری‌دا دا سەری شکاند و گوتی: ئەی نامەرد قسە بە محمد دەڵێ‌ی؟ دە ئەوا من چوومە سەر دینی محمد«اشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمداً رسول‌الله» جا ئەوەی پیاوە قسە بکا.

ئەبوجەهل کەوتە پاڕانەوە، پێغەمبەر بەو خەبەرە زۆر دڵخۆش بوو، بەڵام کافرەکان زۆر ناڕەحەت بوون، چونکە حەزرەتی حەمزە پاڵەوانێک بوو لە پاڵەوانەکانی قوڕەیش.

پێغەمبەر بەو کارە ناڕەوایانەی کافرەکان لەگەڵ موسوڵمانەکاندا دەیان کردن زۆر ناڕەحەت بوو، ڕۆژێک کوی کردنەوە و فەرمووی: وام پێ باشە بەرەبەرە کۆچ بکەن بۆ حەبەشە. بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە یازدە پیاو و چوار ئافرەت چوون سواری کەشتی بوون و چون بۆ حەبەشە بوونە پەناهیندە. «نەجاشی» پاشای حەبەشە زۆری بە خێر هاتن کردن و زۆری حورمەت لێ گرتن.

هەروەها موسوڵمانەکان یەک یەک و دوو دوو کۆچیان کرد تا ژمارەیان گەیشتە هەشتاو و سێ پیاو و هەژدە ئافرەت.

کافرەکان بەکۆچ کردنی موسوڵمانەکان زۆر ناڕەحەت بوون و زۆریان پێ ناخۆش بوو، کەوتنە مقۆمقۆ و ڕاوێژ کردن بۆ گەڕاندنەوەی موسوڵمانەکان. وەفدێکیان ڕێک خست بچن بۆ لای پاشای حەبەشە داوای موسوڵمانەکان بکەنەوە.

جا با لێرەدا ئێوە و موسوڵمانەکان بە خوا بسپێرین ئەگەر عومر وەفای کرد بەیانی دەچینەوە سەر باقی باسەکە.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

٣

# حەزرەتی موحەممەدی موستەفا

## باسی «حەزرەتی موحەممەدی موستەفا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْاَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلينَ وَ عَلىٰ مَنْ تَبِعَهُمْ بِاِحْسٰانٍ اِلىٰ يَوْمِ الدّينِ.

لە کۆڕی دوێنێدا گوتمان وەفدێکیان بە دیاری زۆرەوە نارد بۆ لای پاشای حەبەشە، بە سەرکردایەتی «عەمری کوڕی عاص» و «عبداللەی کوڕی ڕەبیعە» کە زۆر زانا و بەلیمەت و فێڵباز بوون.

چوون بۆ حەبەشە ولە پاش خۆناساندن بە پاشاگوتیان: ئەی پاشا کۆمەڵێک لە نۆکەر و غوڵام و کەنیزەک ئایینی باب و باپیریان وەلاناوە و شێت بوون و ئایینێکی تازەیان داهێناوە. کەس و کاریان ئێمەیان ناردووە بۆ خزمەت جەنابت بمان دەیەوە بیان بەینەوە.

پاشان گوتی: بانگیان نەکەم نەیان دوێنم ناتان دەمەوە و ناردی بە شوێنیاندا هاتن پاشا بوی تێ کردن گوتی: بۆ ڕاتان کردووە؟ ئەو ئایینە چی‌یە داتان هێناوە؟ جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب گوتی: ئەی پاشا ئێمە گەلێکی نەزان و بتپەرست بووین.

مردارەوە بومان دەخوارد و داوێن پیس بووین. سیلەی ڕەحممان بە جی نەدەهێنا، دراوسێ یەتیمان نەدەزانی، دەوڵەمەندمان ستەمی لە دەست کورت دەکرد، تا خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردین، بانگی کردین بۆ خواپەرستی و واز لە بتپەرستی بێنین داوای لێ کردین کە درۆ نەکەین ڕاستگۆ بین، سەر لە خزمان بدەین و خراپە نەکەین، ئەمین بین و خەیانەت نەکەین.

ئێمەش باوەڕمان پێ کرد و ئیمانمان پێ هێنا!.. جا لەبەر ئەوەی خزمەکانمان کەوتنە دەست درێژی کردن بۆ سەرمان و ئازاریان دەداین بۆ ئەوەی بمان گێڕنەوە سەر بت پەرەستی و ئێمەش پەنامان بۆ تۆ هێنا،... نەجاشی گوتی: باشە لەو کتیبە کە لە لای خواوە بۆتان هاتۆتە خوارەوە هیچت لە بەرە بۆم وەخوێنی؟...

جەعفەر گوتی: بەڵی، دەستی کرد بە خوێندنەوەی سورەی «مریم» تا گەیشتە:

﴿وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَ يَوْمَ اَمُوتُ وَ يَوْمَ اُبْعَثُ حَيًّا﴾.(١)

نەجاشی و قەشەکان زۆریان پێ خۆش بوو گوتیان: بە خوا ئەو دینەش هەر لەو سەرچاوەوە هاتووە کە ئینجیل و دینی عیسای لێ وەهاتۆوە ئنجا ڕوی کردە وەفدەکە و گوتی: بڕۆنەوە تازە ئەوانەتان نادەمەوە وەفدی قوڕەیشی‌یەکان بە دڵساردی و دەست بەتاڵی گەڕانەوە.

ڕۆژێک قوڕەیشی‌یەکان لە دارونەدوە کۆ بوونەوە و گوتیان: ئەگەر فریا نەکەوین دینی محمد پەرە دەستێنێ و بێ‌حورمەتمان دەکەن. عومەری کوڕی خەتاب ڕاست بۆوە و دەستی دایە شمشیر و گوتی: هەر ئێستا دەچم محمد دەکوژم.

لەو کاتەدا پێغەمبەر و حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عەلی و ئیمامی حەمزە و چەند ئەسحابی دی لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی مەخزوم بۆ نوێژکردن کۆ ببونەوە، لە ڕێگادا تووشی نەعیمی کوڕی عبدالله بوو کە ئەویش بە دزی موسوڵمان ببوو.

گوتی: یا عومەر بۆ کوێ دەچی؟.. گوتی: دەچم محمد دەکوژم. نەعیم گوتی: ئەوە بەراستی‌تە؟ گوتی: بەڵێ نەعیم گوتی: ئەی بۆ ناچی فاتمەی خوشکت و سەعیدی مێردی

(١) مریم: ٣٣.

بکوژی خۆ موسوڵمان بوون، عومەر قسەکەی نەعیمی زۆر پێ مەنتیقی بوو، ڕقی هەستا و گەڕایەوە بۆ ماڵی خوشکی، گەیشتە بەر درگا گوێی لە دەنگیان بوو قورئانیان دەخوێند. لە دەرگای دا و چۆ ژورەوە.

لە ترسانی بێ دەنگ بوون، گوتی: ئەو دەنگە چ بوو دەهات؟ گوتیان: هیچ نەبوو، نەڕاندی و دەستی کرد بە لێدانی فاتمەی خوشکی و گوتی: دیارە موسوڵمان بوون و قورئان دەخوێنن؟ فاتمە هەموو لەشی خوێناوی بوو گوتی: ئەی کاکە ئەگەر بشم کوژی دەست لە دینی محمد و قورئان خوێندن هەڵ ناگرم؛ ئەگەر تۆش قورئان بخوێنی دەزانی کە دینی محمد ڕاستە و موسوڵمان دەبی، عومەر تۆزێک ڕاما و گوتی: سەعید هێندێکم قورئان بۆ بخوێنە، سەعید دەستی کرد بە قورئان خوێندن، عومەر ڕەنگی گۆڕا و هەستا فاتمەی خوشکی دەباوەشێ گرت و گوتی: ئەی فاتیمە لێم ببورە، و گەردنم ئازاد بکە و پێغەمبەرم نیشان بدەن موسوڵمان دەبم، هەستان چوون ماڵی ئەرقەمیان نیشان دا، عومەر لە دەرگای دا؛ یەکێک لە ئەسحابەکان ڕوانی ئەوا عومەر گەیشتە بەر درگا، بە غار چۆ ژورەوە و گوتی: عومەر هات. ئەسحاب زۆر ترسان، بەڵام پێغەمبەر بە پیلیەوە چوو بەرۆکی گرت و فەرمووی: ئەی عومەر بۆچی هاتووی؟ بەسە! موسوڵمان بە!.. حەزرەتی عومەر بە هێواشی گوتی: هاتووم موسوڵمان بم، حەزرەت فەرمووی: «اللهاکبر» هەموو ئەسحابەکان لێک ڕا گوتیان: «اللهاکبر».حەزرەتی عومەر دەستی کرد بە گریان و گوتی:

«اشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمداً رسول‌الله».

خۆشی و شادی کەوتە ناو موسوڵمانەکانەوە، حەزرەتی عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا خۆ ئێمە بکوژرێین لە سەر حەقین؟ فەرمووی: بەڵێ. گوتی: کە وایە خۆ شاردنەوەی بۆ چیە؟.. هەستن با بچین بۆ کەعبە نوێژ بکەین، پێغەمبەر پێشیان کەوت هاتن نوێژیان لە کەعبەدا کرد.

لەو کاتەدا ئەبوجەهل و ئەبوتالیب و ئەبوسوفیان و ئەبولەهەب و زوربەی پیاوە گەورەکان لەوێ بوون. نەیان توانی هیچ بڵێن.

لە پاشان موسوڵمانەکان بڵاوەیان لێ کرد حەزرەتی عومەر ڕوی کردە کافرەکان و گوتی: لەو ڕۆ بە دواوە هەر قسەیەکتان هەیە بە منی بڵێن، چونکە من موسوڵمان بووم.

ئەوەندە لە حەزرەتی عومەر دەترسان کەس نەیتوانی جوابی وەدا جا هێندێک دەڵێن بە موسوڵمان بوونی حەزرەتی عومەر موسوڵمانەکانی حەبەشە گەڕانەوە بۆ مەککە.

قورەیشی‌یەکان بە ئیسلام بوونی حەزرەتی عومەر کۆ بوونەوەیەکیان کرد بڕیاریانداکە دەنگ لە موسوڵمانەکان دابڕن و ئەگەر بۆشیان کرا پێغەمبەر بکوژن.

لەو کۆبونەوەدا بەیانێکیان نووسی کە لەو ڕۆ بە دواوە نابێ کەس قسە بکا بە بەرە بابی هاشم و عبدالمطلب و موسوڵمانەکان؛ نابێ ژنیشیان لێ بخوازن، نابێ نە شتیان لێ بکڕن، نە پێیان بفرۆشن، نابێ قسەیان لەگەڵ بکەن، ئەو بەندانەیان نووسین و لە کەعبەدا هەڵیان هاوەسین.

ئەبوتالیب کە وای زانی هەر دوو بەرە بابەکە و موسوڵمانەکانی کوکردنەوە و بردنی لە شیوێ لە نزیک مەککەدا ڕەشماڵیان هەڵدان و سێ ساڵ زۆر بە ناخۆشیان ڕابوارد، بە تایبەتی دوو کارەساتی گەورە و دڵتەزێن بە سەر پێغەمبەردا هاتن. یەکیان مردنی خاتو خەدیجەی خیزانی و ئەوی دی مردنی ئەبوتالیبی مامی بوو. بەو بۆنەوە ئەو ساڵەیان ناو نا ساڵی «ماتەم».

ئاخری هێندێک لە خێر خواکانی قۆڕەیش بەزەییان پیدا هاتنەوە و ڕوژێک مەتعەم کوڕی عەدی پەلاماری کاغەزە هەڵواسراوەکەی دا و دایگرت.

تەماشایان کرد هەموو مۆرانە خواردبووی، ئەوە نەبێ کە لە سەرەوە نووسرا بوو، بە ناوی تۆ ئەی خاوەنی کەعبە. کە ئەوەیان دی زۆر ترسان. کاغەزەکەیان دڕاند و ناردیان پێغەمبەر و خزمەکانی و موسوڵمانەکانیان هێنایەوە بۆ مەککە. بەڵام وەنەبێ کافرەکان دەستیان لە ناپیاوی هەڵگرتبی؟ دەستیان کردەوە بە ئازار دانی پێغەمبەر. ڕێیان پێ دەگرت، خۆڵیان بە سەردا دەکرد، تا ناچار بوو بڕوا بۆ تائیف و چۆ لای سەرۆکەکانیان و زەیدی لەگەڵ خۆ برد و ڕۆی بۆ شاری تائیف و خۆی پێ ناساندن، داوای یارمەتی لێ کردن. بەڵام زۆر بە ناپیاوی جوابیان دایەوە، منداڵە وردکەیان لێ هاندان، بەرد بارانیان کرد و برینداریان کردن. و منداڵیان دوا خستن، تا چوونە ناو ڕەزی عەتەبە و شیبەی کوڕانی ڕەبیعە ناوێک و دانیشتن، خاوەن ڕەزەکان چاویان لێ بوون بەزەییان پێدا هاتن و

منداڵەکانیان لێ دوور خستنەوە، پێغەمبەر زۆرناڕەحەت بوو دەستی کرد بە دووعا و پاڕانەوە. لەو کاتەدا حەزرەتی جوبرەئیل هات و گوتی: خوا سەلامت لێ دەکا، بە منی فەرمووە: بڕۆ هەرچی ئارەزوو دەکا بە قسەی بکە و ئەگەر گوتی؛ شاری تائیف سەرەوبن بکەوە.

پێغەمبەر فەرمووی: نارازی نیم هەرچەند ئەوان خەراپن ئومێد دەکەم پیاوی باشیان لێ پەیدا ببێ، خاوەن ڕەزەکان بەزەییان پێدا هاتنەوە، بەندەیەکیان هەبوو ناوی عەداس بوو لە گەورەکانی موسڵ بوو، هێندێکیان ترێ پێدا نارد بۆ پێغەمبەر و زەید، بردی دای نا و پێغەمبەر دەستی برد هێشوێکی هەڵگرت و بسم‌اللهی کرد و دەستی کرد بە خواردنی. عەداس گوتی: ئەو کەلیمە خەڵکی ئەو ناوچە نایڵێن. پێغەمبەر فەرمووی: بۆ تۆ خەڵکی کوێی؟ گوتی: خەڵکی «نەی‌نەوا»م. فەرمووی: خەڵکی شاری یونسی کوڕی مەتی. کابرا گوتی یونس لە کوێ دەناسی؟ پێغەمبەر دەستی کرد بە باس کردنی حەزرەتی یونس. عەداس کە ئەوەی بیست موسوڵمان بوو.

پێغەمبەر و زەید بەرەو مەککە گەڕانەوە و ناردی بۆ لای مەتعەمی کوڕی عەدی پەنای بدا، مەتعەم بە خۆی و چەند پیاوەوە هات لە کەعبە ڕووی کردە قوڕەیشی‌یەکان و گوتی: محمد پەنای بۆ من هێناوە کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێ. پێغەمبەر گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

لەو سەفەرەدا زۆری پێ چوو بوو، قوڕەیشی‌یەکان زانی‌بویان. ئنجا پێغەمبەر سودەی کچی زەمعەی مارە کرد و گواستی‌یەوە لە پاشان حەزرەتی عائیشەی کچی حەزرەتی ئەبوبەکری مارە کرد. بەڵام لەبەر ئەوەی منداڵ بوو تا کۆچیان نەکرد بۆ مەدینە نەی‌گواستەوە.

ئنجا لە تەمەنی پەنجا و یەک ساڵیدا بۆ تاقی کردنەوەی مونافیقەکان و بۆ ئەوەی پەردەیەکی کە لە ژیانیدا هەڵداتەوە خوا خەڵاتی کرد بە موعجیزەی میعراج.

باسی شەو ڕەوی و میعراجیش بەو جۆرە بووە. کە حەزرەت لە حەدیسیکدا بۆمان بەیان دەکا و دەفەرموێ: شەوی بیست و حەوت مانگی ڕەجەب لە حەتیمدا کە شوێنێکە لە حەرەمی بەیتا. لە بەینی ڕوکن و بیری زەمزەم و مەقامی حەزرەتی ئیبراهیم‌دا لە بەینی خەو بێ‌داریدا بووم.

بە فەرمانی خوای گەورە حەزرەتی جوبرەئیل هاتە لام و فەرمووی: خوای گەورە سەلامت لێ دەکا و ئەمری پێ کردووم کە ئەمشەو بت بەم بۆ مزگەوتی «بیت المقدس» و لەوێشەوە بۆ هەموو کوراتی ناو فەزا بۆ ئەوەی گەلێ ئەسەری قودرەتی خوا بە چاوی خۆت ببینی.

فەرمووی: منیش لەگەڵیا هەستام و لە بیت‌الله هاتینە دەرەوە، کە تەماشام کرد بۆڕاق کە وڵاغێک بوو زۆر جوان و شیرین بو بۆ سواری حازر کرا بوو.

سوار بووین و بەرەو مزگەوتی «بیت المقدس» کەوتینە ڕێ. کە گەیشتینە مزگەوتی «بیت المقدس» لە بۆڕاق دابەزین و چوینە مزگەوت.

تەماشام کرد بە ئەمری خوای گەورە ڕوحانیەتی حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی موسا و حەزرەتی عیسا و حەزرەتی داود و حەزرەتی سولەیمان لە مزگەوت حازر بوون. منیش بووم بە ئیمامیان دو ڕکات نوێژم بۆ کردن و دوعایان بۆ خۆم و ئوممەتەکەم کرد و خوا حافیزیم لێ کردن.

فەرمووی: جا لە مزگەوت هاتینە دەرەوە کە تەماشام کرد بە قودرەتی خوا پەیژەیەک نەسب کراوە بۆ ئاسمان. منیش لەگەڵ حەزرەتی جوبرەئیلدا چوینە سەر پەیژەکە و بەرز کراینەوە بۆ ئاسمان بەڵام عەجایب ئەوە بوو کاتی گەیشتینە ئاسمانی یەکەم چاوم بە ڕوحانیەتی ئادەم کەوت و سەلاممان لێ کرد و بەخێر هاتنی کردین.

لە ئاسمانی دووەم بە ڕوحانیەتی حەزرەتی عیسا و لە ئاسمانی سێیەمدا بە ڕوحانیەتی یوسف و لە ئاسمانی چوارەمدا بە ڕوحانیەتی ئیدریس و لە ئاسمانی پێنجەمدا بە ڕوحانیەتی هاڕون و لە ئاسمانی شەشەمدا بە ڕوحانیەتی حەزرەتی مووسا و لە ئاسمانی حەوتەمدا بە خزمەت حەزرەتی ئیبراهیم گەیشتین.

هەر یەکە بە نەوعێ بەخیر هاتنیان لێ کردین.

ئنجا لە کوڕاتی ئاسمانەکان تێپەڕین و چووینە «سدرةالمنتهیٰ» کە چووینە ئەوێ حەزرەتی جوبرائیل گوتی: لێرە بە ئەولاوە ناتوانم سەر بکەم باڵم دەسووتێ ئنجا بە قودرەتی خوا ڕەف ڕەف کە شتێک بوو وەکو فەرش بۆم حازر کرا و لە سەری دانیشتم

بەرز کرامەوە بۆ ئەو جێگایە کە خوا قەراری دابوو بۆ مولاقات. تا لەوێ پێغەمبەر کەلامی خوای بیست و قسەی لە حزور خوادا فەرموو نوێژ لە سەر خۆی و ئوممەتی فەرز کرا.

پاش ماوەیەک هەر لەو شەوەدا هاتۆتەوە بۆ ئەو جێگایە کە لێی نوستبوو.

بەڵام بۆ بەیانی کە تەشریفی چوو بۆ مزگەوت و واقیعەی میعراجی بۆ قورەیشییەکان گێڕایەوە هەموویان دەستیان کرد بە پێکەنین و ئەبوجەهل گوتی محمد شێت بووە.

جا ئەوە بوو کە هەندێک لە قورەیشییەکان گوتیان: ئەی محمد کە تۆ ڕاست دەکەی باسی «بیت المقدس»مان بۆ بکە.

پێغەمبەر فەرمووی: زۆر نارەحەت بووم چونکە من بە شەو چاوم پێ کەوتبوو. بەڵام بە ئەمری خوا حەزرەتی جوبرەئیل «بیت المقدس»ی لە پێش چاو ڕاگرتم، منیش تەعریفم بۆ کردن تەواوی دارو دیوار و دەرگا و پەنجەرەم بۆ بەیان کردن. زۆریان لا سەیر بوو.

ئنجا گوتیان: باشە کاروانی ئێمە چۆتە «بیت المقدس» لە کوێ تووشی بووی؟ حەزرەت فەرمووی: ئەوا لە فلان شوێنە و وشتریک لە پێشیانەوە دەڕوا دوو جەواڵی پێوەیە.

یەکێان سپیە و ئەوی تریان سپی و ڕەشە، لە وەختی ڕۆژهەڵات خۆر کەوتندا دەگەنەوە مەککە.

کافرەکان زۆریان چوونە سەر ڕێگەی کاروانەکە بۆ ئەوەی حەزرەت بە درۆ بخەنەوە تا یەکێ گوتی: ئەوا ڕۆژهەڵات و یەکێ تر گوتی: ئەوا کاروان وەدەر کەوت.

جا لەو کاتەدا زۆر کەس ئیمانیان هێنا و موسوڵمان بوون و کۆمەڵێک چوون خەبەریان دا بە حەزرەتی ئەبوبەکر. فەرمووی: ئەگەر لەوەش زیاتر بڵێ من باوەڕی پێ دەکەم و ناویان نا ئەبوبەکری «صدیق» بەڵام چەند مونافیق لە دین وەرگەڕانەوە. تا شەوی میعراج هەر لە سەر دەستووری ئاینی حەزرەتی ئیبراهیم سوجدەیان دەبرد.

بەڵام لە شەوی میعراجدا ئنجا نوێژ لە سەری خۆی و ئوممەتی فەرز کرا بۆ نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، حەزرەتی جوبرەئیل هات فێری دەستنوێژ و نوێژی کرد و ئەسحابەکان داوی کەوتن.

پێغەمبەر کە زانی قورەیشی‌یەکان ئیمان ناهێنن و دەستیش لە خەراپەکردن و ئازاردانی هەڵ ناگرن دەستی کرد بە چوونە لای عەرەبەکان کە بۆ حەج و عەمرە دەهاتن. باسی دینی ئیسلام و پێغەمبەرایەتی خۆی بۆ دەکردن. هێندێک بە ناشیرینی جوابیان دەدایەوە و بەعزێک بە خۆشی.

ئەو ساڵەش شەش کەس لە خەڵکی مەدینە هاتن بۆ عەمرە پێغەمبەر بەدزی خۆی گەیاندنێ و پرسی ئێوە کێن؟ گوتیان: ئێمە لە عەرەبی «یەسرب»ین واتە مەدینە و لە خەزرەجیانین. فەرمووی: هاوپەیمانن لەگەڵ جوولەکەکان؟ گوتیانْ بەڵێ.

فەرمووی: دە دانیشن با نەختێک قسە بکەین. دانیشتن باسی خوا و دینی تازەی ئیسلام و پیغەمبەریەتی خۆی بۆ کردن.

یەکیان ڕاست بۆوە و گوتی: کوڕینە ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە کە هەموو جارێ جوولەکەکان ئێمەی پێ دەترسینن و دەڵێن بەو زووانە پێغەمبەرێک پەیدا دەبێ و ئێمە ئیمانی پێ دێنین. وەرن با ئێمە دەستی خۆمان پێش خەین.

هەر شەشیان ئیمانیان هێنا و موسوڵمان بوون.. ئنجا گوتیان: قوربان عەرەبی مەدینە دوو بەرە بابی گەورەن بە ناوی ئەوس و خەزرەج بەینیان زۆر ناخۆشە، ئومێد دەکەین لە سەر دەستی جەنابت یەک بگرنەوە.

حەجی عەمرەیان کرد و گەڕانەوە و ئەو دەنگ و باسەیان بڵاو کردەوە چەند کەس موسوڵمان بوون.

ساڵی دوایی دوازدە کەس هاتن بۆ حەج و لەو جێگایە کە ناوی عەقەبە بوو چاویان بە پێغەمبەر کەوت و پەیمانیان نوێ کردەوە و حەجیان کرد و گەڕانەوە. بەڵام حەزرەت مەسعەبی کوڕی عومەیری لەگەڵ ناردن تا دەستوری ئایینی ئیسلام و قورئان ئەوەندەی نازڵ بووە فێریان کا.

بۆ ساڵی دوایی حەفتا و سێ پیاو و دوو ئافرەت هاتن بۆ حەج و لە هەمان عەقەبە بە شەو چاویان بە پێغەمبەر کەوت و بەیعەتیان کرد و بڕیاریاندا کە تا ماون سەر و ماڵ لە ڕێی دینی ئیسلام و پێغەمبەردا بەخت کەن.

ئەوانیش حەجیان کرد و گەڕانەوە بۆ مەدینە و دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ئاغیینی پیرۆزی ئیسلام و زۆریان موسوڵمان کردن.

بۆ ساڵی دووایی مەسعەب لە پێش کاتی حەجدا هاتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر و دەنگ و باسی موسوڵمان بوونی خەڵکی مەدینەی بۆ گێڕایەوە و گوتی: قوربان زۆر حەز دەکەن تەشریفت بچێتە ناویان پێغەمبەر قسەکانی مەسعەبی زۆر پێ خۆش بوون.

چونکە لە مێژ بوو هەوڵی جێگایەکی وای دەدا بۆ ئەوەی بتوانێ بە ئاشکرا ئاڵای رزگاری بەرەی ئادەمیزادی لێ هەڵدا و خەڵک لە ژێر دەستی و بتپەرستی رزگار بکا!

موسوڵمانەکانی بانگ کرد و فەرمووی: بەرە بەرە یەک یەک و دوو دوو بە دزی قورەیشییەکان بڕۆن بۆ مەدینە بە ئەمری حەزرەت هەموو کۆچیان کرد بۆ مەدینە.

پێغەمبەر و حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عەلی و چەند کەس نەبێ کەس نەمایەوە.

جا با ئەو ڕۆش هەموو لایەک بە خوا بسپێرین و ئەگەر ماین بەیانی دەچینەوە خزمەتیان.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَمِيعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

٣

# حەزرەتی موحەممەدی موستەفا

## باسی «حەزرەتی موحەممەدی موستەفا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمینَ. وَ صَلَّی اللّٰهُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ جَمیعِ الْاَنْبِیٰاءِ وَالْمُرْسَلینَ وَ عَلیٰ مَنْ تَبِعَهُمْ بِاِحْسٰانٍ اِلیٰ یَوْمِ الدّینِ.

موسوڵمانینە با بچینەوە خزمەت حەزرەت و گوێ ڕاگرین بۆ بەشێکی دی پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

قورەیشی‌یەکان کە زانیان عەرەبی مەدینە زۆریان موسوڵمان بوون و موسوڵمانەکانی مەککەش بە زۆری کوچی‌یان کردوە بۆ وێ و ڕۆژێک پێغەمبەریش لەوانەیە کۆچ بکا بۆ ناویان و دینی ئیسلام لەوە زیاتر پەرە بستێنێ و ئەوان لە بەین بچن، هەر دە تائیفەکە لە دارونەدوە واتە لەیانەی گشتی کۆ بوونەوە و بڕیاریاندا کە دە نەفەر لە هەر تائیفە نەفەریک شەو بچن هەر کاتێ پێغەمبەر لە ماڵ هاتە دەرەوە بە خەنجەران دای‌گرن و شەهیدی بکەن.

بە ڕیوایەتێک دەڵێن: حەزرەتی جوبرەئیل هات و ئەو خەبەرەی پێدا و گوتی: خوا دەفەرمووی: کۆچ بکا بۆ مەدینە، هێندێکیش دەڵێن روقیەی پوری ئاگای لێ بوو هات گێڕایەوە.

وەختی نیوەڕۆ پێغەمبەر چۆماڵی حەزرەتی ئەبوبەکرو کارەساتی بۆ گێڕایەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر لە خۆشی کۆچی پێغەمبەر گریا و گوتی: قوربان لە مێژە دوو وشترم بۆ سواری ئامادە کردون.

حەزرەت ناردی حەزرەتی عەلیان بانگ کرد و دەنگ و باسەکەی تێ گەیاند و فەرمووی: بچۆ جبەکەی من بە شانداده و لە جێگاکەی مندا لە بەر پەنجەرەکە دانیشە با وا بزانن کە لە ماڵەوەم و شەویش لەوێ بنو، هەروەها ئەو ئامانەتیانەی لا من بیاندەوە.

فەرمووی: بەڵێ؛ کە شەو داهات پێغەمبەر و حەزرەتی ئەبوبەکر بە دزی لە شار هاتنە دەرەوە و ڕویان کردە خواروی مەککە ـبەرەو وڵاتی یەمەن ـ ڕۆیشتن تا گەینە ئەشکەوتی سەور چونکە دەیانگوت: ئەگەر دوامان کەون ڕو دەکەنە ڕێگای مەدینە لەو کۆچ کردنەدا هەر حەزرەتی عەلی و ئەسما و عایشەی کچی حەزرەتی ئەبوبەکر و عبداللهی کوڕی و عامری کۆنە بەندەیان ئاگادار بوو.

بۆ شەوێ دە کوڕی گەنج هاتنە بەر دەرگای ماڵی پێغەمبەر. تا بەیانی چاوە ڕوان بوون بێتە دەرەوە و بە خەنجەران دایگرن هەر نەهات، بەیانی تەماشایان کرد حەزرەتی عەلی نەبێ کەسی لێ نیە زۆریان لا سەیر بو، چوون بە گەورەکانیان گوت.

ئەبوجەهل ڕوی کردە ماڵی حەزرەتی ئەبوبەکر و لە ئەسمای پرسی بابت لە کوێیە؟.. گوتی: نازانم، ئەو نامەردە بە هەموو تاقەتی شەقە زلێکی لێدا و گوتی: درۆ دەکەی. جاکە زانیان کۆچیان کردوە جارِیاندا و گوتی: هەر کەس محمد بگرێ سەد حوشتری خەڵات دەکەین. کافرەکان دەستیان کرد بە گەڕان لە پێغەمبەر.

لەملاشەوە پێغەمبەر و حەزرەتی ئەبوبەکر کە گەینە ئەشکەوتی سەور لە پێشدا حەزرەتی ئەبوبەکر چۆ ژورەوە پاکی کردەوە و بە عەگاڵ و بەرماڵەکەی پشتی کونێک نەبێ هەموو کوون و کەلەبەری گرتن و چوونە ژورەوە. پێغەمبەر ماندو ببو خەوی لێ کەوت.

حەزرەتی ئەبوبەکر پاژنە پێی نا بە ئەو کونەوەکە نەگیرا بوو، مارێک لە کونەکەدا بوو هات بە پاژنەوەی‌دا. کە پێغەمبەر هەستا و ڕوانی ئەبوبەکر تێک چووە پرسیاری لێ کرد؛ گوتی: مار پێیەوە داوم.

پێغەمبەر جێگایەکەی مژی و دوعای بەسەردا خوێند تا ژانەکەی شکا.

سێ شەو و سێ ڕۆژ لەوێدا مانەوە عبدالله دەنگ و باسی بۆ دێنان و ئەسما نان و پێخۆر و عامر بۆ مەڕ لەوەڕاندن دەچۆ وێ و شیری بۆ دەدۆشین. چەند کافر چوونە لای ئەشکەوتەکە.

گوتیان: با بچینە ناوی، بەڵام بە ئەمری خوا جاڵجەڵوکە دەرگای ئەشکەوتەکەی تەنی و دوو کۆتر لە سەر زالکی ئەشکەوتەکە هێلانە و هێلکەیان کرد.

لەو کاتەدا حەزرەتی ئەبوبەکر زۆر دەترسا. پێغەمبەر فەرمووی: مەترسە مەبە خوامان لەگەڵە. کافرەکان کە چاویان بە جاڵجاڵوکە و هێلانە هێلکە کەوت گەڕانەوە و گوتیان دیارە لەمێژە شەقڵی نەشکاوە.

لە پاش سێ شەو و ڕۆژ کە قورەیشی‌یەکان لە گەڕان بە دوایاندا ماندوو بوون.

ئەسمای کچی حەزرەتی ئەبوبەکر و عامری کوڕی فەهیرە و عبداللهی کوڕی ئەریقەت دوو حوشتر و نان و پێخۆریان بۆ هێنان و خوا حافیزیان لە ئەسما کرد و سوار بوون و بەرەو باشور بۆ خۆرئاوای مەککە کەوتنە ڕێ و لە کەناری دەریای سورەوە بەرەو تەهامە ڕۆیشتن. سوراقەی کوڕی مالک کە گەورەی خێڵێکی عەرەب بوو، لە تاوڵێکدا لەگەڵ چەند کەس دانیشتبوو، پیاوێک بە غاردان هات و گوتی:: دو حوشتر سوارم چاو پێ کەوتن لام وایە یەکیان محمد بوو، سوراقە بۆ ئەوەی خەڵاتەکە هەر بۆ خۆی بێ گوتی: بابە ئەو دوو سوارە شەوی ڕابردوو میوانی من بوون. لە پاشان چۆوەماڵەوە و دەستی دایە شمشیر و سواری ئەسپ بوو دوایان کەوت. کاتی چاوی پێ کەوتن ئەسپی تاودا.

حەزرەتی ئەبوبەکر زوو ڕچاوی کرد و زۆر ترسا، بەڵام پێغەمبەر دەستی کرد بە قورئان و دوعا کردن لە نکاوێک ئەسپی سوراقە سەرسمی بردوو سوراقەی هەڵدا وەخت بوو ملی بشکێ.

تا چوار جار سوار دەبۆوە و سەرسمەی دەبردەوە. ئنجا زانی کە ئەوە موعجیزەی پێغەمبەرە، هاواری کرد و ئەمانی خواست و گوتی: سوێند بە خوا زەرەرم بۆتان نابێ، چونکە بۆم ڕوون بۆوە کە تۆ لە سەر حەقی، بەڵام دەبێ ئەمانەت نامەیەکم بۆ بنوسی کە ڕۆژێک مەککەت گرت خۆم و خێڵەکەم لە ئەماندا بین، پێغەمبەر ڕووی کردە عامر و فەرمووی: بۆی بنوسە.

لە پاشان سوراقە گەڕایەوە و ئەوانیش ڕۆیشتن، دوا هەشت ڕۆژ گەیشتنە قوبا بیست ڕۆژ لە قوبا مایەوە و مزگەوتی مەشهور بە مزگەوتی تەقوای دروست کرد.

ئنجا لە بەیانی ڕۆژی جومعەدا بەرەو یەسرب واتە مەدینە کەوتە ڕێ و نوێژی جومعەیان لە ناو خێڵی بەنی سالم کرد.

تەواوی خەڵکی مەدینە بە ژن و پیاوەوە پیر و گەنج و کافر و موسوڵمانەوە بەرەو پیلی هاتبوون، زۆر ئارەزوومەندی دیداری بوون.

دەنگی شیعر خوێندنەوە و دەف لێدان بەری ئاسمانی گرتبوو، حەزرەتی عەلی لە قوبا گەیشتە خزمەتی، یەکەم شتێک کە لە مەدینە دەستی پێ کرد مزگەوتەکەی بوو، ئنجا ناردی ژن و منداڵەکەیان بۆ هێنا.

لە بەینی موهاجیر و ئەنساردا برایەتی دامەزراند. پەیمانی لەگەڵ جولەکەکاندا بەست و یەکیەتی یەکی تەواوی لە مەدینەدا پێک هێنا.

بەڵام زۆری نەخایاند کە جولەکەکان لە ترسی زۆر بوونی موسوڵمانان و پەرەساندنی دینی ئیسلام کەوتنە فڕوفێڵ و تەڵەکە بازی و چەند کەسیش کە هەر بە ڕواڵەت موسوڵمان ببوون چوونە پاڵیان، یەکەم کۆمەڵ کە هەڵوێستی خەراپیان بەرامبەر بە بانگ دەربڕی جوولەکە بوون.

پێغەمبەر و یارانی خانوویان دروست کردن و حەزرەتی عەلی نارد ژن ومنداڵەکانی هێنان، ئەسحابەش ناردیان هێنایانن پێغەمبەر خەبەری نارد بۆ قوڕەیشی‌یەکان کە لەو ڕۆ بە دواوە نابێ کاروانیان بە سنوری مەدینەدا تێپەڕی. دوای ئەو بڕیارە پێغەمبەر چەند جار سریەی ناردە سەر ڕێگایان، بەڵام لە بەر چەند هۆیەک شەڕیان نەکرد، تا لەساڵی دووەمی

کۆچیدا هەشت کەسی بە سەرکردایەتی عبداللەی کوڕی جەحش ڕەوانەکرد وکاغەزێکی دایە دەست و فەرمووی: تا دوو ڕۆژ بە ڕێیدا نەڕۆن هەڵی مەپچڕە.

لە پاش دوو ڕۆژ ڕۆیشتن عبدالله نامەکەی هەڵپچڕی تەماشای کرد نوسرابوو تا دەگەیە نەخلەت کە لە سەر ڕێگای مەککە و تائیفە هەر بڕۆ، لەوێ هەواڵی قورەیشیان بزانە.

عبدالله پێنج نەفەری لەگەڵ مابوو، چونکە سەعدی وەقاص و عەتەبە حوشتریان ون کردبوو بە دوایاندا دەگەڕان.

عبدالله کە تەماشای کرد کاروانی مەککە لە تائیفەوە هاتەوە دەستیان کرد بە بارخستن، وەکاروانچی‌یەکان چوار کەس بوون. عبدالله دەستێکی کەوتە ئەملا و یەکی کەوتە ئەولا؛ چونکە شەو و ڕۆژێکی لە مانگی ڕەجەب مابوو، شەڕکردنی تێدا حەرام بوو بەڵام ئاخری هەر بە سەری‌دادان و نەفەرێکی لێ کوشتن و دووی بە ئەسیر گرت.

یەکیان ڕای کردەوە بۆ مەککە ئەسیر و تاڵانەکەیان هێنایەوە بۆ مەدینە، حەزرەت فەرمووی: خۆ من نەم‌نووسی بوو شەڕ بکەن!

کافرو و جولەکەکە ئەو هەواڵیان زانی دەستیان کرد بە لۆمە کردنی پێغەمبەر، دەیانگوت: محمد حورمەتی ئەو مانگانە ناگرێ کە خوا شەڕی تێدا قەدەغە کردوون.

پێغەمبەر تا ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە لە سورەی «البقرە»دا دەفەرمووێ:

﴿يَسْئَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرامِ قِتالٍ فيهِ قُلْ قِتالٌ فيهِ كَبيرٌ وَ صَدٌّ عَنْ سَبيلِ اللّٰهِ وَ كُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرامِ وإِخْراجُ اَهْلِهِ مِنْهُ اَكْبَرُ عِنْدَ اللّٰهِ وَالْفِتْنَةُ اَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ﴾.(١)

زۆر ناڕەحەت بوو، بەڵام لە پاشان شاد بۆوە.

ئنجا قورەیشی‌یەکان سەعدی بنی وەقاص و عەتەبەکە بەدیل گرتبویانن هێنایانەوە بۆ مەدینە و لەگەڵ دوو ئەسیرەکانی خۆیان گۆڕیانەوە.

تا شازدە مانگ لە مەدینە هەر ڕویان دەکرد «بيت المقدس» بەڵام ڕۆژێک لە نوێژدا بوون حەزرەتی جوبرەئیل هات و ئایەتی:

﴿قَدْ نَرىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّماءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضاها فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرامِ و حَيْثُ ما كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾.(٢)

---

(١) البقرة: ٢١٧.   (٢) البقرة: ١٤٤.

هێنا لە نوێژەکەدا ڕویان وەرگێڕا و لەوکاتەوە بەو مزگەوتە دەڵێن مزگەوتی قیبلەتەین.

جوولەکە وەخت بوو لە داخان بمرن، زۆریان پێ ناخۆش بوو، ئنجا لە ساڵی دووەمی کۆچی دا زەکات و سەرفترە و ڕۆژو واجب کران.

شەش هەفتە دوا ڕوداوی نەخلە پێغەمبەر خەبەری زانی کە کاروانەکەی مەککە بە سەرکردایەتی ئەبوسوفیان لە سوریە بەرەو مەککە گەڕایەوە و چل کەسی قەتارچی لە گەڵە. پێغەمبەر سێ سەد و سێزدە کەسی بە دو ئەسپ و حەفتا وشتر و نان و پێخۆر ئامادە کرد و ڕۆژی هەشتی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی بەرەو بەدر کە ١٦٠ کیلومەتر لە مەدینە دورە، کەوتنە ڕێ.

لە پێشەوە تەلحە و سەعدی ناردن تا بزانن کاروانەکە گەیوەتە کوێ؟.. ڕۆیشتن تا گەینە «حوراء» لەوێ خۆیان حەشاردا تا خەبەری کاروانەکەیان زانی و بە پەلە گەڕانەوە.

پێغەمبەر ڕانەوەستا ئەوان بگەڕینەوە هاتن لە زفیران خستی‌یان، دو کەسی نارد بۆ سەر ئاوی بەدر هەواڵی کاروانەکە بزانن. چوون وشتریان یەخدان و ئاویان خواردەوە و گەڕانەوە، بەڵام گوێیان لە کەنیزەکێک بوو داوای قەرزی لە یەکی تر کرد، ئەویش گوتی: ڕاوەستە بەیانی کاروان دەگاتە ئێرە و ئیشیان بۆ دەکەم و قەرزەکەت دەدەمەوە، هاتنەوە ئەو خەبەرەیان دا بە پێغەمبەر بەڵام هەر لە پاش وان ئەبوسوفیان دێتە سەر ئاوەکە و دەپرسی کەسوو نەدیوە؟ دەڵێن دوو سوار ئێستا ئاویان خواردەوە و ڕۆیشتن.

چوو تەماشا شوێنەکەی کردن پشقڵ و تەرسی وشترەکان ناوکە خورمای لەگەڵ بوو، گوتی: بێ و نەبێ ئەوە مەدینەیین. خێرا گەڕایەوە و ڕێگای کاروانەکەی گوڕی و زەمزەمی غەفاری ناردەوە بۆ مەککە تا فریای کەون. زەمزەم گەییە مەککە و هاواری کرد ئەی قوڕەیشی محمد هاتۆتە سەر ڕێگای کاروانەکەتان. ئەگەر فریای نەکەون تاڵانی دەکا.

دەڵێن عاتیکەی کچی عبدالمطلب غەیب زان بوو، ئەو ڕۆژە گوتبوی بەڵایەکی زۆر گەورە بە سەر قوڕەیشیاندا دێ! کە ئەو خەبەرەشیان زانی زۆر ترسان.

بەڵام ئەبوجەهل نۆسەد و پەنجا کەسی بە سەد ئەسپ و حەوسەد وشتر و شمشیر و تیرەوە وە ڕێ خست. لەم لاوە ئەبو جەهل نەڕاندی و گوتی: تا نەچینە بەدر و سێ ڕۆژ نەمێنینەوە و قەسابی نەکەین و شەراب نەخۆینەوە ناگەڕێمەوە.

پێغەمبەر هەواڵی بۆ هات کە قورەیشی یەکان بە هاواری کاروانەکەوە هاتوون، ڕوی کردە ئەسحاب و فەرمووی: قورەیشی بۆ یارمەتی ئەبوسوفیان هاتوون و خواش بەڵێنی داومێ یان تالانی کاروانەکە یا سەرکەوتن بەسەر قورەیشی یەکان مان دەست خا.

هێندێک گوتیان ئێمە بۆ کاروانەکە هاتووین.

بەڵام حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و مقدادی کوڕی عەمرو گوتیان: چی بکەی ئێمە لە گەڵتاین، ئنجا باریان کرد و بەرەو بەدر کەوتنە ڕێ. پێغەمبەر لە پێشەوە ڕۆیی تووشی زەلامێک بوو بە قسە کردنی بۆی دەرکەوت قورەیشی یەکان نزیک بونەوە گەڕایەوە.

حەزرەتی عەلی و زوبەیر و سەعدی وەقاص نارد بۆ سەر ئاوی بەدر، زۆری نەخایاند هاتنەوە دوو زەلامیان هێنا لە گفتوگۆ لەگەڵ کردنیان ڕازانرا کە قورەیشی یەکان چەندن و گوبونە کوێ پێغەمبەر و موسوڵمانەکان هاتن لەو دیوی بەرد بە لای مەدینەوە شوێنێکی بێ ئاو هەڵیاندا و ئەو شەوە بە ئاسوودەیی نووستن.

بەڵام بۆ بەیانی زۆریان تینوو بوو. ئی وا هەبوو ئیحتیلامی بوبو زۆر ناڕەحەت بوون. تا خواوەندی گەورە بارانی بۆ باراندن و دڵخوشی کردن.

ئنجا بە قسەی حبابی کوڕی ئەلمەنزەر چوونە سەر ئاوی بەدر و بە قسەی سەعدی کوڕی مەعازیش کەپرێکیان بۆ پێغەمبەر لە پشت خۆیانەوە دروست کرد.

بۆ بەیانی کە پێغەمبەر چاوی بە سپای قورەیش کەوت فەرمووی: ئەی خوای گەورە قورەیشی بە هەموو هێز و فیز و دەمارێکەوە لەگەڵ دینی تۆدا شەڕ دەکەن و پێغەمبەرەکەت بە درۆ دەخەنەوە. خوایە ئەو ڕۆ بە هێلاکیان بەرە.

ئەگەر ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە لە ناو بچن کەس نامێنێ بتپەرستێ لەو کاتەدا حەزرەتی جوبرەئیل بە خۆی و هەزار فریشتەوە دابەزی.

ئنجا پێغەمبەر مستێکی گڵ هەڵگرت و دوعای بە سەردا خوێند و بەرەو ڕووی کافرەکان هەڵیدا و فەرمووی:

«شاهَتِ الْوُجُوهُ»

واتە ئەو ڕوانە ڕەش و ڕیسوا بوون.

ئنجا بۆ شەڕ و هەر دوو سپا تێک ڕژان، باب ئاگای لە کوڕ نەما و کوڕ ئاگای لە باوک نەما جەراح پەلاماری ئەبوعوبەیدەی کوڕی دا بیکوژێ بەڵام ئەبوعوبەیدە خۆی لێ لادا و ئامۆژگاری کرد کە موسوڵمان بێ، بەڵام بێ سوود بوو، پەلاماری دایەوە، ئەبوعوبەیدە ناچار بوو کوشتی.

موسوڵمانەکان زۆریان لە ناودارەکانی قوڕەیش کوشت مەعازی کوڕی عەمر حەملەی کرد سەر ئەبوجەهل شمشیرێکی لێدا و شەپرزەی کرد، بەڵام عەکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل یارمەتی باوکی دا و شمشیرێکی لە دەستی مەعاز دا و دەستی ڕاستی پەڕاند، بەڵام مەعاز وەی‌نەزانی کە هەر بریندارێشە، ئنجا عەوفی کوڕی حارس و عبداللەی کوڕی مەسعود سەریان بڕی و حەواڵەی جەهەننەمیان کرد. کە ئەبوجەهل کوژرا سپای کافر شکا.

کافرەکان حەفتایان لێ کوژرا و حەفتایان لێ بە دیل گیرا و باقی ڕای کرد و تەواوی شتەکانیان بە تاڵانی گیرا، لە موسوڵمانەکانیش چواردە کەس شەهید کران.

پێغەمبەر فەرمانی دا کەلاکی کافرەکانیان خستە بیری بەدرەوە و ئەسحابەکانیش بە ڕیز ناشتن و لە پاش سێ ڕۆژ بەرە و مەدینە بە خۆشی کەوتنە ڕێ.

ئنجا پێغەمبەر تاڵانەکەی بەسەردا بەش کردن و دیلەکانیش ئەوەی دەوڵەمەند بوو هەر یەکی بە چوار هەزار درەم خۆی کڕیەوە و ئەوەی دەست کورتیش بوو پێغەمبەر پەیمانی لەگەڵ بەستن کە هەریەکەی دە منداڵی موسوڵمان فێری نوسین و خوێندنەوە بکەن و ئازاد بن.

جا با لێرەدا هەموو لایەک بە خوا بسپێرین و ئەگەر ماین بەیانی دەچینەوە خزمەت باقی بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرەی کە تاقە سواری ڕێگای ئازادی بوو.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِياءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكاتُهُ.

٥

# حەزرەتی موحەممەدی موستەفا

## باسی «حەزرەتی موحەممەدی موستەفا» سەلامی خودای لە سەر بێ

**بسم الله الرحمن الرحیم**

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ وَ عَلىٰ مَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسٰانٍ إِلىٰ يَوْمِ الدِّينِ.

لە ساڵی سێیەمی کۆچی‌دا پێغەمبەر چەند جار غەزای کرد لەگەڵ کافر و جولەکاندا، هەروەها لەو ساڵەدا قورەیشی‌یەکان کەوتنە جم و جوڵ بۆ تۆڵە ساندنەوەی شەڕی بەدر.

ئەبوسوفیان بوو بە فەرماندەی سپا و سێ هەزار کەسی کۆ کردەوە بە حەوسەد زرێپۆش و دووسەد ئەسپ سوار و سێ هەزار وشترەوە و کۆمەڵێک لە ژنەکانیان بە سەرۆکایەتی هیندی ژنی ئەبوسوفیان و لە ژێر سێ ئاڵادا بە ڕەقس و سەما و دەف لیدان کەوتنە ڕێ لە ڕۆژی چوارشەممەی چواری مانگی شەشەڵانداگەینە دەور و بەری کێوی ئوحود و خستیان.

عباسی مامی پێغەمبەر هەرچەند موسوڵمان نەبوو بوو کاغەزێکی بە دزی‌یەوە بۆ پێغەمبەر نارد.

پێغەمبەر تەواوی موسوڵمان و مونافیقەکانی کۆکردەوە و کارساتی بۆ گێڕانەوە و فەرمووی: من وام پێ باشە هەر لە ناو شاردا بین و نەچینە دەرەوە.

بەڵام گەنجە خوێن گەرمەکان و ئەوانەی لە غەزای بەدردا بەشدار نەببون و زۆر لەوانەش کە بەشدار ببوون ڕایان وابوو بچنە دەرەوەی شار. پێغەمبەر بۆی دەرکەوت کە زوربەی ڕا لەگەڵ چوونە دەرەوەدایە ناچار بوو ڕۆژی حەوتی شەشڵان دوا نوێژی جومعە فەرمووی: کراسە زریکەم بۆ بێنن هێنایان لە بەری کرد و فەرمووی: ئەگەر لە قسەم دەرچن و سەبر و ئارامتان نەبێ لە شکاندنتان دەترسم، بە خۆی و هەزار کەسەوە کەوتنە ڕێ تا گەینە نزیک کێوی ئوحود لەوێ مونافیقەکان کە سێ سەد کەس بوون گەڕانەوە، بۆ بەیانی شەڕ دەستی پێ کرد.

یەکەم کەس چۆ مەیدانی شەڕەوە حەزرەتی حەمزە و ئەبودوجانە بوون چەند کافریان کوشت، بەڵام زۆر بە داخەوە کە بەندەیێکی حەبەشی وەحشی ناو حەزرەتی حەمزەی شەهید کرد.

سەر لە بەیانی ئەو ڕۆژە موسوڵمانەکان زۆر سەرکەوتو بوون حەفتا گەورە پیاوی قوڕەیشی‌یان کوشت. بە تایبەتی کە ئاڵا هەڵگرەکانیان کوژران بە تەواوی شکان و کەوتنە ڕاکردن. موسوڵمانەکان دوایان کەوتن و گرمەی:

**«لَا اِلٰهَ اِلَّا اللّٰهُ وَاللّٰهُ اَكْبَرُ»**

ئاسمانی پڕ کردبوو، بەڵام بە داخەوە زۆر لە موسوڵمانەکان کەوتنە تاڵان کۆکردنەوە و ئەو کۆمەڵە ئەسحابەی پێغەمبەر ناردبوونیە سەر کێوی ئوحود بە سەرکردایەتی عبداللهی کوڕی جوبەیر کە تەماشایان کرد کافر شکاون و ڕادەکەن، گوتیان: تازە ئێمە بۆ لێرە وەمێنین عبدالله گوتی: ئاخر پێغەمبەر نەی فەرموو بە شکان و سەرکەوتن کیوەکە بە جێ مەهێڵن؟.. بەڵام بە داخەوە زوربەیان بە قسەیان نەکرد و بە جێیان هێشت.

خالدی کوڕی وەلید سەرکردەی هەزار کافر بوو کە زانی کێوەکەیان بە جێ هێشت چوو لەپشتەوەڕا کێوەکەی گرت و عبدالله و هاوەڵەکانی شەهید کردن. ئنجا ڕوی کردە موسوڵمانەکانی تریش.

موسوڵمانەکان سەریان لێ شێوا و شەڕ پەرەی ستاند و موسوڵمان موسوڵمانی دەکوشت، کافرێک ئاڵا هەڵگری پێغەمبەری شەهید کرد وای زانی پێغەمبەرە!.. هاواری کرد وگوتی: محمدم کوشت موسوڵمانەکان بەوخەبەرە بە تەواوی دەستیان شل بوو هێندێکیان گەڕانەوە بۆ مەدینە و کافرەکان بە جارێ هێرشیان کردە سەر ئەو ناوچە کە پێغەمبەری لێ بوو، بەڵام ئەبوتەلحە و حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و عەلی و ئەبودوجانە و سەعدی وەقاس دەوری پێغەمبەریان گرتبوو، کافرەکان نزیک بوونەوە دەست کرا بە تیرەندازی.

عوتبەی کوڕی ئەبیوەقاس بەردێکی گرتە پێغەمبەر و دانی موبارەکی شکاند و ڕوی موبارەکی بریندار و خوێناوی بوو.

بە هەر جۆرێک بوو خۆیان گەیاندە سەر کێوەکە، کەعبی کوڕی مالک هاواری کرد و گوتی: ئەی موسوڵمانینە ئەوە پێغەمبەرە شەهید نەکراوە ورە بەر مەدەن. ئەسحابەکان کە لە دەورەی پێغەمبەر کۆ بوونەوە بەڵام حەفتایان لێ شەهید کرابوو، شەڕ دوایی هات و ئەبوسوفیان گوتی: قەرارمان ساڵی داهاتوو بێ و بەرەو مەککە گەڕانەوە، پێغەمبەر و ئەسحابەکانیش شەهیدەکانیان تەسلیم بە خاک کرد و بە دڵ شکاوی گەڕانەوە بۆ مەدینە ئافرەتێک مێرد و کوڕ و برای شەهید کرابوو، چۆ خزمەت پێغەمبەر و گوتی: هەموویان بە فیدای سەعاتێکی تۆ بن و تازیەی بۆ حەزرەتی حەمزە دانا.

ئنجا ساڵی چواری کۆچی داهات و حەزرەت حەزرەتی حەفسەی کچی حەزرەتی عومەری مارەکرد و چەند غەزایان لەو ساڵەدا کردن؛ هەروەها لە ساڵی پێنجەمی کۆچیشدا.

ئنجا لە ساڵی شەشی کۆچیدا پێغەمبەر مژدەی دا بە موسوڵمانەکان کە خەونی دیوە دەچن بۆ مەککە بۆ حەج و عەمرە. لە هەمو تیرەی عەرەبەکانی گێڕایەوە، بە هەزار و چوار سەد کەس و حەفتا وشتری قوربانیەوە کەوتنە ڕێ تا گەینە حودەیبیە قوڕەیشیەکان کە خەبەریان زانی لەشکرێکی زۆریان کۆ کردەوە و نوێنەریان ناردن بۆ لای پێغەمبەر و گوتیان: قوڕەیشی ناهێڵن بچنە مەکەوە. پێغەمبەر فەرمووی: ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین، عەمرە دەکەین.

ئاخر نوێنەریان کەگەڕایەوە گوتی: خەڵکینە من چوومە لای قەیسەری ڕۆم و کیسرای فارس و نەجاشی حەبەشە ئەوەی یارەکانی بۆ محمد دەیکەن بۆ کەس نەکراوە.

بابێن عەمرە بکەن و بگرێنەوە، ڕازی نەبوون؛ پێغەمبەر حەزرەتی عثمانی نارد دووبارە گوتیان: سوێندمان خواردوە نابێ ئەو ساڵ بێنە مەککەوە، حەزرەتی عوثمان درەنگ گەڕایەوە و هەواڵ هات کە عوثمان کوژراوە.

پێغەمبەر موسوڵمانەکانی کۆکردەوە و پەیمانی لەگەڵ تازە کردنەوە و بڕیاریاندا یا مەککە بگرن یا شەهید بکرێن.

قورەیشی کە ئەو خەبەرەیان زۆر ترسان عوثمانیان ناردەوە و سوهەیلی کوڕی عومەریان نارد بۆ پەیمان بەستن لەگەڵ پێغەمبەر بەو شەرتانە یەکەم ئەو ساڵ بگەڕێنەوە تا ساڵێکی دیی. دووەم تا دە ساڵی دی شەڕ نەکەن.

سێیەم هەر کەسێک لە ماوەی ئەو دەساڵەدا چۆ ناو موسوڵمانەکان لەوان بیدەنەوە، بەڵام هەر موسوڵمانێک چۆوە ناو قورەیشی یەکان نەیدەنەوە.

ئەوەی بێ هەوێ لەگەڵ پێغەمبەر هاوپەیمان بێ ئەوان دەنگ نەکەن و ئەوەی لەگەڵ ئەوانیشدا ببێتە هاوپەیمان موسوڵمانەکان دەنگ نەکەن.

پێغەمبەر حەزرەتی عەلی بانگ کرد بۆ نووسین و فەرمووی: بنووسە: «بسم‌الله». سوهەیل گوتی: بنوسە: «بِأسْمِکَ اللّهُمَّ».

حەزرەت فەرمووی: یا عەلی وا بنوسە.

ئنجا فەرمووی: بنوسە ئەوە ئەو پەیمانەیە کە محمد پێغەمبەری خوا و سوهەیل لە سەری ڕێک کەوتون؛ سوهەیل گوتی: نابێ وا بنووسی‌ی! ئەگەر بە پێغەمبەرت بزانین، شەڕت لەگەڵ ناکەین.

حەزرەتی عەلی توڕە بوو، بەڵام پێغەمبەر خۆی کوژاندی‌یەوە و فەرمووی: بنووسە «محمد کوڕی عبدالله» ئنجا قوربانیان کرد و سەریان تاشی و گەڕانەوە بۆ مەدینە.

هەر چەند موسوڵمانەکان زۆریان پێ ناخۆش بوو، بەڵام لە ڕاستی‌دا سەرکەوتێکی زۆر گەورە بوو بۆ موسوڵمانەکان، چونکە دەسیان کرد بە گفتوگۆ لەگەڵ خەڵک و زۆر کەسیان موسوڵمان کرد و موسوڵمان بوون. یەکێ لەوانە خالدی کوڕی وەلید بوو.

ئنجا پێغەمبەر دەستی کرد بە نامە ناردن بۆ پاشا و سەرۆکان.

دوحیەی کەلبی نارد بۆ لای قەیسەری ڕۆم؛ عبداللەی کوڕی حوزافەی نارد بۆ لای کیسرا پاشای ئێران جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبی نارد بۆ لای مەلیکی حەبەشە حارسی کوڕی ئەبوشمری نارد بۆ لای فەرمانڕەوای سوری‌یە.

عەلای حەزرەمی نارد بۆ لای پاشای بەحرەین؛ عمرەی کوڕی عاسی نارد بۆ لای پاشای عومان. هێندێک جوانیان جواب دایەوە و بەعزێک ناشرین.

ئنجا لە ساڵی حەوتی کۆچی‌دا فەتحی قەڵای خەیبەر کرا و تاڵانێکی زۆر گیرا، لە پاشان لەگەڵ جوولەکە ڕێک کەوتنەوە زێنەبی کچی حارسی گۆشتی زەهراوی بۆ پێغەمبەر و چەند ئەسحابە لێ ناو پێغەمبەر پارۆێکی بۆ دەم برد و فەوری فڕێی دایەوە و زانی، بەڵام بشر ناوێک قوتی‌دا و پێی مرد.

ئنجا ساڵی هەشتی کۆچی بەسەردا هات و پێغەمبەر سپایەکی سێ هەزار کەسی بە سەرکردایەتی زەیدی کوڕی حارس و خالیدی کوڕی وەلید نارد بۆ شام و بە سەر کەوتوویی گەڕانەوە.

لەم لاشەوە قوڕەیشی‌یەکان پەیمانەکەیان شکاند و لەو پەیمان شکاندنە زۆر ترسان. ئەبوسوفیان‌یان نارد بۆ لای پێغەمبەرکە ماوەی پەیمانەکە درێژتر بکەنەوە ئەبوسوفیان چۆ لای ئوموحەبیبە کە کچی خۆی بوو خێزانی پێغەمبەر بوو، ویستی لە سەر جێگای پێغەمبەر دانیشێ، بەڵام ئوموحەبیبە گوتی: تۆ کافر و پیسی نابێ لە سەر جێگای پێغەمبەر دانیشی! ئەبوسوفیان توڕە بوو هەستا چوو بۆ لای پێغەمبەر؛ پێغەمبەر ڕوی تێ نەکرد و جوابی نەدایەوە. چوو بۆ لای حەزرەتی ئەبوبەکر ئەویش قسەی لەگەڵ نەکرد، چوو بۆ لای حەزرەتی عومەر ئەو زۆری لێ تووڕە بوو،کە زانی حاڵەکە وایە،گەڕایەوە بۆ مەککە و کارەساتی بۆ گێڕانەوە.

ئنجا لە مانگی ڕەمەزاندا پێغەمبەر بە دە هەزار کەسەوە وەڕێ کەوت بۆ مەککە هاتن تا گەینە مەر زەهران و خستیان.

عەباسی مامی کە بە دزی موسوڵمان ببوو بە خو و خێزانەوە بەرەو مەدینە دەهات گەیشتە پێغەمبەر و دەگەڵ هۆردو کەوت.

لەم لاشەوە ئەبوسوفیان و دووکەسی دی بۆ هەواڵ زانین دەگەڕان شەو بوو حەزرەتی عەباس سواری هێسترە سپیەکەی ببوو دەگەڕا دەنگی ئەبوسوفیانی ناسیەوە، گوتی: ئەی ئەبوسوفیان ئەوە هۆردوی پێغەمبەرە هاتووە مەککە بگری، ئەگەر فریای خۆتان نەکەون سەروماڵو تێدا دەچی. ئەبوسوفیان بە قسەی عەباسی کرد و پیاوەکەی ناردەوە بۆ مەککە بۆ ئەوەی ئەمان بخوازن و شەڕ نەکەن و خۆشی لە پشت عباسەوە سوار بوو، چۆ خزمەت پێغەمبەر ئەمانی‌دا و موسوڵمان بوو، ئنجا خەڵکی مەککەش ئەمانیان خواست.

پێغەمبەر ئەمری کرد لشکر بوو بە چەند دەستە و لە چەند لاوە ڕوویان کردە مەککە دەستەی خالیدی کوڕی وەلید نەبێ تووشی شەڕ نەبوون ڕۆژی بیستی مانگی ڕەمەزان کە ڕۆژی هەینی بوو مەککە فەتح کرا و گیرا و پێغەمبەر تەوافی کرد و ئەمری کرد هەموو بوتەکانیان شکاند.

ئنجا ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: بڕۆن ئەوا ئازادم کردن، چەند کەسێک نەبێ، ئنجا حەزرەت چۆ سەر کێوی سەفا و هەموو خەڵکەکە چوون لە سەر دەستی موسوڵمان بوون و لە پاشان گەڕانەوە بۆ مەدینە و غەزای حونەین و تاییف و تەبووکیان کرد و لە هەمواندا سەرکەوتن.

لە ساڵی دەیەمی کۆچی‌دا حەزرەت چوو بۆ حەجەتول وەداع و خوتبە بە ناو بانگەکەی خوێندەوە و ئاخر ئایەتی قورئانی بۆ هاتە خوارەوە و گەڕایەوە بۆ مەدینە.

حەزرەتی عایشە دەڵێ ڕۆژی چوارشەممەی بیست و هەشتی مانگی سەفەر پێغەمبەر نەخۆش کەوت ڕوخسەتی لە ژنەکان وەرگرت هاتە هۆدەکەی من ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نەخۆشی‌یەکەی گرانتر دەبوو ڕۆژێک فەرمووی: ئاوم بۆ بێنن، ئاویان هێنا و خۆی‌شت.

نەخۆشی‌یەکەی تۆزێک سووک بوو. هەستا سەری پێچا و چۆ ناو موسوڵمانەکان.

لە دوا نوێژ و تارێکی زۆر گرنگی‌دا و دوعای بۆ خۆیان و شەهیدەکانیان کرد.

ڕۆژێکی دی بلال بانگی‌دا حەزرەت فەرمووی: بۆم بانگ کەن بانگیان کرد، فەرمووی: بە ئەبوبەکر بڵێ پێش نوێژی‌یەکەیان بۆ بکا.

بلال بە گریانەوە چوو بۆ مزگەوت و گوتی: حەزرەت دەفەرمووێ: با ئەبوبەکر پێش نوێژی بکا.

ئەسحاب دەستیان کرد بە گریان و ئەبوبەکر ئیمامەتی‌یەکەی بۆ کردن تا بەیانی ڕۆژی وەفاتی؛ بەیانی ئەو ڕۆژە تۆزیک بەدەنی سووک بوو دەست نویژی گرت و فەرمووی: بم‌بەن بۆ مزگەوت با چاوم بە یاران بکەوێ.

حەزرەتی عەلی و فەزڵی کوڕی عەباس چوونە بن‌باڵێ و بردیان بۆ مزگەوت ئەبوبەکر خەرێک بوو میحرابەکەی بە جێ بێڵێ..!

پێغەمبەر دەستی لە شانی‌دا و فەرمووی: نوێژەکەیان بو بکەو خۆشی لە لای ڕاستی‌یەوە بە دانیشتنەوە نوێژی دابەست. لە دوای نوێژ ڕووی کردە ئەسحاب و ئامۆژگاری‌یەکی زۆری فەرموو؛ ئنجا فەرمووی: هەرکەسێک حەقی لە سەرمە یان ئازادم بکا، یان با داوای بکا تا لە ڕۆژی قیامەتدا داوام لێ نەکا.

ئەسحاب دەستیان کرد بە گریان. بەڵام عەکاشە هەستایە سەرپێ و عەرزی کرد ئەی ڕەسولی خوا ڕۆژێک بە ناحەق قەمچی‌یەکت لە شانی ڕوتی داوم، حەزرەت فەرمووی: ئەی بلال بچۆ قامچیەکەم بۆ بێنە. بلال چۆ هێنای حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوثمان و عەلی و ئەسحاب هەرکەس لەلایەک دەیانگوت: ئەی عەکاشە لە باتی قامچی‌یک سەد قامچی لە ئێمە بدە و واز لە پێغەمبەر بێنە؛ ڕازی نەبوو، حەزرەت شانی ڕووت کرد و فەرمووی: وەرە تۆڵەی خۆت بکەوە عەکاشە دەستی کرد بە گریان و ڕاماڵی شانی موبارەکی کرد و ماچی کرد و گوتی: ئەی خۆشەویستی خوا کێ هەیە حەقی لەلات بێ. بۆیە وام کرد تا بە هۆی ماچ کردنی بەدەن و شانی موبارەک‌تەوە لە ئاگری جەهەننەم مەحفوز بو.

ئەسحاب زۆریان پێ خۆش بوو، ئنجا پێغەمبەر فەرمووی: هەرکەسێک دەی‌هەوێ بچێتە بەهەشت با تەماشای ناوچاوانی «عکاشە» بکا.

ئەسحاب هەموویان گوتیان: ئەی عەکاشە خۆزگەمان بە خۆت و ناوچاوانیان ماچ کرد. لە دووا گفتوگۆ لەگەڵ چەند ئەسحابە هاتەوە بۆ ماڵەوە لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا لە ڕۆژی دووشەممەی دوازدەی مانگی «ربیع الاول»دا وەفاتی فەرموو تا ئێرە باسی ژیانی پێغەمبەر بوو. خواوەندی گەورە بۆ خاتری گەورەیی خۆی و خۆشەویستی ئەو

خۆشەویستە عەفوومان بکا و بە ئوممەتی ئەومان قبوڵ کا و لە ژێر سێبەری ئاڵای پێغەمبەردا حەشرمان بکا.

وَ صَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ جَميعِ الْأَنْبِيٰاءِ وَالْمُرْسَلِينَ.
وَالسَّلٰامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ.

بە یارمەتی خوای گەورە لە وەرگێڕان و نووسینی ژیانی پێغەمبەران بوومەوە لە ڕۆژی دووشەممەی دوازدەی جیمادیالاخری ١٣٩٨ی کۆچی ڕێکەوتی پازدەی پێنجی ١٩٧٨ی زایینی لە حوجرەی خانەقای مەولانا خالید لە سلێمانی.

# ناواخن و پێڕست